ئیتر رجا ئەکەین کاریکی وا بکەن کە بۆ ئینتیخاباتیکی کە بە شەرەفەوە ئومیدی تەوکیل کردنتان لە میللەتەکە بکەن.
ئیتر ئینتیظاری فەعالییەتو مەساعی مەشکورەتان ئەکەین![15]

## {} ئیجتیماعی مەجلیسی مەبعوپانو ئەعیان:

لە ١ی مانگا مەجلیسی مەبعوثانو ئەعیان ئیجتیماعیان کردوە لە نەتیجەی ئینتیخاباتا بە ئەکثەرییەت فەخامەتی عەبدولموحسین بەگ ئەلسەعدون ئینتیخاب فەرموراوە بە رەئیسی مەجلیسی مەبعوثانو لە نەتیجەی ئینتیخاباتی مەجلیسی ئەعیانا مەعالی یوسف ئەفەندی سویدی ئینتیخاب فەرموراوە بە رەئیسی مەجلیسی ئەعیان.

تەئجیلی مەجلیسی مەبعوثانو ئەعیان: لەسەر ئیرادەی مەلەکییە مەجلیسی مەبعوثانو ئەعیان چلو پینج رۆژ تەئجیل کراوە.[16]

## {} وەزارەتی عیراق:

غەزەتەی بەغداد تایمس نوسیویتی کە مەوقیعی وزەرای عیراق باع نیە عومری دریژیان شەش حەوت رۆژی ترە. فەقەط غەزەتەکانی تری بەغداد ئەم خەبەرە تەکذیب ئەکەن چونکە ئەلین لە عیراقا وەضعییەتیەکی وا روی نەداوە کە ببیّ بە سەبەبی سقوطی هەیئەتی وەزارەت.[17]

## {} مەجلیسی مەبعوثان:

موافیقی مادەی ٢٣ی قانونی ئەساسی چونکە لازمە ئەگەر غەیبوبەتی جەلالەتی مەلیك لە ٤ مانگ تەجاوزی کرد مەجلیسی مەبعوثان کۆ ببیتەوەو لەو خصوصەوە

[15] ژیان، ژ٨٧، ٢٥ی تشرینی ئەوەلی ١٩٢٧
[16] ژیان، ژ٨٩، ٨ی تشرینی ثانی ١٩٢٧
[17] ژیان، ژ٨٩، ٨ی تشرینی ثانی ١٩٢٧

موزاکـەرەو قـەراریك بـدەن‌و جەلالـەتی مـەلیکیش چونکـە سـەفەرەکەی لــە ٤ مــانگ تەجاوزی کرد ئیرادەی مەلەکییە صادر بوە کە بۆ موزاکەرەی ئەم خصوصە لە ٧ی مانگا مەجلیسی مەبعوثان کۆ ببیتەوەو ئیجتیماع بکا.[18]

## {} بە موناسەبەتی عەودەتی جەلالەتی مەلیکی خۆشەویست‌و فەعالی عیراقەوە:[19]

## {} طەلەبی عەفو:[20]

{} سقوطو تەشکیلی قابینە: لەبەر ئەوەی فەخامەتی رەئیسـەل وزەرا جەعفەر پاشا لە ریاسەتی قابینە ئیستعفای کردو ئیستیعفاکەیشی لە طـەرەف جەلالـەتی مەلیکـەوە قوبـوڵ فـەرمورا. ئـیرادەی ملوکانــە صــادر بــو کــە فەخامــەتی ســیر عەبدولموحسین بەگ ئەلسەعدون رەئیسەل وزارەیەتی دەرعوهـدەو قابینـە تەشکیل بفەرمویت، لە طەرەف فەخامەتیەوە قابینە لەم ذاتانە کە لە خوارەوە ئیسمیان دەرج کراوە تەشکیل‌و کورسی وەزارەتیان ئیشغال فەرموە:
رەئیسەل وزەراو وەزیری خاریجییەو وەکیلی دیفاع سیر عەبدولموحسین بەگ ئەلسەعدون.

| | |
|---|---|
| وەزیری داخلییە | عەبدولعەزی ئەلقەصاب. |
| وەزیری عەدلییە | حیکمەت سولەیمان بەگ. |
| وەزیری مالییە | یوسف غنیمە. |
| وەزیری مەعاریف | تۆفیق بەگ ئەلسویدی. |
| وەزارەتی زەراعەت‌و رەی | سلیمان ئەلبەرراك. |
| وەزارەتی ئیشغال | عەبدولموحسین ئەلشەلال. |
| وەزیری ئەوقاف | ئەلشیخ ئەحمەد داود.[21] |

---

[18] ژیان، ژ٩٤، ١٣ی کانونی ئەوەڵی ١٩٢٧
[19] ژیان، ژ٩٥، ١٧ی کانونی ئەوەڵی ١٩٢٧
[20] ژیان، ژ٩٦، ٣ی کانونی ثانی ١٩٢٨
[21] ژیان، ژ٩٨، ١٧ی کانونی ثانی ١٩٢٨

{} **صورەتی موتەرجەمەی تەلەغرافی ژمارە ١٠٦٧و رۆژی ١٩ای ١ی ٢٨ی وەزارەتی داخلییە:**

بۆ موتەصەرریفی سلیمانی:[٢٢]

{} **قصەی حەق وەلەو رەقیش بێ نابێ کەس پێی ناخۆش بێ:**[٢٣]

{} **وەزارەتی تازە:**[٢٤]

{} **خیطابیك موقابیل بە هەمو میللەتی کورد:**[٢٥]

{} **ئیعلان:**[٢٦]

{} **بە موناسەبەتی ئینتیخاباتی تازەی مەبعوپانەوە چەند قصەیەکی رەق ئەمما ناخۆش:**[٢٧]

FO371/14521

**لە سیر هەمفریسەوە**

**بۆ لۆرد پاسفیلد**

**١٢ی دیسەمبەری ١٩٣٠**

**٤- بۆ رۆژی دوایی عیصمەت پاشاو شوکری کەیا وەڵامی تەلەفۆنەکانیان دامەوە، لەسەر پەیوەندی تورکی - عیراقی دواین، بەتایبەتی سەبارەت بە کوردستان. من رونم کردەوە کە سیاسەتی حکومەتی خاوەن شکۆ، وەکو هێزی ئینتیداب لە عیراقدا، ئەوەبو کە عەرەب هان بدا کە بە تعاطف و عەدالەتەوە رەفتار لەگەڵ کورد**

---

[٢٢] ژیان، ژ٩٩، ٢٤ی کانونی ثانی ١٩٢٨

[٢٣] ژیان، ژ١٠١، ٩ی شوباطی ١٩٢٨

[٢٤] ژیان، ژ١٠٢، ١٦ی شوباطی ١٩٢٨

[٢٥] ژیان، ژ١٠٣، ٢٣ی شوباطی ١٩٢٨

[٢٦] ژیان، ژ١٠٣، ٢٣ی شوباطی ١٩٢٨

[٢٧] ژیان، ژ١٠٤، ١ی مارتی ١٩٢٨

بکەن وەکورد هان بدا کە وەکو هاوولاتی دلسۆزی دەولەت تازە دامەزراوی عیراق بژین. بیری کوردستانیکی سەربەخۆ گەوجانەو لە جێ بەجێ کردن نەهاتوە، هەر واتەوانیك دەربارەی ئەوەی کە حکومەتی خاوەن شکۆ هانی دابن درۆ بوە.

لەوەلامی ئەوەدا کە حکومەتی عیراق چ هەنگاوێ ئەنێ بۆ ئەوەی ئەو کوردانە دالدە نەدا کە لە بەردەم سوپای تورکدا هەلدی بۆ عیراق. وتم حکومەتی عیراق هەرچیەکی لەتوانادا بێ ئەیکات بۆ چەککردنی پەنابەرانی کوردو ریگەیان نادا ئەرزی عیراق وەکو بنکە بەکاربهینێ بۆ چالاکی عەسکەری دژی تورك و، دلنیام کردن کە هەر سەرنەکەوتنێ لە دانانی ریوو شوینی کاریگەرو گونجاودا ئەگەریتەوە بۆ نەبونی توانا نەك بۆ نیازی باش.

هەروەها وتم کە لیژنەی هەمیشەیی سنور بەتەنیا ئەتوانێ بەشداری بکا لە جیگیرکردنی ئاسایشی سنوردا ئەگەر بایەخی زۆرتر بە جێبەجێ کردنی بریارەکانی بدرێ. ئەگینا باشتر وایە هەرلایەك بە ریگەی خۆی دریژە بە ئیجرائات بدا.

هەردو وەزیرەکە زۆر روخۆش بون دلنیایان کردم کە رازین لە بۆچونی دۆستانەی حکومەتی عیراق و بەلینیاندا هاوئاهەنگی بکەن بۆ ریگرتن لە پەلامارداني سنور، کە لەم دواییانەدا زەرەری بەرچاویان گەیاندوە بە خواروی کوردستان، کە رەنگە بگەریتەوە بۆ کیشانەوەی مەخفەرەکانی تورك لەناوچەکانی سەر سنور.

٥- عیصمەت پاشا لە میوانداریەکەی نیوەرۆدا کە سیر جۆرج کلارك کردی... پێی وتم کە هیچ گلەییەکی راستەقینەی لە عیراق نیە، بەلام هیوادارە بە زویی هەولّ بدرێ شیخ بارزان بهینریتەوە ژیر کۆنترۆلّ، کە هاودەردیەکی کاریگەری نیشان داوە لەگەلّ یاخییانی کورد لە تورکیا.

**تیبینی لەسەر ئەو گفتوگۆیانەی لە ئەنکەرە کراوە لە نیوان نوری پاشا سەعیدو سەرۆك وەزیرانی تورکیاو وەزیری کاروباری دەرەوە**

گفتوگۆکانی لەگەلّ عیصمەت پاشاو دکتۆر تۆفیق روشدی بەگ لەسەر سێ مەسەلە دوا کە دەکرێ وا کورت بکرینەوە:

١. مەسەلەی ئاسایشی سنورەکانی نیوان تورکیاو عیراق کە لە دوای پەیماننامە سێ قۆلیەکەی سالی (١٩٢٦)دا هاتە ئاراوە: بەرئەنجامی ئەو گفتوگۆیانە وا کەوتەوە کە حوکمەتی تورکی زۆر سەغلەتە بەوەی کە نابێ چیتر ریگە بدرێ چالاکی زیاتر لەلایەن هەندێ لایەنی شەرخواز لە ناوچەکانی ژیر دەسەلاتی شیخی بارزاندا ئەنجام بدرین. من خۆم سەرسامی خۆم دەربری کە بۆ دەبێ سەبارەت بەو مەسەلەیە

ئەوەندە خۆیان سەغلەت کردبێ، چونکە ئەوەندەی من ئاگادار بوویم بۆ ماوەیەکی ئەوەندە کورتخایەنیش نەبوە کە زانیومانە شیخی بارزان جۆریك لە یارمەتی و چەکی لەو ناوچانە وەرگرتوە کە کەوتونەتە ناو سنوری تورکیا. کە عیسمەت پاشا پرسیاری لێ کردین بۆ بەخشینی پتر زانیاری لەمەر ئەو مەسەلەیەو ئاخۆ بلێی ئیمە وا زەن بکەین کە حوکمەتی تورکی هانی شیخی بارزان بدات یان چەکی بۆ دابین بکات. من وا وەڵامم دایەوە کە تەواو لەو بارەیەوە من دلنیا نیم، بەڵام ئیمە هۆکاری خۆمان بەدەستەوەیە کە ئەو یارمەتی‌یە بەو چەشنە لە سنورەکانی تورکیاوە پەریوەتەوە، لەوانەشە لەلایەن هەندێ لە سەرۆك خیلەکانی کوردەکانی ناو تورکیاوە هاتبێ.

دەسەڵاتدارانی ئەنقەرە ئامادەگی خۆیان دەرخست بەوەی کە هیزە تورکی‌یەکان لەسەر سنور مۆڵگە داکوتن، دەبێ حوکمەتی عیراقی هەندێ هەلمەتی سزادان دژ بە شیخی بارزان ئەنجام بدات، لەو حالەتەدا هیزەکانی پاراستنی سنوری تورکیا دەتوانن هەر یەکیك بگرن کە بەو سنورەدا دزە بکاتو بیەوێ بپەریتەوە ناوچەکانی ژیر دەسەڵاتی تورکیا. پاش گرتن، تەسلیم بە دەسەڵاتدارانی عیراقی دەکاتەوە. من بۆ ئەو مەسەلەیە سوپاسم کردنو پیم وتن لە حالەتیکدا عیراق بیەوێ هەندێ کاری سزادەرانە ئەنجام بدات، باشترین وەرز بۆ ئەم مەبەستە بەهارە، نەك پاییز، چونکە پاییز وەرزیکە لێ ناگەرێ ئۆپراسیۆنی سەربازی دریژخایەن ئەنجام بدرێ، لەبەر زۆر هۆ کە یەکیك لەوانە دەست پێ کردنی بارانە، جگە لە ناخۆشی ریگاوبان، لەگەڵ زانینی ئەو حەقیقەتەی کە ئەم ناوچانە بە بونی حکومەتیکی شارستانی رانەهاتون، ئەو هەمو فاکتەرانە کە وا دەکەن ئۆپراسیۆنی سەربازی نوشوستی بینێ، بە دیوی ئەودیودا وا دەکات کە بواریکی فراوان برەخسێ بۆ لەبەرگرتنی هەندێ هەنگاوی بەرگری‌کردن کە لەلایەن هەلگەراوەکانەوە دەگیریتەبەرو وا دەکات ئەو هەلمەتو پاکسازی‌یە سەر نەگرێو تەنگو چەلەمەی بیتە سەر رێ.

لە (١٩٣٠/٩/١٨) چاوم کەوت بە بەرپرسی کاروباری تورکیا لە بەغداد کە پێی راگەیاندم ئەو ئۆپراسیۆنەی سوپای تورکیا لە ناوچەکانی (ئارارات) بەریوەی برد کۆتایی هاتوەو سەربازەکانی تورك روەو ناوچەیەکی دیکە ملیان ناوە کە دەکەویتە رۆژئاوای دەریاچەی (وان)، ئاواتیشی خواست کە هەر هەمو ئۆپراسیۆنەکان لە ماوەیەکی کورتدا کۆتاییان بێ. پاش ئەوە...بەرپرسی کاروباری تورکی گەرایەوە سەر هەندێ مەسەلە کە من لە ئەنقەرەش گویم لێ ببو، لەمەر دلنیاکردنەوە لەوەی کە سوپای تورکی لەسەر سنورەکانی نیوان عیراقو تورکیا جیگیر دەبێو لەوێ چاوەرێو چاودیر دەبێ، لەو کاتەی کە حوکمەتی عیراق هەندێ پەلامارو هەلمەتی

سزادەرانە دژ بە شیخی بارزان بەریوە دەبات. من سوپاسم کردو دلنیام کرد کە حکومەتی عیراقی لەبیری ئەنجامدانی ئۆپراسیۆنیکی لەو بابەتەدا نیە لەم کاتەدا. لەبەر ئەو هۆکارانەی کە پیشتر ئاماژەمان بۆ کرد، بەلأم گەر بریاریدا کاریکی وا ئەنجام بدات، لەو بروایەدایین کە لە مانگی مایسدا بێ کە دیارە گونجاوترین وەرزە بۆ ئەم هەلمەتە تۆلەسینە. (Fo371/14521) (کاك شیرزاد حەسەن وەریگیراوە).

**ئەم بەلگەنامەیە مولکی خاوەن شکۆی حکومەتی بریتانییە - ژمارە (٨) ئەرشیف**

١٣ی ئۆکتۆبەری ١٩٣٠      رۆژهەلأت/عیراق

نهینی

**لە سیر (جەی کلارك) بۆ مستەر (ئەی. هاندرسن)**
**لە (١٣)ی ئۆکتۆبەر وەرگیراوە.**

٥- لە کۆبوونەوە هەرە رەسمییەکاندا لەگەڵ دەسەلأتدارانی تورکدا مەسەلەی کورد بەو رادەیەی کە کاریگەری لەسەر تورکیاو عیراقدا هەیە زۆر راشکاوانە قسەو باسی لەسەرکرا، بەلأم هەر بەهەمان رۆحی دۆستانە، هیچ سکالأیەکی راستەوخۆ لەمەر لاوازی حوکمەتی عیراق بەرز نەکرایەوە. لە سۆنگەی ئەوەی کە شیخی بارزانییەکان توانیبوی پشتگیری کوردە هەلگەراوەکانی ناو تورکیا بکات. لە راستیدا پارەیەکی موستەهەق کە دەبوو بدرێ، ئەویش چونکە زانراوە کە حوکمەتی عیراقی تا ئیستا نەیتوانیوە ناوچەکانی ژیر دەسەلأتی شیخی بارزان کۆنترۆڵ بکات. بەلأم (مەندوبی سامی) داوای لی کرابو کە فشار بخاتە سەر حوکمەتی عیراقی بەوەی کە زۆر پیویستە هەندێ رێو رەسمی کاریگەر بخەنەکار کە لە بەرژەوەندی هەردو ولأتەکەدا بێ، بەلأم من هەست دەکەم کە (سیر ئیف. هامفرین) توانیبوی تورکیا رازی بکات کە ئەمەیان ئەوەندە نیازپاکانە نیە، چونکە لەمەر بونی هیزیکی وا بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارە لە عۆدەو توانای (بەغدا)دا نییە، هەولیش دەدا کە ئەم روانینە دەست بەجێ بە حوکمەتی بەغداد رابگەیەنێ. بۆ ئەوەش دلنیایی و رەزامەندی خۆی دەربری. (کاك شیرزاد حەسەن وەریگیراوە).

**ژیان، ژمارە (١٠١)، ٩ی شباط ١٩٢٨**

*قسەی حەق وەلەو رەقیش بێ نابێ کەس پێی ناخۆش بێ..

وەکو تەماشا ئەکەمو ئەبینم لە سلیمانیو لە خارج زۆر کەسو ئەنواعی ئینسان خۆی حازر کردوەو تەشەبوثات ئەکەن بۆ ئەوەی کە ببن بە مبعوث.

ئەم زەواتانەش قسمیکیان بەبێ مەسئولیەت موقابل بە میللەت خوا کردونی بە مبعوثو بەقەد مبعوثێ کە بۆ میللەتی خۆی صەرفی صمیمتو غیرەتی کردبێ حورمەتو شەرەفو ئەملاكو سەروەتیان هەیەو لەنەزەر عمومدا زۆر بە ئیعتبارو نفوذن، لاکن مع التأسف چونکێ لەمەوپیش تەحسیلی مەکتەب لەم محیطەدا مهمو مطلب نەبوە باخصوص بۆ پیاویك کە ساحیبی سەروەتو ملاك بووبێ دلی نەهاتوە ئەولاد لەخۆی دور بخاتەوەو بینیریتەوە مەکتەبو زیاتر مغرور بە ثروتو ئەملاكو اعتباری ئەولادی لە تەحسیلی مەکتەبو مەکاتب عالی محروم کردوە هەر تەنها بە حجرەکانی محلە اکتفای کردوەو بەسایەی شەرەفو ئەملاکیانەوە بە حورمەت ژیاونو ئیستایش لە نەزەر ئەمحالیدا ئەو شەرەفو حورمەتە باقیە فقط چونکە لە مەکاتب عالیدا تحصیلیات نیە ئەم وەزیفە مهمەیان پێ ناکرێو هەر تیا مەحجوب ئەبن. چونکە ئەمرۆ وەزیفە نیە کە لە وەزیفەی مەبعوثی مهمتر بێ وەکو وەزیفەی تر نیە هەر مقابل بە شخصیك محجوب بێ. محجوبی مەبعوثی مقابل بە میللەتیکە، مەبعوثی مقتدرو زبان زانو عالمو صاحب وجدانو بە هیمت بێ میللەتیك بەرز ئەکاتەوەو ولاتیك معمورو ئاوەدان ئەکات، خوانەکردە عەکسی ئەمە بێ میللەتیك دوا ئەخاتو ولاتیك ویران ئەکاتو خۆشی رەزیلو بێ حورمەت ئەبێ.

کەوابو یەکێ لە هەموو خصوصیکەوە خۆی بەلایق نەبینێو نەزانێ لەم وەزیفەیەدا مەحجوب نابێ، نابێو حەیفە تەشەبث بەم وەزیفەیە بکاتو ئۆبالی میللەتیك بخاتە ئەستۆی خۆیو اعتباری خۆی لای میللەتەکە مەخو بکاتەوە، بەعزیکی تر هەن کە خۆیشیان ئەیزانن ئەم وەزیفەیەیان پێ ئیفا ناکرێو ناشبن بە مبعوث، کەچی منفعتی زاتی سوقیان ئەکات نشبت بۆ ئەم بارە قورسە ئەکەن، ئەمانەش دو کلمە خویندنی مەکتەبی ابتدائی، وەیاخود چەند لە مأموریتدا مستخدم بون، چوار کلمە فیربون سوقی ئەم تشبثەی کردون، مەبعوثی هەر بەتەنیا بە خویندنو خویندەواریش تەواو نابێ، نابێ لەبەر بێ مأموریەتیو یاخود بۆ ترقی مأموریت ئەم تشبثە بکات، مبعوث ئەبێ میللەت پەروەر بێ، صاحبی اخلاقو وجدانو رەحم بێ، عالمو زبان زان بێ، موقعی اجتماعی لای میللەتەکەی ببێ، منفعت پەرست نەبێ، لە احتیاجات میللەت چاو نەپۆشێ، بە ثبات بێ، رۆحی خۆی فیدای

منفعتی میللەت بکاتو بتوانێ مجادلە لەگەڵ ئەو پیاوە تحصیل دیدانە بکات کە لەو مەجلیسەدا مجادلەو سەعی بۆ وەتەنی خۆیان ئەکەن، چونکە هەمو ئەیزانین لەو مەجلیسەدا حیاتو ممات بەش ئەکرێ، هەر میللەتە مەبعوثی چاکی ببێ بەرحیات ئەبێ، عەکسی چاك بێ مردن بەشیەتی.

ئەمجا کوا بوو حەیفە گەوهەر دۆراندن، رجا ئەکەم لەسەر ئیوە فەرزە بەم نفوزو حورمەتەوە سەعی بکەنو تنویری ئیمەمانان بکەن تا بە عموم پیاوی لایق، تجربە دیدەو ئەربابی خۆی بدۆزینەوە، کە ئەم بارە گرانە بدەین بە سەریانا، ئەم قسانەم بەبێ ئەدەبی عد مەکەن، وەللا کەسم نیە چاوی لە مبعوثی بێو خۆیشم لە ئیوە نالایق تر.

حەق بیژی قسە رەق

* * *

**ژیان، ژمارە (١٠٢)، ١٦ی شباگ ١٩٢٨**

***وزارە تازە..**

ئەمساڵ بەنظر تاریخ سیاسی عراقەوە سالیکی مستثناو مهم بوو، لەلایەکەوە اعضای وزارەتی سابقە بە کمال کەرەمیو وجدیت خەریکی مفاوضە بون لە لندن، لەم لایەشەوە بە عین کرمیو حرارت رۆحی معارضة لە زیادبونا بو، لەسەریکەوە فعالیەت مجاهداتی وەفد عراقی تقدیر ئەکرا، خلاصة لەم بحرانەدا رۆسای سیاسەت ریگای خۆیان ون کرد سیاسەت داخلیەیان کاملا وەیا تقریبا لەبیر چووەوە، اخیرا لە هوایەکی وا پر فەرتەنەدا قابینەی تازە تشکلی کرد.

ئەبینم هەر وەکو من هەموو فەردیکی کورد کە خبری زانی جنابی فخامت مئاب حەزرەت عبدالمحسن بك السعدون تشکیلی وزارەت ئەکات زۆر کەیف خۆش بوو، چونکە اول داخلکەری وەزیری کورد بە قابینەی عیراق حەزرەتی عبدالمحسن بك بوو، لەبەر ئەوە ئیمە لە هەموو خصوصیكو حقوقیکەوە ئەمەلی گەورەیان بەو زاتە محترمە هەیە، غەیری ئەمەیش هەموو کەس ئەیزانی کە فخامتی لە هەموو کەسێ زیاتر لەسەر ئامەدانو ئەشراف عراقەو انجبی نجبای میللەتی نجیبەی عەرەبە، طبیعی زاتیکی وا نجیبو داهی هەموو وەقتیك کرمو سنمای ئەبێ تأملیك لە لیستەی وزارەت تازە بکرێ معلوم ئەبێ کە اقلیاتی عراق هەریەکە لە صورتی شخصی وەیا دو شەخصا

تجسمی کردوەو بەکەمالی هیبەتو وقار لەسەر کورسی وزارەت دانیشتوە، کەچی قومی بەدبەختی کورد بە نظر ئەم اقلیاتەوە اکثریەتیکی عظیمە تشکیل ئەکەنو ئەگەر موافقی عدلو مساواتو بەپێی نفوسی موجودە حرکەت بکرایە حقی اشغالی (۳) کورسیان نەبو، مع الأسف سماحتی بەخشینی کورسیەکەیشمان لەگەڵ نەکرا.

ئیمە قومی کورد، هیچ وەقتیك نەمانویستوەو نامانەوێ حەرەکەتیك کە ذرەبونی تفرقەو (جیاییتی) تیابێ بیکەین. فقط ئەبینین ئیمە مقابل بە خلوصو اعتمادمان لەتەنها کورسییەکی وزارەت محروم ئەبین. لەگەڵ ئەمیشدا کە ئەم محرومیەتەو ئەم تجاوزی حقە بە انتظارو عدالەتەوە مقابلە ئەکەین، کەچی یەکێ لە غەزەتەکانی بەغداد بە صورت استهزا ئەنوسێ کە کورسییەکی وەزارەت بۆ برا کوردەکانمان هەلگیراوە فقط فخامتی عبدالمحسن بك نشئوم لە أیت (تسعه فقط یفسدون فی الارض) کردوەو، نایەوێ وزارەت نویم بدا بە کەس وەیا بە تعبیری اصمەکی بیدا بە کورد. نەکو افساد ارضی عراق بکەن. سبحان الله اولا ذاتیکی نجیبو قدردانو تیگەیشتوی وەکو فخامتی محسن بەگ هیچ وەقتیك فکریکی وای نەکردوەو نایکات.

ثانیا: طفل مشروطیێ عراق هەتا ئیستا پینج باوك یا پینج وزارەتی دی، لەمانە تەنها دوانی اخیر کورسیەکی کوردی تیابو، نازانم کامەیەك لەم پینجە بە صمیمیتو جدیەتیکی وەتەن پەروەرانە بۆ منافعی ملكو میللەت تێ هەلچونو، چەند خدمەتیکی مهمیان بۆ امتەکەیان کردو چ اثریکی ترقی سیاسی، اجتماعی، اقتصادییان پیشاندا.

مقسد توهم لێ تیك دان، یاخود نەبێ رشی شخصیك بەرامبەر بە رشیو ناقدومی هەشت کەس چ تأثیریکی بیی کە افساد ارض بکات.

ئیمە بەناوی سلامەتی وطنەوە ئارەزومان وابو کە هەمو عناصر مختلفەی عراق دەست بدەنە یەكو متفق بنو ریگای نشرو دەرکەوتنی بەعزێ قسەو نوسین نەدرێ کە بەبێ سبب تفرقەو برودت بەینی کوردو عەرەب.

وەدیسان بەناوی عدلو مساواتەوە ئارەزومان نەکرد کە رئیس وزرای تازە لە تەشکیلی قابینەکەیدا قەومی کورد بە اکثریت مهمەیەوە لەبیرنەچوایەوە، بە سنماو کرمیکی سعدونییەوە ئەویش وەکو اقلیاتەکانی تر ناتل دوو یا کورسییەك بکردایە.

* * *

**ژیان، ژماره (٩٩)، ٢٤ی کانون پانی ١٩٢٨**
***صورت مترجمەی تلغراف ژماره ١٠٦٧ رۆژ ١٩٢٨/١/١٩**
**وزاره داخلیه:**
**بۆ متصرف سلیمانی**

له بر اوەی که اساس مشروطیت ایجاب به موزانتیکی قوی اکات له بینی قوای اجرائیەو قوای تشریعیەداو ام موزانتەیش منوطه به موجودیتی شعبات پارلمنتوکه صاحب مقاصد معینەو غایەی معلومه بن‌و لبراوەی که اوضاع اثباتی کردوه مجلس امت له وضعیت حاضیریدا او فرقانەی تیانیه تأمینی موجودیتی ام موازنته بکاو لبراوەی حکومەت مسائلی زۆر مهمی بدستەوەیه که منافع اهم ملتی تیایه وەکو معاهده انگلیزو عراق‌و اتفاقنامەی مالی‌و عسکری‌و مسئلەی دفاع وطنی که ایجاب اکات له همویان ملتی خبردار بکریت که حسیات خۆیان نیشان بدەن‌و فرصتیان بدریتی که لم خصوصاتەوه به واسطەی ممثلین‌یانەوه خواهش خۆیان بیان بکەن، و فسخی مجلس امت‌و مباشرت به انتخابات بو مجلس تازه موافق ماده (٢٦) قانون اساسی ارادەی ملکی صادر بوه، امرو مجلس فسخ بوەوه، بو معلومات بو اوەی فورا موافق قانون دستی به انتخابات نیررا.

* * *

**ژیان، ژماره (١٠٣)، ٢٣ی شباط ١٩٢٨**
***خیطلبیك مقابل به هەموو میللەتی کورد..!**

ئیوه هەمو ئەیزانن بەپێی قراری عصبه الامم ئەمرۆ ئیمه لەگەڵ حکومەتی عراق ئەژین‌و هەمو مقدراتیکمان لەگەڵ ئەوانایە، له هەمو شتیك زیاتر سبب‌و الـتی (ئالیەتی)! ترقی‌و تعالی میللەتیك قوانین‌و نظاماتی حکومەتەکەیە، یەعنی ترقی میللەتیك لەگەڵ قوانین حکومەتەکەیان مبسوطا متناسبه، باش بێ ئەبێ به واسطەی ترقی میللەتەکه، خراپ بێ میللەتەکه دوا ئەخات‌و محوی ئەکاتەوه، و هەموویش ئەیزانین ئەم قوانین‌و نظاماته هەمووی بۆ تدقیق‌و اصلاح‌و تصدیقی تودیعی مجلس مبعوثان ئەکرێ، طبیعی ئەوسا هەموو مبعوثیك لەگەڵ قابلیت ملیەی‌و سعتی ارضی لواکه مفید بو تصدیق والا به اعتراضیکی معقول هەتا ئەبێ به سببی ترقی لواکەی

بۆ اصلاحی هەوەل ادا، ئینجا کەوابو بۆ ئەم جیگایە پیاوی فعال و مقتدر، وەتەن پەروەرو میللەت خۆشەویست بەعەمەل دێ، ئەمرۆ لیواکانی کورد دواکەوتوی هەمو عیراقە، ئەمیش بە واسطەی مبعوثەکانمانەوە بو، چونکە ئەو مبعوثانەی کە لە اوەل دورەدا انتخابمان کردن هەموی نا فقط بە اکثریت هیچ اوصافیکی مبعوثیان تیا نەبو، پیاوی ئەو مجلسە نەبون و هەریەکەیان بۆ منفعتی خصوصی خۆیان منفعتی عمومی میللەتەکەیان واز لێ هینابو، بۆ خاتری خۆیان گەورە بن هەریەکە ائنتسابی کردبو بە یەکێ لە وەزیرەکان و پیاو بەدەستەکانی ترەوە، عادتا وەکو مادۆنیکی ئەوان تابعی هەموو ئەفکارو ئەوامریان بون، هەتا نتیجە وا دوایان خستین و لە هەمو اساسیکی ترقی محرومیان کردین.

ئینجا میللەت خۆ ئەمانەمان زانی، لەوانەوە تجربەیەکی باشمان دی، لازمە عەقلمان بیتەوە سەر، هەمو الحالی لیوایەك بەجدی تێ بکۆشین کە بۆ ئەم جیگایە پیاوی باش و فعال و مقتدر، میللەت پەروەرو وەتەن خۆشەویست انتخاب بکەین، چونکە ئیتر ئەمە بۆ حیات و استقبالیکی چوار سالییە، خودانەخواستە ئیتر ئەگەر لەم حالیش زیاتر دوابکەوین (جبرما فاتی)! قابل نابێ و پەشیمانی فائدە ناکات، ئیتر خۆتان و غیرەتتان، (حب الوطن من الایمان) ئەنێ بەدڵ و بەگیان بۆ وطنەکەمان هەوڵ بدەین.

* * *

**ژیان، ژمارە (١٠٤)، ١ی مارت ١٩٢٨**

***بە مناسبتی انتخابات تازەی مبعوپانەوە چەند قسەیەکی رەق ئەمما خۆش..**

لەم بەینەدا بە مناسبتی انتخاباتی تازەی مبعوثانەوە شاری سلیمانی وەضعیتیکی عەجایبی بەسەرا هاتوە، لەهەمو کۆڵانیك، لە هەمو چایخانەیەك و دیوەخانیك قسەو بەحثی مبعوثی تکرار ئەکریتەوە، حتی دوائری حکومەت، ستون غەزەتە بەم موضوعە اشغال کراوە، هەر کەسە بە نوعیك تشویقات بۆ خۆی و یا بۆ خزمیك و دۆستیکی ئەکات، ئەوانەی کە اقتداری کاتبیکی دائرەیەکیان نییە هەوای مبعوثی کەللەیانی پر کردوە، ئەوانەی تا ئەمرۆ کوردیەت و میللیەتیان پێ عار بوە ئەمرۆ بەلایەنی فیداکاری و وەتەن پەروەری گویی عالمیان کەرکردوە، هەر کلەیك، هەر انیك نوعیك نقرات تکرار ئەکاتەوە، وەکو برخەکە ئیستا-دایکی من رش بو- هەریەکە رۆژی نەوعێ ئەلبسە لەبەر ئەکات و لەنەوعە شکلیکی مختلفدا خۆی نیشانی میللەت ئەدات، خۆ مخابرات و کاغەزی التماس ئەوەندە زۆر بوە پۆستەی ئەوەندە گران

کردوه که متعهد به اوتومبیل پێ هەلناگیرێ، اشتیاق و فیداکاری بەعزیك ئەوەندە لە غلیانە کە تحملی جوابی کاغەزەکانیان ناتوانن بکەن، خۆیان بالذات بالغات بە شوین کاغەزەکانیانا دینە سلیمانی. زائرین ئەوەندە زۆر بوە دیوەخانانی پر کردوە، (ئیمە بیستومانە کە لە کوردستانا هەر گەزۆ ئەباریت، نەمانزانیوە کە ئەمساڵ پەلەی مبعوثی داوە) فقط ئەی میللەت، ئەی برادەرینە قسەی راستتان عەرز بکەم، ئەم هەمو فیداکاریە، ئەم کثرت اشتیاقە، ئەم کۆمەلە لاف و گەزافە، محقق بزانن هەر بۆ معاشە مبن و لەکەیە! هەر بۆ پرکردنی گیرفانە لە مسکوکات متنوعە. خۆزگە حکومەت ئەم خزمەتی وەتەنەی مجانا تکلیف بکردایەو یامعاشی مبعوثی بکردایە بە صەد روپیە، ئەو حەلە فیداکار، وەتەن پەروەر بوار دەری ئەخست، بە اعتبار بە اکثریت کە ظاهرا بەزمان ئەم وەعدانە بەئیوە ئەدەن، ئەم فیداکاری کە پشانی ئەدەن، کەچی لەدلدا لەگەڵ شتیکی تر خەریکن، ئەوان پلانی خۆیانیان دەمیکە ریك خستوە، لەم ادوار اجتماعەدا چەند معاش وەرئەگرن، چەند صرف ئەکەن، چەندی پاشەکەوت ئەکەن، هەمویان حساب کردوە، لەسەر چ جادەیەك، لە چ مملکتیك کلاوی چەقور بەسەریك بە هەرزان ئەکرن و لەو کلاوەدا چ نەوعە بینایەك دروست ئەکەن و یا چ دییەك ئەکەن. هەموی بەریك و پیکی پرۆغرامەکەی کە بەخەیاڵ ترتیبیان کردوە لە گیرفانیانایە، (مزگەوت روخاوە محرابی نەماوە) ئەی میللەت محقق بزانە کە ئەبێ خۆت بەزەییت بەخۆتا بیتەوە.

فقط ها ئەم قسانە بۆ ئیوە نییە، کە ئیوە مأیوس بن ذاتا لەسەرەوە وتم ئەم قسەیەم بە اعتبار عمومی نییە، لە ناوخۆدا انسانی فیداکار، وەتەن پەروەر، مستعد هەیە، زۆر چاك چاو بگیرە، زەریف وردبەرەوە، لە رووا دامەمینە، خزم و ئاشنا تەماشا مەکە، ئەوەی بەکەلکت دیت، ئەوی دەرمانی دەردت ئەکات، ئەوی اعتمادت بە علم و سویەی هەیە، ئەوی قیمەتی لای تۆ مەعلوم و مجربە، حاصلی ئاوی حیات و مماتی ئەوی، سعادەت و فلاکەتی لەگەڵ تۆدا مشترکە ئەوە هەلبژیرەو پرۆغرامی داوا لی بکە، پشت بە یەکیك مەبەستە کە ئاگرت تێ بەربداو خۆی لە دورەوە سەیرت بکات ئیتر (من انچە شرط بلاغ است یا تومیکویم. توخوا هی از سخنم پند کیرو ضواهی ملال).

* * *

# ٢- کوردو پەیماننامەی ١٩٣٠

## ٢-١ وەزارەتی نوری سەعید

عیراق بۆ ئەوەی زەمینەی بەستنی پەیمانیکی نوێ لەگەڵ بریتانیا خۆش بکاو، ئەویش زەمینەی سەربەخۆیی عیراق و، ئامادەکردنی بۆ ئەندامەتی لە کۆمەڵەی گەلاندا خۆش بکا، ئەبو هەڵبژاردنیکی نوێ، بۆ مەجلیسیکی نوێ، ساز بکا. دانانی ریوشوینی هەڵبژاردنی نوێ بە وەزارەتەکەی عەبدولموحسین سەعدون سپیردرا. بەڵام سەعدون لە ئیوارەی ١٩٢٩/١١/١٣ خۆی کوشت.

رۆژی ١٩٢٩/١١/١٨ وەزارەتی نوێ بە سەرۆکایەتی ناجی سویدی دامەزرا. وەزارەتەکەی سویدی لە ٤ مانگ کەمتر دەوامی کرد. رۆژی ١٩٣٠/٣/١١ دەستی لە کار کیشایەوە. مەلیك فەیصەل داوای لە نوری سەعید کرد وەزارەت دروست بکا.

نوری سەعید لە ١٩٣٠/٣/٢٣ وەزارەتیکی نوێی پیك هیناو، سەرەرای ئەوەی خۆی سەروەزیران بو، لەو وەزارەتەدا بە وەکالەت هەردو وەزارەتی کاروباری دەرەوەو، کاروباری ناوخۆیشی بۆ خۆی دانا. وەزارەتی کاروباری دەرەوە بۆ ئەوەی خۆی سەرۆکایەتی نوینەرایەتی عیراق بکا لە گفتوگۆدا لەگەڵ لایەنی ئینگلیزی بۆ بەستنی پەیمانیکی نوێ کە هەموو ریککەوتنە کۆنەکانی عیراق - بریتانیای هەڵئەوەشانەوەو، وەزارەتی کاروباری ناوخۆیش بۆ ئەوەی ئەنجامی هەڵبژاردنەکە بەجۆرێ مسۆگەر بکا، کە پەیمانەکە هەرچۆنێ بێ، ئیمزا بکەن.

بابەتی گفتوگۆکانی عیراق و ئینگلیز لە رۆژنامەکاندا بڵاو ئەبونەوە. یەکێ لەو مەسەلانەی کە سەرانی کوردی ئەوروژان، ئەوە بو: پیشنوسی ئەم ریککەوتننامە تازەیە هیچ مادەیەکی دەربارەی پاراستنی مافەکانی کورد تێدا نەبو. تەنانەت کە مەعروف جیاوك (نائیبی هەولیر) لەو بارەیەوە لە مەجلیسی نوابدا پرسیاری لە سەروەزیران کرد، بە تورەبونەوە وتی: "ئەمە ریککەوتننامەیەکی ناودەولەتیە پیویست ناکا مەسەلە ناوخۆییەکانی تیدا بێ".

وەزارەتی نوێ بریاریدا دووەمین مەجلیسی نواب (١/١٠/٩٢٨ - ٢٤/٣/٩٣٠) هەلبوەشینریتەوەو، لە ١٠/٧/١٩٣٠دا دەس بکرێ بە هەلبژاردن بۆ سێیەمین مەجلیسی نواب و تا ١٠/٩/١٩٣٠ تەواو بکرێ.

## ٢-١-١ سیاسەتی عیراقیی نوری سەعید

نوری سەعید بۆ ئەوەی ئەنجامی هەلبژاردن بە قازانجی پەسەندکردنی پەیمانەکە دەستەبەر بکا، چەند ریوشوێنیکی دانا:

بەبیانوی ئەوەی کە رۆژنامەکان دژی سیاسەتی ناوەوەو دەرەوە ئەنوسن، رۆژنامەکانی: الرافدان، صدى الاستقلال، الشعب، البلاد...ی داخستو، سەرنوسەرەکانی خستە ژیر چاودیری پۆلیسەوە.

هەولیکی زۆریدا، ریزی حیزبە موعاریضەکان تیك بداو، کەسانیکیان لی بکرێ. خۆیشی، بۆ پشتگیری لە ریککەوتنەکە، (حزب العهد)ی لە کەسانی سەر بە خۆی دروست کرد.

لەناو دەزگای بەریوەبەرایەتیدا، بە بیانوی کارامەییەوە، ئالوگۆریکی زۆری لەناو فەرمانبەراندا کردو، دەسەلاتیدا بە وەزیرەکانیش، بە بیانوی زۆریی فەرمانبەرانەوە، کییان بۆی دەری بکەن.

دەرەبەگەکانی بە ئەرازی ئەمیریەوە خەریك کردو، بەوە ترساندنی حکومەت ئەتوانێ ئەرزەکانیان لی بسینیتەوە، ئەگەر لەگەلی نەبن.

سەرۆکی ئەرکانی جەیش فەرمانی دەرکرد، کە هیچ عەسکەرییەك بەچەکەوە نەگەریو بۆ هیچ کۆریکی ئاینی نەچن و هەمو ئیجازاتیك کەم کرایەوەو لەغو کرا.

موفەتیشە ئیدارییەکانی ئینگلیز، لەگەل دەزگای بەریوەبەرایەتی حکومەت کەوتنە هاوکاری بۆ هەلسەنگاندنی هەلویستی یەك بە یەکی پالیوراوەکانی هەلبژاردن بەرامبەر ریککەوتنەکە.

## ٢-١-٢ سیاسەتی کوردیی نوری سەعید

نوری سەعید، بۆ ئەوەی کورد ئارام بکاتەوەو پشتیوانییان بەدەس بهینێ، بەپیی راسپیریەکانی موستەشاری بریتانی وەزارەتی ناوخۆی عیراق هەندێ هەنگاوی بە قازانجی کورد نا.

لەبواری ناسینی ڕەسمیی زمانی کوردیدا: لە بەیانیکدا وتی: ((پاش ئەوەی کە وەزارەت کاروباری گرتە دەست بریاریدا گرنگی بدات بەو شتانەی کە دلی میللەت خۆش ئەکەنو هیواو ئارەزوەکانی بەشیك لە دانیشتوانی ولآتمان ئەهیننە دی، لەبەر ئەوە بریاریدا کە لائیحەیەکی قانونی ئامادە بکات بۆ کردنی بە ڕەسمیی لەو شوینانەی کوردی لییە، بە پێی مادەی ١٧ی قانونی ئەساسی. ئەم هەنگاوەی حکومەت لەسەر ریبازی ئەو گفتانەیە کۆن دراون بە کوردەکانی عیراق)) ئەم بریارە بە چاکە دەنگی دایەوەو سەرانی کورد بروسکەی سپاسیان بۆ نارد.

لە کەرکوك حکومەت حەفتەنامەیەکی بە تورکی لەژیر ناوی (کەرکوك)دا دەرئەکرد، تا ئەو کاتە هیچ ڕۆژنامەیەکی حکومەتی یا ئەهلی لە کەرکوك دەر نەچو بو، وەکو بەشێ لە سیاسەتی رازیکردنی کورد، ٤ لاپەرەی (کەرکوك) بۆ نوسینی کوردی تەرخان کرا.

لە بواری مەعاریف (خویندنو پەروەردە)دا: مەعاریفی لیوای هەولیر لە مەعاریفی لیوای موصلو، مەعاریفی لیوای سلیمانی لە مەعاریفی بەغداد جیا کرایەوەو، مەعاریفیکی تایبەتی بۆ ناوچە کوردیەکان لە مەرکەزی کەرکوك دامەزرا. نوری بەرزنجی، بەریوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی فەضل لە بەغداد، کە مامۆستایەکی کورد بو، کرا بە پشکنەری ئەم دەزگایە. وەزارەتی مەعاریف، بۆ دەرسی قوتابخانە سەرەتاییەکان هەندێ کتیبی وەکو (دین، علوم، جغرافیە، تاریخ، هندسە) تەرجومە کرد بە کوردی.

لە بواری بەریوەبەرایەتیدا: هەندێ کەسایەتی ناسراوی کوردی هینایە پیشەوەو، کاری بەریوەبەرایەتی گرنگی پێ سپاردن، لەوانە: تۆفیق وەهبی کرا بە موتەصەرریفی سلیمانیو، عەبدولحەمید عەبدولمجید کرا بە موتەصەرریفی هەولیرو، صالح زەکی بەگ کرا بە معاون مدیر عامی داخلیە. ماجید مستەفا، کرا بە قایمقامی قەزای ئامیدی. خەلەف شەوقی بە پشکنەری دارایی. هەندێ لەمانە بە کەسانی کوردپەروەر ناسرا بونو، هەندیکیان لە هاوکارانی پیشوی شیخ مەحمود بون.

وەزارەتی عەدل، شیعاری دەولەتی عیراقی، دانا. لەناو ئەم شیعارەدا دو ئەستیرە وەکو نیشانەی هەردو گەلی کوردو عەرەب چەسپاند.

ئەم هەنگاوانەی نوری سەعید، بایی ئەوە نەبون، پشتیوانی نیشتمانپەروەرانی کورد بەدەس بهینێ، ئەوان چاوەروانی دەسکەوتی سیاسی بون، لە یەکێ لەو بڵاوکراوانەی بێ ئیمزا لەسەر ئەم وەزارەتە دەرچوە، نوسراوە: ((کورد لە ئەقوال زیاتر چاوەروانی ئەفعالە)).

## ٢-١-٣ دانانی تۆفیق وەهبی

تۆفیق وەهبی یەکی لە پیاوە تیگەیشتوە ناسراوەکانی ئەو سەردەمەی سلیمانی بوە. لە سلیمانیو بەغدادو ئەستەموڵ خویندویەتیو، لە ئۆردوی عوسمانیدا بۆتە ئەفسەری روکن. لەسەرەتای بیستەکاندا گەرایەوە عیراقو، لە بەغداد دامەزرا. کە شیخ مەحمود لە دیلی ئازاد کراو گەرایەوە کوردستانو، بو بە حوکمدارو دواتر مەلیکی کوردستان، تۆفیق وەهبی گەرایەوە سلیمانیو بو بە یاوەری. لە داگیرکردنی دوەمی سلیمانیدا (١٩٢٢) کوردستانی بەجێ هیشتو چوەوە بەغدادو، لەجەیشی عیراقدا ئەفسەرو ماوەیەك فەرماندەی قوتابخانەی جەنگیی پیگەیاندنی ئەفسەرانی عیراق بو.

تۆفیق وەهبی بە کورد پەروەرو رۆشنبیر ناسراوەو، چەندین زمانی زانیوەو خەریکی لیکۆلینەوەی زمانەوانی بوە. (دەستوری زمانی کوردی) داناوە، کە بە یەکەمین هەولی زانستیی دارشتنی ریزمانی کوردی دائەنرێ.

لەمانگی مایسی ١٩٣٠دا کرا بە موتەصەرریفی سلیمانی. ئەم هەوالە بە خۆشییەکی زۆرەوە وەرگیراو، (ژیان) بە ستایشیکی زۆرەوە لەسەری نوسیو، ژمارەیەکی زۆر لە خەلکی سلیمانی چون بۆ پیشوازیو، هەندیکیان هەتا کەرکوك رۆیشتن. ئەو ماوەیەی کە ئەو موتەصەرریف بو، جوڵانەوەی رۆشنبیریو سیاسیی بۆ داواکردنی ماڤی نەتەوەیی کورد لە سلیمانی گەیشتە پۆپەی. حکومەتی بەغداد ئەم چالاکیەیان بە هاندانی ئەو ئەزانی. لەسەر ئەوە لەسەرەتای ئەیلولی ١٩٣٠دا، پاش چوار مانگێ، کیشرایەوە بەغدادو لەسەرکار لابرا. دانانی چ خۆشییەکی لە سلیمانی خولقاند، لابردنی زۆر لەوە زیاتر نارەزایی وروژاند. بە بروسکەو مەزبەتە ئەم نارەزاییەیان دەربری، بەڵام لە پایتەخت هیچ کەس گوێی نەدانێ.

## ٢-١-٤ دەنگدانەوەی پەیمانەکە

لە ١/٤/١٩٣٠دا دەس کرا بە گفتوگۆ بۆ پەیمانی ٣٠/٦/٩٣٠ کە بەپێی ئەم پەیمانە ئەبو عیراق سەربەخۆ بێ. نوری سەعید رای گەیاند رۆژ بە رۆژ خەلك لە رەوتی وتوویژ ئاگادار ئەکات. نوری سەعید ئەو ماوەیە لە لەندەن خەریکی گفتوگۆ بو، جەعفەر عەسکەری وەکیلی سەروەزیران بو.

لە ١٨/٧/٩٣٠دا بەندەکانی پەیمانەکە بە رەسمیی لەلایەن (ملاحظیة المطبوعات)ەوە درا بە رۆژنامەکان کە بەبێ لیدوان بکەنەوە. لە دورو نزیکەوە باسی مافەکانی کورد لەم پەیمانەدا نەبو.

لەزۆر شوینی عیراق، لە خوارو ناوەراستو سەرو، دژی بەندەکانی ئەم پەیمانە راوەستان. بەلاّم بارودۆخی سلیمانی لە هەمو شوینەکانی کە ئالۆزتر بو. هۆی دژایەتی کردنی ئەم پەیمانە لەلایەن کوردەوە جیاواز بو، لە هی دژایەتی عەرەب. عەرەب پییان وابو ئەمە نەك سەربەخۆیی بۆ عیراق دابین ناکا، بەلکو جۆریکە لە بەندایەتی. هەرچی کوردیش بو، پییان وابو ئەم پەیمانە چونکە ناوی کوردی نەهیناوە، لەناو عیراقی عەرەبی دوارۆژدا مافەکانی کورد پایەماڵ ئەبێ. بریاری گشتی لە سلیمانی ئەوەبو کە هاوبەشی هەلبژاردن نەکەن.

## ٢-٢ هەیئەتی وەطەنییە

لەم ماوەیەدا جولاّنەوەی کورد، لەو شکستەی کە بە هۆی شکانی جەنگیی شیخ مەحمودەوە توشی هات بو هەستا بووەوە. گیانی نەتەوەیی سەر لەنوێ بوژا بووەوەو، سەرانی کورد کەوتبونەوە جموجۆڵ. ماوەی ئینتیدابی بریتانی بەرەو تەواو بونو، خۆ ئامادەکردنی عیراق بۆ بەستنی ریککەوتننامەیەکی نوێ لەگەڵ بریتانیاو، بەدەسهینانی سەربەخۆیی و چونە ناو کۆمەلی گەلانەوە. ئەمانە نیشتمانپەروەرانی کوردیان پاڵ پیوە ئەنا، ئەوانیش داوای مافی نەتەوەیی کورد بکەن. بەتایبەتی چونکە هیوایان بە (دۆستایەتی) بریتانیا و (عەدالەت)ی کۆمەلەی گەلان هەبو.

سەرانی کورد بە هیوا بون پیوەندیەکانی عەرەب و کورد لە عیراقدا، وەکو پیوەندیەکانی ئینگلیزو سکۆت لە بریتانیا، ریك بخرێ. ئینگلیزەکانیش خۆیان ئیشارەتیان بەمە داوە. تەنانەت خۆشباوەریی هەندێ لە کوردەکانی ئەوسا

گەیشتۆتە ئەو رادەیە کە کورد لە تورکیا قەتلوعام ئەکرێ یەکی لە شاعیرە کوردەکان لەژێر سەرناوی: ((شین: تازیەی کوردان))دا لە شیعریکی دریژدا نوسیویتی:

گەردون کەوا کۆمە، زبانیشی کە لالە
بۆ کوردی ستەمدیدەی خنکاوی شیمالە
ئەم چەرخە لەگەڵ چەرخ بە دایم کە لە شەردا
شینیکی شەهیدانە، لەپیرو لە منالە
ئەم کوردە چ مەزلومە، خوینی چەنە ئالە
ئایا ئەبێ لەم حالە نەگەن ئەهلی بریتان
هەم گەورەو سەردارو گەلی میللەت و قەومان؟[٢٨]

پیاوە ناسراوەکانی سلیمانی، کە بە زاراوی ئەوسا پییان وتون (ئەشراف و وجەها)، ئەکەونە خۆیان و چەند جارێ لە مالی حەمەی ئەورەحمان ئاغا و چەند جارێ لە مالی عەزمی بەگی بابان دائەنیشن و لەسەر پاشەرۆژی کورد، بەتایبەتی دوای تەواو بونی ئینتیداب و سەربەخۆبونی عیراق، لەگەڵ یەك راویژ ئەکەن. ئەمانە لە ناو خۆیاندا جۆرە کۆمیتەیەك بە ناوی: (هەیئەتی وەطەنییە)وە پیك ئەهینن. عەزمی بەگی بابان، کە لەهەمویان بە ساڵدا چوتر بوە، سەرۆکایەتی کردون. ئەم هەیئەتە باوەری بە بەکارهینانی توندو تیژی نەبوە، وەکو عیزەت بەگی جاف وتویەتی: "ئەم جارە سیلاح و تفەنگمان قەلەم و موراجەعاتە". پەیوەندیەکی فراوانی لەگەڵ کەسایەتیە ناسراوەکانی کوردو سەرانی عەشیرەتەکاندا دروست کرد.[٢٩]

---

[٢٨] ژیان، ژ٥٨، ١٧ی مارتی ٩٢٧

[٢٩] مەعروف جیاووك لەو بارەیەوە نوسیویتی: ((جەمعیەتیك لە سلیمانی پیك هات بۆ داواکردنی سەربەستیی و سەربەخۆیی. دامەزرینەرەکانی وەکو لەبیرم بێ: حەمە ئاغای ئەورەحمان ئاغا، شیخ قادری حەفید، محەممەد صالح بەگ، توفیق قەزاز، رەمزی فەتاح، عیززەت مەدفەعی، عەزمی بەگی بابان، عیززەت بەگی عوسمان پاشا، ئەورەحمانی ئەحمەد پاشا، فایەق بەگی بابان، شیخ محەممەدی گولانی و، سکرتیری ئەم هەیئەتەش رەشید نەجیب بو، کە بو بە موتەصەرریفی کەرکوك، ئەوسا کاتب بو لەلای موفەتیشی ئیداری حاکمی سیاسی)). (معروف جیاوك: ماساە برزان المظلومە، بغداد، ١٩٥٤، ص٨٣ – ٨٤. وەکو ئەلین مەعروف جیاوك باوەرپیکراوی ئەم هەیئەتە بوە لە هەولیر، بەڵام لەدوای

شيخ مەحمود لەو كاتەدا لە پيران دانيشت بو. ئەم تاقمە كە دەس ئەكەن بەكار لەناو خۆياندا گفتوگۆ لەسەر ئەوەى ئەكەن كە ئاخۆ شيخ مەحمود لەم كارە ئاگادار بكرێو بەشدار بكرێ يا نە ؟ ئەگەرچى لەسەر ئەم كيشەيە ناكۆك ئەبنو هەندێ مشتومريان ئەبێ، بەلاّم سەرەنجام هەمويان لەسەر ئەوە پيك دين كە شيخ مەحمود ئاگادار نەكەنو، خۆيانى لى دور بگرن، چونكە لايان وا ئەبێ كە شيخ مەحمود، توشى شەر بوە، لەلاى ئينگليز شكاوە. لە گفتوگۆكانى سليمانىدا، لەم روەوە رەمزى فەتاح وتويەتى: ((ئەم حەقە بە ميللەتى كورد دراوە. ئەگەر شيخ مەحمود خەطاى كردبێ ديسانەوە ميللەت قەباحەتى نيە. مەعلومى فەخامەتتانە خەطاى كەسيك حقوقى ميللەتيكى وا مەحو ناكاتەوە...)).

ئەم روداوە گۆرانيكى چۆنايەتى بو لە جولاّنەوەى نەتەوەيى كوردا. ئەوە يەكەمين جار بو:

١- لەباتى ئاريستۆكراتى لادێ (شيخى تەريقەتو سەرۆكى عەشيرەت) هەلبژاردەى شارى (ئەشراف، تيجار، رۆشنبير) سەركردايەتى بگرنە دەس.

٢- لەباتى ئەوەى پەنا بۆ شۆرشى چەكدار ببەن، ريگەى كارى سياسى (خۆپيشاندان، مانگرتن، نوسينى بەيانو مەزبەتە، گفتوگۆ) بگرن.

٣- لەباتى ئەوەى ناوچەى شاخاوى عاسى بكەن بە مەلبەندى جموجوڵ، شار (قوتابخانە، بازار، دائيرەكان) بكەن بە مەيدانى چالاكى.

لەو سەردەمەدا سياسييەكانى عەرەب لە عيراقدا ئەيان توانى حيزبى سياسى دابمەزرينن‌و، چەندين رۆژنامەى سياسى بە عەرەبى دەرئەچون، بەلاّم سياسيەكانى كورد لەم مافە بێ بەش بون، ريگە نەئەدران حيزبى سياسى دابمەزرينن‌و، رۆژنامەى سياسى دەربكەن.

## ٢-٢-١ ئەمير غازى لە كوردستان

بۆ هيمنكردنەوەى خەلكو دلنيا كردنيان لەوەى كە مافەكانيان پاريزراوەو، پەيمانى نوێى بريتانى - عيراقى قازانجى گەلى عيراق، لەناو ئەويشدا كوردى، تێ

---

روداوەكەى ٦ى ئەيلولى سليمانى كە بۆتە حاكم، ئەم ليكۆلينەوەى لەگەڵ هەندێ لە گيراوەكانى هەيئەت كردوە).

دایە، غازی کوری مەلیك فەیصەل، وەلیعەهدی عەرشی عیراق لە تەموزی ١٩٣٠دا سەردانی کوردستانی کرد.

بەرلەوەی ئەمیر غازی لەگەشتەکەیدا بگاتە سلیمانی، هەیئەتی وەطەنییە بەیانیکی حەماسی دەرکرد، لەم بەیانەدا خواستەکانی کوردی رون کردەوەو، داوای لە خەلك کرد بۆ پشتیوانی لەم خواستانە، خۆیان ئامادە بکەنو بۆ خۆپیشاندانیکی هیمنانە.

ئەمیر غازی لە گەشتەکەیدا گەیشتە سلیمانی. لەلایەن حکومەتەوە پیشوازی رەسمیی کرا. خەلکیش بە خۆپیشاندانیکی گەورەو هیمن لەبەردەمی سەرادا کۆبونەوەو پشتیوانییان لە خواستەکانی کورد کرد. بە نوینەرایەتی خەلك رەمزی فەتاحو تۆفیق قەزاز قسەیان کردو، داوایان لە ئەمیر غازی کرد کە داواکانیان بگەیەنێ بە دەسەلاتدارانی بەرز.

بیگومان غازی بەتەمای ئەمە نەبو. رۆژنامەکانی بەغداد بە نارەزاییەوە هەوالی ئەم پیشوازییەیان بلاوکردەوە.

## ٢-٢-٢ وەفدی وەزاری لە کوردستان

ئەنجومەنی وەزیران لە کۆبونەوەی ١٩٣٠/٨/٥دا بریاریدا وەفدیکی وەزاری، هاورێ لەگەڵ وەکیلی مەندوبی سامی، کاپتن هۆلت، بۆ گەشتیکی سیاسی رەوانەی کوردستان بکا، بەو هیوایەی ئەو ئالۆزییەی بەهۆی بەستنی پەیمانی بریتانی – عیراقیو فەرامۆش کردنی مافەکانی کوردەوە دروست بو بو، برەوینیتەوەو، زەمینەی هەلبژاردنی داهاتو خۆش بکەن.

وەفدە وەزرایەکە پیك هات بو لە: وەکیلی سەرۆکی وەزیران، جەعفەر عەسکەری. وەزیری عەدل، جەمال بابان. وەزیری کاروباری ناوخۆ، جەمیل مەدفەعی. وەکیلی مەندوبی سامی. لەو کاتەدا هیشتا نوری سەعید، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی عیراق، لە بریتانیا نەگەرابوەوە.

هەیئەتی وەطەنییە بەم بۆنەیەوە بەیانیکی حەماسی دەرکردو بۆ پشتیوانی لە خواستەکانیان داوایان لە خەلك کرد، لە رۆژی گەیشتنی وەفدەکەدا، بۆ خۆپیشاندانیکی هیمنانە خۆیان ساز بدەن.

لەسەرەتای ئابی ۱۹۳۰دا وەفدەکە چوە کەرکوكو هەولیر، ئینجا سلیمانی. لەهەر ۳ شار لەگەڵ پیاوە ناسراوەکانی کورد کۆبونەوە. وەکیلی سەرۆکی وەزیرانو وەکیلی مەندوبی سامی، هەر یەکەیان وتاریکی ئامادە کردبو، کە هەلویستی حکومەتەکانیانی دەرئەبری، لەم کۆبونەوانەدا خویندیانەوە.

جەعفەر عەسکەری لە وتارەکەیدا وتی:

((من بۆتان تەصریح دەکەم کە حکومەتی عیراق بە صورەتیکی ئەکیدە قەراری داوە کە بە نەظەری ئیعتیبار تەماشای ئەو وەعدانە بکات کە بۆ تەئمینی ئارەزوی برا کوردەکانمانی دابو لەوەش نەك تەنها هەتا سالی ۹۳۲ مەرعییەلئیجرا ئەبێ، بەڵام هەتا مابەعدی ئەو تاریخەش دەوام دەکات...

((لەعەینی زەمانا بە هەمو شیدەتیك بۆ مەحوکردنی هەمو جۆرە نەعرەیەکی کە ببیتە سەبەبی تەفرەقەو ئیخلالی وەحدەتی وەطەنییەی عیراق، یاخود ببیتە سەبەبی ئیخلال کردنی حقوقی دراوسییەتی لەگەڵ هەردو حکومەتی دۆستمان: ئیرانو تورك...))

وەکیلی مەندوبی سامیش لە وتارەکەیدا وتی:

((...قەت شتیکی وا نیە لە هیچ نوقطەیەکی عیراق، کە بلین حکومەتی عیراق یان حکومەتی بەریطانیا هەر یەکە بۆ خۆی تەعقیبی سیاسەتیك بکا، تازە ئەوا موعاهەدەیەك ئیمزا کراوە کە ئەم دو مەملەکەتە بۆ ۲۵ سالی تر لەگەڵ یەکتری بە تەحالوفیکی صەمیمی رەبط دەکات...

((...غایەی یەکەمینیان ئەوەیە کە تەئمینی تەئسیسی دەولەتیکی عیراق بکات کە ئازادو سەربەخۆ بیت... هەرچی حەرەکەتیك لەگەڵ ئەم سیاسەتە تەوافوق نەکات حکومەت بەباشی سەیری ناکات، وەکو جیابونەوەی کوردان.

((...سەیر دەکەم بەعضێ جیهاتی نامەسئول وای دەهیننە پیشەوە کە تەشجیع کردنی حەرەکەتی قەومییەی کوردی سیاسەتیکی قەطعیەی حکومەتی جەلالەتی مەلیکی بەریطانیایە، ئەمە نەك تەنها بۆ عیراق، بەلکو بۆ دراوسێو دۆستەکانی تری کە حکومەتی ئیرانو تورکیایە موجیبی ئیرتیباك دەبیت. هیچ شتیك نیە کە لەمە زیاتر لە حەقیقەت دور بیت...

((ئەوەی کە هەردو حکومەت: بەریطانیاو عیراق، حەز ئەکەن ببینن پیشکەوتنی صولحپەروەرانەی عیراقیکی یەکگرتوە، کە لەوێ هەمو ئەو عونصورە موختەلیفانەی ئەهالی تەشکیل دەکەن، غەرەضی زۆر موهیمیان ئەوە بێ کە ببن بە عیراقیکی چاك)).

بەم پییە هەلویستی بریتانیای لە کیشەی کورد رون کردەوە، کە: پشتیوانی لە خواستە نەتەوەییەکانی کورد بۆ دامەزراندنی دەولەتی کوردی ناکەن، بەلکو ئەیانەوێ کورد ببن بە ((عیراقیەکی چاك)).

لەهەر ٣ شار گفتوگۆی گەرمو توندو تیژ لە نیوان نوینەرانی کوردو وەفدی حکومەتدا کرا. نوینەرانی کورد بە راشکاوی ئەیانوت نایانەوێ لەگەڵ عەرەب پیکەوە بژین، بەلکو ئەمانیش ئەیانەوێ: حکومەتیکی کوردی سەربەخۆ، لەژیر ئینتیدابی دەولەتیکدا کە کۆمەلەی گەلان دیاری بکا، دابمەزرینرێ. بۆ ئەمەیش ئەو بەلینانەیان ئەکرد بە بیانو، کە کۆمەلەی گەلان کاتی خۆی بە کوردی دابو.

داواکەیان پیچەوانەی بۆچونی کاربەدەستانی عیراقو، لەگەڵ سیاسەتی بریتانیدا نە ئەگونجا، لەبەر ئەوەی ئومیدی جیبەجێ کردنیان لی نەئەکرا. وەفدی وەزاری گەرایەوە بەغداد بێ ئەوەی لەگەڵ سەرانی کورد گەیشتبیتە هیچ جۆرە لەیەك گەیشتنێ.

## ٢-٢-٣ ناردنی بروسکەو یادداشت

هەیئەتی وەطەنیە کەوتە جموجولیکی سیاسی فراوان: هاندانی سەرانی کورد بۆ ناردنی بروسکە، یادداشت، نامە.. بۆ کاربەدەستانی عیراق، بەریتانیاو، کۆمەلەی گەلانو، سازدانی خۆپیشاندانی جەماوەری فراوانو هیمنانە. سەرانی کورد ئومیدیکی زۆریان بە (عەدالەتی عەسبەتول ئومەم) هەبو. تەنانەت ئەو لافیتانەی لەکاتی خۆپیشاندانەکانی پیشوازی ئەمیر غازیو، وەفدی وەزاریو، رۆژی ٦ی ئەیلولدا بەرزیان کرد بوەوە، بریتی بو لە دو دروشمی سەرەکی: (رەوا بێ مەطالیبی میللەتی کورد)و (بەرقەرار بێ عەدالەتی عیصبەتول ئومەم).

لەناو ئەوانەدا کە بروسکەو یادداشتیان ناردوە بۆ کۆمەلەی گەلان: ئەشرافی سلیمانی، سەرانی عەشیرەتەکانی پشدەر، هەورامان، هەمەوەند، جاف، تەنانەت ژنانی سلیمانی‌یش لەم هەولە نیشتمانیە دوانەکەوتن، حەپسە خانی نەقیبو دەستە خوشکەکانی داوای مافەکانی کوردیان کرد.

لەو کاتەدا بریتانیا گەورەترین هیزی دنیاو بە دەسەلاتترین هیزی ناو کۆمەلەی گەلان بو، لە هەمان کاتدا مانداتۆری عیراقیش بو. نامەو یادداشتەکانی سەرانی کورد لە ریگەی ئەوانەوە ئەنیردرا بۆ کۆمەلەی گەلان. بریتانیا بریاری‌دا بو کە عیراق بە یەکگرتویی بمینیتەوەو بکریتە ئەندامی کۆمەلەی گەلان، لەبەر ئەوە نەك هەر

گوێی نەدایە خواستەکانی کورد، بەلکو لە راپۆرتەکانی‌دا لەسەر پیشکەوتنی عیراق کە پیشکەشی کۆمەلەی گەلانی ئەکرد، پاکانەی بۆ عیراق ئەکردسەبارەت بەو شکاتانەی لیی ئەکراو گەواهی درۆی بۆ ئەدا کە خواستەکانی کوردی بەجێ هیناوە، کۆمەلەی گەلانیش شایەتیەکانی دەولەتی مانداتۆری لەبەرچاو ئەگرت، لەبەر ئەوە گوێی نەدایە خواستەکانی کورد.

ئەحمەد موختار جاف، کە چەند جارێ لە مەجلیسی نوابدا، نائیبی هەلەبجە بوە، دیارە لە کەینوبەینی ژیر بەژیری کۆمەلەی گەلان ئاگادار بوە، بۆیە بێ مەلامەت نیە کە لە شیعرە بەناوبانگەکەی‌دا بە راشکاوی ئەلی:

ئەم قەراری عیسبەیە وا خەلق ئەلین بۆ کورد ئەبێ،
هەر قسەی روتەو، قسەیش ناچیتە ناو گیرفانەوە!
سەرەنجام پیشبینیەکەی ئەم هاتە دی.

## ٢-٢-٤ بادینان و خواستەکانی کورد

لەم جولانەوە سیاسیە فراوانەدا، بادینان بە هۆی هەلویستی سەلبیی: شیخ رەقیبی سورچی، فارس ئاغای زیباری، رەشید بەگی بەرواری، شیخ نوری بریفکانی و، چەند کەسیکی کەوە.. دابرابو، ئەمانە بە ئاشکرا پشتیوانییان لە حکومەتی عیراق کردو، دژی خواستەکانی کورد راوەستان و، نەریتیکی خائینانەیان بەرامبەر جولانەوەی نەتەوەیی کورد، بۆ کورو نەوەکانیان داهینا، تا سالانیکی دریژ لەسەری رۆیشتن و، هەر لە سۆنگەی ئەمانەوە:

یەکەم، ئەگەرچی حکومەتی عیراق لە ناوچە کوردنشینەکان‌دا، زمانی کوردی بە زمانی رەسمیی خویندن و دادگا و دائیرەکانی ناسی، لە بادینان ئەمە جیبەجێ نەکرا.

دوەم، ئەو پرۆژەیەش، کە کاربەدەستانی ئینگلیزی چەند جارێ بۆ کاربەدەستانی عیراقیان پیشنیار کرد دەربارەی ئەوەی، قەزا کوردیەکانی موسڵ، دهۆك، زاخۆ، ئامیدی و ئاکرێ، بکرین بە لیوایەکی سەربەخۆ، بە رەزامەندی ئەمان و، بەهۆی دەسەلاتدارەکانی موسلەوە، سەری نەگرت.

## ٢-٣ هەلبژاردنی ٩٣٠

وەزارەتەکەی نوری سەعید گوێی نەدایە نارەزایی کوردو نارەزایی عەرەب، سور بو لەسەر ئەنجامدانی هەلبژاردن و ئیمزاکردنی پەیمانی بریتانی – عیراقی. وەزارەتی داخلیە نوسی بۆ هەمو لیواکان کە دەس بکرێ بە بە هەلبژاردنی هەیئەتی تفتیش بۆ هەلبژاردنی نائیبەکان بە پەلە تا ئەتوانن.

## ٢-٣-١ شەری بەر دەرگی سەرا

تۆفیق وەهبی کە موتەصەرریفی سلیمانی بو لە سەرەتای مانگی ئەیلولدا کیشرایەوە بۆ بەغدادو لیخرا. ئەمە نارەزاییەکی زۆری لەناو دانیشتوانی سلیمانی و سەرانی ئیلەکاندا خولقاند. حکومەت لای وابو وەهبی بەگ یەکیکە لە هاندەرانی جموجولی سیاسی سلیمانی. لەو سەردەمەدا موفەتیشی ئیداری، کە ئینگلیز بو، لە هەمو لیواکانی عیراقدا خاوەن دەسەلات بون. موفەتیشی ئیداری سلیمانی، کابرایەك بو بە ناوی گاون، بەلام ئەمیش بە ئیجازەی ٦ مانگ سەفەری کرد بو. سلیمانی موتەصەرریفی نەبو، موفەتیشی ئیداریەکەیشی لە ئیجازە بو، کەسی یەکەمی خاوەن دەسەلات، وەکیلەکەی گاون، کابرایەکی ئینگلیز بو بەناوی ئەلبان. داوودەزگای بەریوەبەرایەتی سلیمانی رینوینی و فەرمانیان لە میستەر ئەلبان وەرئەگرت.

شەوی ٤ی ئەیلول هەیئەتی وەطەنیە لە مالی عەزمی بەگی بابان دانیشتن و بریاریاندا: لە هەلبژاردندا بەشداری نەکەن.

رۆژی پینج شەمە، ٤ی ئەیلول، فایەق بیکەس قوتابیەکانی زانستی لە گەرەکی صابونکەران هینایە خوارەوە. بە دەوری سەرادا دانیشتن، سرودی نیشتیمانییان ئەخویندو هوتافیان ئەکیشا، لەپر سەیارەکەی موفەتیشی ئیداری دەرکەوت دایانە بەر بەرد.

رۆژی شەمە، ٦ی ئەیلول، دانرا بو کە هەیئەتی تەفتیش، بۆ سەرپەرشتی هەلبژاردنی (منتخبە ثانویەکان) لە سەرای سلیمانی ئامادە بن. نزیکەی ٣٠ کەسیك لە سەرادا کۆبونەوە بۆ هەلبژاردنی نائیبەکان.

سەرانی هەیئەتی وەطەنیە لایەنگری توندو تیژی نەبون، هەر لەبەر ئەوە لەم خۆپیشاندانەدا بەشدار نەبون. ئەوەی هاندەری سەرەکی بوەو سەرکردایەتی کردوە، فایەق بیکەس بوە. فایەق بیکەس و، قوتابیەکانی زانستی لە بازار کەوتنە داخستنی دوکان بە خەلك. بەشی زۆری خەلك دوکانیان داخست و بەرەو بەردەرکی سەرا رۆیشتن.

لـه چايخانـەكاندا بـە گرامـەفۆن سـرودی نیشـتمانیی لی ئـەدرا. خـەلك زۆر كۆبونـەوە. هوتـاف و شـیعارات بـە دەنگـی بـەرز لـە دژی هـەلبژاردن ئـەدرا. وەكـو بەیانەكەی حكومەتیش ئەلیت ژمارەی خۆپیشاندەران زیادی گەیشتە ٢ تا ٣ هـەزار كەس. خۆپیشاندەران بەردەركی سەرایان گرت بو. ریگەیان لە هاتوچۆی ناو سەراو دەرەوەی ئەگرت. پۆلیس نەیتوانی بلاوەیان پێ بكاو ریگای هاتوچۆ بكاتەوە. لە نیوان پۆلیس و خەلكدا بو بە شەرە دارو بەردەفركێ. ئەم روداوە لە سەعات ١١ی پیش نیوەرۆ روی‌دا.

دەسەلاتداری یەكەمی حكومەت لە سلیمانی، وەكیلی موفەتیشی ئیداری ئەلبان، بو. داوا لە فەرماندەی جەیش كرا سریەیەك سەرباز بنیرێ، ئەویش بەشی نەكرد، داوای فەوجیكیان كرد. سەربازەكان لە حەوشی سەراو سەربان دامەزران و، بە مەترەلۆز (رەشاش) كەوتنە تەقە لە خۆپیشاندەران. چەند كەسێ كوژران (بەپێی بەیانی رەسمیی حكومەت...و، بەقسەی خەلك نزیكەی ٦٠ كەس كوژراوە)و چەند كەسێ بریندار بون و، ئەوانی تر بلاوەیان لی كرد.

هیزە چەكدارەكانی عیراق دەستیان گرتەوە بەسەر جادەكاندا. كوژراوەكان لە حەوشی سەرادا كەلەكە كران و، برینداره‌كانیش لەناو قاوشیكدا ریز كران و، كەوتنە راونان و گرتنی هاندەرو ریكخەرو بەشدارانی خۆپیشاندانەكە، تا دوسێ رۆژ هەر خەلك ئەگیران و پۆلیس و سەرباز شایەتییان لی ئەدان. ژمارەی گیراوەكان لە ١٠٠ كەس تێ پەری.[٣٠]

## ٢-٣-٢ ئەنجامدانی هەلبژاردن لە سلیمانی

كارەساتی بەردەركی سەرا، ئەگەرچی لە رۆژنامەكانی عیراق و، لە رۆژنامەكانی بریتانیاندا دەنگی دایەوە، بەلام كاربەدەستانی عیراق گوییان نەدایەو، بریاریاندا هەلبژاردنەكە بە ئەنجام بگەیەنن.

وەزارەتی كاروباری ناوخۆ لە رۆژی ٩٣٠/٩/٩ بە بروسكەیەكی نهینی داوای لە موتەصەرریفی سلیمانی كرد، بەهۆی ئەو روداوەوە، هەلبژاردن حەفتەیەك دوا

[٣٠] دەسخەتەكانی مامۆستا مستەفاو لولی ئەویش لە خوالیخوشبوان: رەمزی فەتاح، مامۆستا جەلال ئەمحەد، مامۆستا عومەر عەبدورەحیم، مەلا محەممەدی كوردی، مامۆستا ئەخولی شاعیر، وەری گرتون.

بخريت. بەڵام موتەصەرريفيەتی سليمانی، كە ئەلبان حوكمرانی بو، لە ١٩٣٠/٩/١١دا لە وەڵامدا پييان لەسەر ئەوە داگرت، كە ئەنجامدانی هەلبژاردن گرنگيەكی زۆی هەيە، لەبەر ئەوە نابێ دوا بخريت. وەزيری كاروباری ناوخۆيش لە ١٩٣٠/٩/١٤ بە نوسراويكی نهينی و پەلە پشتيوانی بريارەكەی موتەصەرريفەتی سليمانی سليمانی كرد.

رۆژی ١٩٣٠/٩/١٥ لە (مەقامی موتەصەرريفیدا عوموومی ئەشراف و توجارو سائيری طەبەقەی ئەهالی بۆ ئينتيخاباتی هەيئەتی تەفتيشيە كۆبونەوە)يان راستتر كۆكرانەوەو، هەلبژاردنيان پێ ئەنجام دان. كە كۆبونەوەی مەجليسی نواب لە رۆژی ١٩٣٠/١٠/١دا لە بەغداد كرايەوە بە نوينەرايەتی سليمانی ئەم نائيبانە: ئەحمەد صالح، ئەحمەد موختار، محەممەد صالح، سەيفوڵڵا خەندان، ئامادە بون.

## ٢-٣-٣ دانانی ئەحمەد بەگی تۆفيق بەگ

شوينی موتەصەرريف چۆڵ بو. لەناو رۆژنامەكانی بەغدادا ناوی چەند كەسايەتی كوردی لەوانە: محەممەد ئەمين زەكی، جەمال بابان و ئەحمەد بەگ، هينرايە ناو تا بكرينە موتەصەرريفی سليمانی سەرەنجام ئەحمەد بەگی تۆفيق بەگ دانرايەوە بە موتەصەرريفی سليمانی.

ئەحمەد بەگ، لە بنەماڵە ناسراوەكانی سليمانی و، خۆيشی پياويكی تيگەيشتوو بەريزی ناو خەلك بوە. ئەگەرچی ئەم يەكێ بۆ لەوانەی چون بەپير شيخ مەحمودەوە كاتێ لە ديلی گەرايەوەو، ماوەيەكيش هەر لە سليمانی بو، بەڵام لەسەردەمی حوكمرانی شيخ مەحمودا ئەم هيچ كاريكی پێ نەسپيردراوە. لە داگيركردنی دوەمی سليمانیدا ئەم رۆيشتە بەغدادو بو بە ئەندامی (مەجليسی تەئسيسيی عيراق) تا هيزەكانی عيراق و بريتانيا بۆ جاری سييەم سليمانييان بە يەكجاری داگيركردو، وەكو ليوايەك بەستيان بە عيراقەوە، ئەم كرا بە موتەصەرريفی سليمانی (١٩٢٤ – ١٩٢٧). ئەو ماوەيەی موتەصەرريف بو، بايەخيكی زۆریدا بە كاروباری خويندەواری، ئاوەدانی و رۆشنبيریو، يەكەمين (سەرۆكی جەمعييەتی

زانستی کوردان) بو. له ۱۹۲۷دا دەستی له کار هەلگرت، له جیگەی ئەم ئەحمەد عوسمان کرا به موتەصەرریفی سلیمانی.

لەکاتی گفتوگۆی عیراقی بریتانیدا بۆ بەستنی پەیمانی ۹۳۰ ئەمیش له بروسکەیەکدا که بۆ مەندوبی سامیو سەرۆکی وەزیرانی عیراقی نارد، پشتیوانی له خواستەکانی گەلەکەی کرد.

دوای شکانی شۆرشەکەی شیخ مەحمود که مەلیك فەیصەل هاتە سلیمانی، نیشانی (الرافدین)ی به خەلات کرد به بەرۆکی ئەحمەد بەگدا.

## ۲-۳-٤ وەفدی کوردستان

کوشتارەکەی بەردەرکی سەرا، ویژدانی شاعیرە گەورەو ناسراوەکانی ئەودەمی سلیمانییان هەژاندوە. پیرەمیرد، حەمدی، بیکەس، گۆران، ئەخۆل، شیعری بەسۆزیان لەسەر داناوە، له ویژدانی خەلکیشدا (شەشی رەشی ئەیلول) بوە به میژویەکی ناسراو، له دایك بونو مردنو، ژنهینانو شوکردنیان پیّ دیاری کردوە.

لەکاتی کوشتارەکەی ئەیلولدا مەلیك فەیصەل بۆ تیماری نەخۆشی، له لەندەن بو. دوای ئەوەی گەرایەوە بەغداد، بۆ نویّ کردنەوەی دلسۆزیو دەربرینی گویرایەلی، وەفدی شارەکانی کوردستان، که زۆربەی نائیبە کوردەکانی تیّدا بو، چون بۆ دیدەنی مەلیك. رۆژنامەکانی بەغداد ئەم هەوالەیان به خۆشیەوە بلاوکردەوە. پیرەمیر بەم بۆنەیەوە شیعرە بەناوبانگەکەی (وەفدی کوردستان)ی بەسەردا هەلداون، که پییان ئەلی: ((میللەت فرۆشان))و، نائیبە کوردەکان به ((هەرزە وەکیلی شاری خامۆشان)) ناو ئەبا بیکەسیش کردویەتی به پینج خشتەکیو ئیشارەت ئەکا بۆ بازرگانەکانو ئەلی: ((حاجی توتنەکەت مادەم فرۆشرا، قیروسیا له صەد کوشتنو هەرا)).

## بەلگەكانى:

### ٢-كوردو پەيماننانەى ١٩٣٠

**{} نامەى هەمفريس ( F. H. Humphrys )، مەندوبى سامى بريتانى لە عيراق بۆ لۆرد پاسفيلد ( Passfield )، سكرتيرى دەولەت بۆ كاروبارى كۆلۆنيەكان**

بارەگا، بەغداد

٢٣ى نيسانى ١٩٣٠

گەورەم

١- ئەز شەرەڤ ئەوەم هەيە كە گەورەييتان ئاگادر بكەم، لەوەتى من گەيشتومەتە عيراق بە ئاگاييەوە شكاتى بەردەوامى كوردەكانى عيراق، سەبارەت بەو بەلينانەى لە بابەت ئەو ئيمتيازاتە تايبەتييانەوە كە پييان دراوەو بە تەواوى جيبەجێ نەكراون، لەبەرچاو گرتوە.

٢- سەرەتاى ئەمسالْ مەليك فەيصەل پێى وتم حەز ئاكا كە هەمو پرسى كوردم بە تايبەتى لەگەڵ باس بكاو، لەسەر ئەوە ريك كەوتين هەرچى زوتر كە من كاتم هەبێ بۆ ئەوەى خۆم ئاگادار بكەم لە فاكتو بيرو بۆچونى ئەوانەى ئاگاداريى تايبەتييان هەيە

لەم بارەیەوە، ئەوسا پیکەوە دایئەنیین کە حکومەتی عیراق چ کاریّ بکا بۆ رازیکردنی کوردەکان.

دوای ئەوە بە ماوەیەکی کورت، لەسەر داوای مـن، سـیر کیناهـان کۆرنوالیـس (Sir Kinahan Cornwallis) موستەشـاری وەزارەتـی کاروبـاری نـاوخۆ، کەوتـە هەلسـەنگاندنی ئـەو بەلینانـەی بـە کوردەکـان دراون‌و رادەی جیبـەجیّ کردنیـان. هـەروەها لەگـەل موفەتیشـە ئیداریـەکانی ناوچـە کوردیـەکان‌و لەگـەلّ موفەتیشـی بـەریتانی پـەروەردەی گشـتی گـازاندەی کوردەکـانی بـە تـیروپری بـاس کـرد. ئـەم گفتوگۆیانە وایان لی کردوە بتوانیّ کە لەسەر هەمو مەسەلەکە تیبینییەکی گشتلایەنی ئامادە بکات‌و، راسپیری دیاریکراو بخاتە بەردەم حکومەتی عیراق.

٣- لەگـەلّ ئـەم نامەیـەدا کۆپییـەکی ئینگلـیزی ئـەو تیبینییـەی سـیر کیناهـان کۆرنوالیس بۆ وەزیری ناوخۆی نوسیوە، بۆ ئاگاداری گەورەییتان ئـەنیرم، کـە بـە رەئی من زۆر بە رونی هۆیەکانی شکاتەکانی کوردو ریگـەی چارەسـەرکردنی بـاس کردون.

سیر کیناهانم ئاگادار کـردەوە کـە مـن راسـپاردەکانی پەسـند ئەکـەم‌و نفـوزی خۆیشم لەگەلّ مەلیك‌و سەرۆکی وەزیران بەکار ئەهینم بۆ پشتیوانی لـە تەقەللاکانی بۆ قانیعکردنی حکومەتی عیراق کە پیرەوییان بکا.

٤- یەکەم بەری تیبینییـەکانی سـیر کیناهـان بـۆ وەزیرەکـەی بەیانیکـە، کۆپیـەکی پاشکۆی دوەمی ئەم نامەیەیە، کە لە ٩ی نیساندا لەلایەن حکومەتی نوری پاشاوە بە ریگەی هۆکانی راگەیاندنـەوە بلاّوی کردۆتـەوە. راگەیاندنی ئەم سیاسـەتە بـەجۆریّ کوردەکانی رازی کردوە کە لە ژمارەیەك تەلـەگرامی پیخۆشحالی‌و سوپاس‌دا دەریان بریوە کە تازە لە زۆر شوینی کوردستانەوە بـە مـن‌و سـەرۆکی وەزیـران گەیشـتوە. هەمفریس مەندوبی سامی لە عیراق*.

لـەم ماوەیـەدا لەگـەلّ موفەتیشـە ئیداریـەکانی لیواکـانی سـەرو خـەریکی تویژینـەوەی هەلومـەرجی کوردەکـان بـوم‌و، بەفـەرمانی خـاوەن شـکۆ مـەلیك لـەوەم کۆلییـەوە، کە ئاخۆ هیـچ راسـتیەك لـە قسـەی ئـەو کوردانـەدا هەیـە کـە ئـەلین ئـەو بەلینانەی دراویانەتیّ، بە باشی جیبەجیّ نەکراون.

---

١- * (FO371/14521).

## ٢- بەلینەکان ئەمانەی خوارەوەن:

(١). بەیانی سیر پیرسی کۆکس (Sir Percy Cox) لە لایەن راویژکارانی بریتانیەوە لە لیواکانی موسڵ، کەرکوك، سلیمانیدا لە ٦ی مەی ١٩٢١ بڵاوکراوەتەوە.

(٢). بەیانی ٢٤ی دیسەمبەری ١٩٢٢:

((حکومەتی خاوەن شکۆی بریتانیا و حکومەتی عیراق دان ئەنین بە مافی ئەو کوردانەدا کە لەناو سنوری عیراقدا ئەژین بۆ ئەوەی حکومەتیکی کوردی لەو سنورانەدا دابمەزرینن و هیوادارن کە تاقمە کوردیە جیاوازەکان، بە زوترین کات، لەناو خۆیاندا بگەنە ریککەوتنیك لەسەر شیوەی ئەو حکومەتەی خۆیان ئارەزوی ئەکەن و لەو سنورەدا کە ئەیانەوێ دریژ ببیتەوەو دەستەیەکی نوینەرایەتی بەرپرس بنیرن بۆ بەغداد بۆ باسی پیوەندیە سیاسی و ئابوریەکانیان لەگەڵ حکومەتی خاوەن شکۆی بریتانیا و حکومەتی عیراق)).

(٣). بریاری ئەنجومەنی وەزیران لە ١١ی جولای ١٩٢٣.

(١) حکومەتی عیراق بەتەما نیە هیچ فەرمانبەریکی عەرەب لەناوچە کوردیەکاندا دابمەزرینێ جگە لە فەرمانبەرانی تەکنیکی.

(٢) هەروەها بەتەما نیە دانیشتوانی ناوچە کوردیەکان ناچار بکا بە زمانی عەرەبی لە مراسلاتی رەسمییدا بەکار بهینن.

(٣) مافەکانی دانیشتوان و تاقمە دینیی و شارستانیەکان لە ناوچەی ناوبراودا بە تەواوی پاریزراوە.

(٤) تەلەگرامی سەرۆکی وەزیران بۆ موتەصەرریفی کەرکوك:

(أ) تکایە ئەنجومەنی بەریوەبەرایەتی ئاگادار بکە کە پیشنیارەکانیان پەسند کراوەو حکومەت موافیقە دامەزراندنەکان تەنیا لە خەلکی ناوچەکە بێ و زمانی ناوچەیی بە رەسمیی بناسێ.

(ب) ...ئەشێ ئەنجومەنی بەریوەبەرایەتی ئاگادار بکەی و بەلینی جیبەجێ کردنی ئەم مەرجانەیان بە شیوەیەکی رەسمیی بدەیتێ.

## ( ٥ ) وتاری سەرۆکی وەزیران لە ٢١ی جەنیوەری ١٩٢٦دا :

((... ئیمە ئەبێ مافی کوردەکان بدەین. فەرمانبەرەکانیان لە خۆیان بن، زمانەکەیان ئەبێ زمانی رەسمییان بێو منالەکانیان ئەبێ لە قوتابخانەکانیاندا زمانی خۆیان فیر بن، ئەوە ئیلتیزامە لەسەر ئیمە کە مافەکانی خۆیان بدەینێ)).

سەرۆکی وەزیران رینمایی‌دا بە هەمو وەزارەتەکانی:

((پایە بەرزتان بیگومان ئەو وتارەی دیوە کە سەرۆکی وەزیران لە مەجلیسی نوابدا داویتیو، رۆژی دوایی لە رۆژنامەکاندا بلاوکرایەوە. ئەم وتارە ئەو سیاسەتە دەرئەبرێ کە حکومەت ئەیگرێو لە بەریوەبەرایەتی ناوچە کوردیەکاندا پیرەوی ئەکرێ، بە دیاریکراوی کە فەرمانبەران ئەبێ کوردو زمانی رەسمی ئەبێ کوردی بێ. پایەبەرزی ئاگاداری کردم داوا لە پایەبەرزتان بکەم هەولی جیبەجێ کردنی ئەم سیاسەتە بدەنو لە هەمو دامەزراوەکانی ناوچەی باسکراودا جێبەجێی بکەن)).

## ( ٦ ) راسپاردەی کۆمەلەی نەتەوەکان :

((ئەبێ گوێ بدریتە ئەو ئارەزوانەی لەلایەن کوردەکانەوە دەربرراوە کە فەرمانبەرانی بە رەگەز کورد دابمەزرینرین بۆ بەریوەبەرایەتی ناوچەکەیان، رەوتی دادگاو فیرکردن لە قوتابخانەکانداو، کوردی ئەبێ ببێ بە زمانی رەسمیی هەمو ئەم خزمەتانە)).

٣.بەرەئی شەخسیی من، ئەو بەلینانەی کە گەورەترین گرنگییان هەیە، بەلینەکانی ژمارە ٣، ٤، ٥، ٦ن کە پیوەندیان هەیە لەگەڵ:

أ- فەرمانبەران.

ب- زمان.

ت- گفتوگۆی ناو دادگا.

پ- پەروەردە.

ئەو بەلینەی بە ئەنجومەنی بەریوەبەرایەتی کەرکوك دراوە نالەبارە چونکە زۆرایەتی دانیشتوانی ئەو ناوچانە کوردن، چونکە دوای ئەوەی بەلینەکە دراوە هەمو قەزا کوردیەکانی چەمچەماڵو گل لە لیوای سلیمانی کراونەتەوە. لەبەر ئەوە ئەو بەلینەی بە کورد دراوە تا رادەیەك ناکۆکە.

من پیشنیار ئەکەم کە هەر چوار بەلینەکە جێبەجێ بکرین، بەلام حەز ئەکەم لە پیشەوە رەئی خۆم رون بکەمەوە، حکومەتی عیراق بە چ گیانیکەوە لە پاشەرۆژدا کار لەگەڵ کورد ئەکا زۆر گرنگترە لە جیبەجێ کردنی حەرفیی هەر بەلینیکیان.

راست بێ یان درۆ، کوردەکان وا هەست ئەکەن مافەکانی خۆیان وەرنەگرتوە، بۆیە یەکێ لە گرنگترین ئەرکەکانی ئەمرۆی حکومەت ئەوەیە ئەم هەستە نەهێلێ و، هەستی متمانەو باوەریان تیدا بچێنێ. وەکو من هەولئەدەم پیشانی بدەم، ئەبێ لەچەند مەسەلەیەکدا گلەیی لە حکومەت بکرێ. نە لە پرسە گەورەکانی سیاسەتدا ئەوەندەی لە مەسەلەی کەمتر گرنگدا وەکو دامەزراندنی خراپ و ریکخستنی نالەبار. ئەگەرچی، سکالای بچوك هی گەورەتر لە میشکی خەلکدا دروست ئەکاو ۆر جاریش ئەبیتە هۆی تورەیی و نارەزایی.

یەکەمین ئەرکی حکومەت ئەوەیە لەم سکالایانە بکۆلیتەوەو بە گیانی بەزەییەوە چارەسەریان بکا.

فەرمانبەران

٥.ئەم ژمارانەی خوارەوە پیشانی ئەدەن چ فەرمانبەرێ دامەزینراون:

ک–کورد ت–تورکومان ع–عەرەب م–مسیحی ج–جو

| | نوسراو | | | | نەنوسراو | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هەموی | ک. | ت. | ع. | م و ج | ک. | ت. | ع. م. و ج |
| سلیمانی | ١٩ | ٨ | ١ | ٢ | ٩٠ | ١٤ | ١١ |
| ئەربیل | ١٨ | ٥ | ٤ | ١ | ٩٥ | ٢٣ | ٣٤ |
| کەرکوك | ١٦ | ١١ | ١٨ | ٢ | ٢٩ | ١٠٧ | ٤٠ |
| موسل و ( قەزا کوردیەکان ) | ١١ | ٣ | ١٤ | ٤ | ٤٦ | ٨ | ٤٣ |

٦.بە راشکاوی بلیین، دامەزراندنی ئەو هەمو نەکوردە شکاندنیکی ئاشکرای بەلینەکەیە. لە سلیمانی، بۆ نمونە، ٩٩٪ دانیشتوانی کوردن، کەچی ٣٠٪ فەرمانبەرەکانی نەکوردن. لەناوچە کوردیەکانی کەدا ژمارەکان بۆ خۆیان قسە ئەکەن.

هەروەکو ئەبینرێ ٣٢٤ فەرمانبەری کورد هەیە، ١٦٥ عەرەب، ١٨٠ تورکومان و ٦٢ مەسیحی و جو هەیە. ژمارەی فەرمانبەرانی نەکورد ٩٣ کەسی لە فەرمانبەرانی کورد زۆرترە.

ئەمەش نمونەیەکی رونی پشت گوێ خرانی رینماییەکانی حکومەتە، چونکە هیچ کەسێ بەتایبەتی بەرپرسی ئەوە نیە بزانێ بەلینەکە حەرفیی جیبەجێ کراوە. ئەم پشت گوێ خرانە هەلی باش ئەرەخسینێ بۆ رەخنەگرتن لەلایەن هەر یەکیکەوە کە بیەوێ بە خراپ لیکی بداتەوە. من پیم باشترە سەیری گیانەکەی بکرێ نەك زۆر بەجدی روکەشی شتەکە وەربگیرێ، چونکە لە زۆر حالەتدا نەکوردەکان یان کەرکوکین لە لیوای کەرکوکدا خزمەت ئەکەن یان دانیشتوی کۆنی لیواکەن خزمەت ئەکەن وایان لی هاتوە لە کوردەکان جیا نەکرینەوە. دائیرەکانی (بەتایبەتی تاپۆ، گومرگ و کشتوکاڵ)، زۆر کەم هەولیان داوە گوێ بدەنە بەلینەکەو کوردەکان بیگومان هۆیەکی راستەقینەیان هەیە بۆ سکالا لەمە، بەتایبەتی لە بواری وەزیفە نەتەکنیەکاندا. وا ئەزانم مەسەلەکە تا ئیستا بە ریگەیەکی راست رەفتاری لەگەڵ نەکراوە. کوردەکان بە توندی پێ دائەگرن لەسەر ئەو بەلینانەی پییان دراوە. عەرەبەکان بیزارن لەوە کە لیوا کوردییەکان بۆ کورد بهیلرینەوە (بە ناویش بێ، بەکردەوە وا نیە وەکو ژمارەکان دەری ئەخەن)، بەڵام ریگەیان لی ناگرن لەوەی خزمەت لە بەشەکانی تری وڵاتدا بکەن. زۆر باشتر ئەبێ ئەگەر زانینی زمان بکرێ بە پیوانەو ریگە بدرێ بە دامەزراندنی عەرەبی کوردیزان لە لیوا کوردیەکاندا و بە کوردی عەرەبیزان لە لیوا نەکوردیەکاندا. ئەمەش ناکرێ تا ئەو زەمانەی کورد گومان لە سیاسەتی حکومەتی ناوەندی ئەکات. لام وایە ئەگونجێ جیبەجێ بکرێ، ئەگەر یاسای زمان کە لە پەرەگرافی ٢دا باس کراوە تێ بپەرێ و پەلەپەل نەکرێ و بە هوشیاری دابمەزرینرین.

٧.دامەزراندنی فەرمانبەری کارامە گرنگیەکی گەورەی هەیە. رەنگە کوردەکانی لیوای هەولیر حالی حازر لە کوردی لیواکانی کە زیاتر بیزار بن. بە داخەوەم ئەوە بلیم کە بەو ئەنجامە گەیشتوم ئەمە بە زۆری ئەگەریتەوە بۆ ئەو سیاسەتەی مەجید بەگی موتەصەرریف، پیرەوی کردوە. ئەم فەرمانبەرە بەتوانایە بەڵام تورکومانەو خۆی وا پیشان داوە حەز لە چارەی کورد ناکا. نمونەیەکی بەدی داوە بە فەرمانبەرەکانی ترو بونی وەکو بۆچونیکی دژی کورد لە بەریوەبەرایەتیدا زیانبەخشە. ئەم لەماوەی ئاسایی خۆی زیاتر لە خزمەتدا لە هەولیر ماوەتەوە، لام وایە گویزانەوەی دەسبەجێی لە ناوچە کوردیەکان شتیکی پیویستە. ئەبێ فەرمانبەریکی کورد لە جیگەی ئەم دابنرێ کە حکومەت و هاوڵاتیەکانی متمانەی پێ بکەن.

٨.ئـەو کەمایەسـییەی پیویسـتی بـە چاککردنـەوە هەیـە لـە هـیزی پۆلیـس‌دا ئـەبینرێ کـە کـەمیی ئەفسـەری پۆلیسـی کارامـەو پشـکنەری کـوردە. لـە ئـەنجامدا دامـەزراندنی فەرمانبـەری عەرەبە، کە لـە هـەندێ حالـەتدا کوردی نـازانن‌و لـە ریگـەی تەرجومانەوە کار ئەکەن. ئەمە بە ئاشکرا هەلەیـەو ئـەبێ کارئاسـانی زۆرتـر بکـرێ بـۆ مەشق پـێ کردنـی پۆلیـس - کـورد بـن یـا عـەرەبی کوردیـزان - بـۆ ئـەوەی بـبن بـە پشکنەرو ئەفسەری نوسراو.

٩.لام وایـە هـەر بـە تـەنیا بـۆ وەزارەتـی نـاوخۆ یارمـەتیدەر نیـە، بـەلکو بـۆ کوردەکـانیش مایـەی شـادمانی ئـەبێ، ئەگـەر یارمـەتیدەریکی کـورد بـۆ بەریوەبـەری گشـتی بەریوەبەرایـەتی لـە وەزارەتدا دابـنرێ. ئـەم فەرمانبـەرە لـە پلـەی یەکـەمدا خەریکی ئەو نامەکارییانە ئـەبێ لە لیوا کوردیەکانـەوە دیـن لـەژیر فـەرمانی کـارگیری گشتی بەریوەبەرایەتی‌دا. ئەم دامەزراندنە خـەرجیکی زیـادەی ئـەبێ، بـەلام دلنیـام کـە ئەمە تبریر ئەکرێ بە هەستی رەزامەندی کە کەسیکی بە ئاگاداریـەکی زۆرەوە لەسـەر لیوا کوردیەکان لە وەزارەتدا هەیە.

١٠.کوردەکان هەستیان کردوە بەوەی کە بە ئـەندازەی کـافی لـە دەزگـا بـەرزەکانی پایتەخت‌دا نوینەرایەتی ناکرین. دیارە ئەم هەستە لەناو کەنارو شوینەکانی تریش‌دا هەیە، بەلام من لام وایـە کـە ئـەبێ سـەرنجی تایبـەت بـدرێ بـە ژمـارەو گرنگـی سیاسـی کوردەکـان‌و هـەولٚ بـدرێ رازی بکریـن، ئەگـەر کەسـانی کارامـە هـەبون شـوینە بۆشەکانیان پێ پر بکریتەوە.

١١.مەسەلەی زمان شتیکە کوردەکان لە بارەیـەوە زۆر بـە پـەژارەن. بەلینـەکان بـە تەواوی رونن‌و من لام وایە نابێ کات بە فیرۆ بدرێ بۆ تیپەراندنی قانونیك کە کوردی بکا بە زمانی رەسمیی لە بەریوەبەرایـەتی سلیمانی‌و هـەولیرو لـەو قەزایانـەی لیـوای موسلٚ‌دا، کە زۆرایەتی دانیشتوانی کوردن‌و، داننان بە کوردی‌دا وەکو یەکێ لـە زمانـە رەسمییـەکانی لیـوای کـەرکوك. دوای تیپـەراندنی قانونەکـە، زانیـنی زمانەکـە نـەك رەگەز، وەکو لەسەرەوە پیشنیارم کردوە، بکـرێ بـە مـەرجێ دامـەزراندنی فەرمانبـەران لە ناوچە کوردیەکان‌دا.

١٢.تـا ئیسـتا هـەندێ لـە دائیرەکـان فەرامۆشـکار بـون لـە جیبـەجیکردنی بـەلینی زمان‌داو، زەمینـەی راسـتەقینەی سکالاکان ئـەو راسـتیەیە میکـانیزمیکی کـافی نیـە بـۆ تەرجومەی قانونەکانی ولات‌و زۆر لە نیزامـەکانی-دارایی‌و هـی تـر-کـە بـەردەوام دەر ئەچن. قانونە بنەرەتیەکان وەکو قانونی سزادانی بەغدادی هیشتا تەرجومە نەکراون‌و

له هەولیر، بۆ نمونه، نەك هەر زمانی دادگا عەرەبیە بەلکو ئیجرائاتو حوکمدانیش به عەرەبی تۆمار ئەکرین. قانون، نیزامو نامەکاری بەریوەبەرایەتیە گشتیەکان بۆ لیوا کوردیەکان بە عەرەبیەو ئەبێ مودیری تەحریرات وەر بگیرێ. ئەمەش شتیکی ئابوری نیە چونکە فەرمانبەرانی چوار لیوا ئەبێ خەریکی تەرجومەی هەمان شت بن. ئەمەش بۆ هەموان شتیکی نارەوایە چونکە تەرجومەکان وەك یەك نابن. تەرجومەی دروستی بەلگەی قانونی پیویستی بە وریایی و شارەزایی هەیە. بەلگەی لەو بابەتە ناتوانرێ بە باشی تەرجومە بکرێ لەلایەن کەسانی لینەهاتوەوە کە لە هەمان کاتدا بە کاری بەریوەبەرایەتیەوە سەرقالەو، زۆر جار لەوانەیە بە تەرجومە نەکراوی بمینیتەوە. ئەنجامەکەیشی ئەوەیە فەرمانبەرانی عەرەبی نەزان ناتوانن کارەکانیان بە دروستی ئەنجام بدەن و خەلکەکەیش بێ بەش ئەکرین لەو مافە بنچینەییەی کە ئەبێ باج بدەن و حوکم بکرین بەپێی قانونگەلی کە بە زمانی خۆیان نوسرا بێ. لام وایە کە ئەبێ مەکتەبیکی تەرجومەی لیهاتو دابنرێ، باشترە لەم وەزارەتەدا بێ، بۆ تەرجومەکردنی قانونەکانو، ئەو بەلگانەی کە وەزارەت بە پیویستیان ئەزانێ بە کوردی و بلاوکردنەوەیان لە جەریدەی رەسمییدا. هەروەها لام وایە ئەبێ رەوتی دادگاکانو حوکمدان لە دادگاکاندا بە کوردی تۆمار بکرین.

## پەروەرە

١٣.سکالاکانی کورد لە سیاسەتی پەروەردەیی حکومەت زۆرن. هەندیکیان رەوانو ئەوانی تریان، من لام وایە، زل کراون. کاریکی زەحمەتە بۆ حکومەتیك کە پارەی نەبێ، هەمو شتێ بە جاریك بکا، لەم مەسەلەیەدا کیشەکە ئالۆزە سەبارەت بەو راستیەی کە تازە کوردی بۆتە زمانی نوسین لەبەر ئەوە مامۆستای لیهاتو کەمن.

بە رەئی من دو کەمایەسیی سەرەکی هەن. یەکەمیان ئەوەیە، ئیستا ناتوانرێ منالانی کورد لە لیوا کوردیەکاندا بە باشی پەروەردە بکرین، چونکە هیچ فیرگەیەکی ناوەندی تەواوی لێ نیە، دوەمیشیان ئەوەیە، ناوچەیەکی پەروەردەی کوردی نیە. هەولیر لەسەر ناوچەی موسلّو سلیمانی و کەرکویش لەلایەن کاربەدەستانی ناوچەی پەروەردەی بەغدادەوە بەریوە ئەبرین. سکالام بیستوە کە سیاسەتی پەروەردەیی کە لەلایەن فەرمانبەرانی ناوچەیی بەرپرسەوە پیرەوی کراوە بەپێی بەلینەکان نیە. ئەمە ئەگەر وابێ یا نە ، من لام وایە، ناوچەیەکی پەروەردەیی لە هەولیرو کەرکوكو

سلیمانی، بەبێ دواخستن، لەژێر سەرپەرشتی کوردیکی لیهاتودا، دابمەزرێنرێ. هەروەها لام وایە، کە کۆرسی تەواوی فیرگە ئامادەییەکان لە قوتابخانە ناوەندیەکانی هەولیرو سلیمانیدا بوتریتەوەو، ئەگەر پارە پەیدا کرا زۆرتر فیرگەی سەرەتایی بکریتەوە. ئەگەر ناوچەی پەروەردەیی کوردی دامەزرینرا ئەوسا فەرمانبەرانی کوردی کاربەدەست روبەروی رەخنەی کوردەکان ئەبنەوەو، کەمتر بیانویان بە دەستەوە ئەبێ بۆ ئەوەی، کەمتەرخەمی بەریوەبەرایەتی، کە وەکو لەسەرەوە من رونم کردەوە، کە بە زۆری ئەگەریتەوە بۆ نەبونی پارە، بە هەولی ئەنقەستی حکومەت بۆ پشت گوێ خستنی بەلینەکان، لیك بدریتەوە.

١٤.لام وایە گرنگیەکی زیاد لە پیویست دراوە بە هۆیەکانی فیرکردن لە قوتابخانە کوردیەکاندا. ئەوە ئاشکرایە کە کوردەکان مافی ئەوەیان هەیە فیرکردنی سەرەتایی بە کوردی بێ، بەلام من باوەرم وایە کە ئەگەر قانونی زمان دەربچێ و، کوردەکان باوەر بینن بەوەی کە بیری نەهیشتنی ناسنامەی نەتەوەیی لە کایەدا نیە، ئەوسا خۆیان داوا ئەکەن هۆکانی فیرکردن لە هەندێ بابەتی گرانتردا، لە ئاستی بەرزتری خویندندا، بە زمانی عەرەبی بێ. لەگەڵ کرانەوەی پیوەندیدا، لیوا کوردیەکان چیتر دانابرین، لاوانی کورد لەوە تێ ئەگەن، کە بێ زانینی عەرەبی، ناتوانن لە ژیانی نیشتمانیدا بەشداری بکەن. ئەمە مەسەلەیەکە لەم رەوتەدا خۆی لە خۆیدا بەلادا ئەکەوێو شتیکی چەوتە ئەگەر تیکەڵ بکرێ بە کیشەی نەتەوایەتی.

## ١٥. کورتە راسپیریەکانم ئەمانەن:

**فەرمانبەران**

١- هەر کە قانونی زمان دەرچو، زانینی زمانی کوردی، نەك رەگەز، بکرێ بە پیوانەی دامەزراندن.

٢- لە هەمان کاتدا ئەبێ داوا لە هەمو دائیرەکان بکرێ بایەخی زۆرتر بدەن بە دامەزراندنی موچەخۆری کورد.

٣- موتەصەرریفی هەولیر بگویزریتەوەو کوردیکی کارامە لە جیگەی ئەو دابنرێ.

٤- ئەبێ کارئاسانی زۆرتر بۆ پۆلیس بکرێ کە مەشق بە ژمارەیەکی زۆرتری فەرمانبەرو پشکنەری کوردیزان بکا.

٥- یارمەتیدەریکی کورد بۆ کارگیری گشتی بەریوەبەرایەتی لە وەزارەتدا دابنرێ.

٦- توانای دۆزینەوەی کوردی گونجاو بۆ هەندێ لە وەزیفە بەرزی دائیرەکانی بەغداد تاقی بکریتەوە.

زمان و کاروباری دادگا

٧- ئەو قانونەی کە ئەبێ دەربچێ کوردی ئەکا بە زمانی رەسمیی لە سلیمانی، هەولیرو قەزاکانی لیوای موسڵ کە زۆرایەتی دانیشتوانیان کوردن و دان ئەنێ بە کوردیدا وەکو یەکێ لە زمانە رەسمیەکانی کەرکوك.

٨- مەکتەبیکی تەرجومە لە بەغداد دابمەزرینرێ.

٩- ریوشوینی بەریوەچون و دادگایی لە دادگاکاندا بە کوردی تۆمار بکرێ.

پەروەردە

١٠- بۆ مەبەستی پەروەردە لیواکانی هەولیر، کەرکوك و سلیمانی لە ((مەنتیقەیەك))دا ریك ئەخرین لەژیر بەریوەبەرایەتی کوردیکی کارامەدا.

١١- فیرگەی ناوەندی تەواو لە هەولیرو سلیمانی هەبن و ژمارەی فیرگەی سەرەتایی، ئەوەندەی بودجە ریگە ئەدا، زۆرتر بکرین.

راسپیری دی

١٢- دانانی رەمزیکی کوردی لەناو بەیداخی عیراقدا بە راکیشانی عاتیفی کوردەکان دائەنرێ.

١٦. پایەبەرزتان ئەبینن من لە راسپیریەکانمدا خواستەکانی کوردە نەتەوەییەکانم فەرامۆش کردوە بۆ دریژکردنەوەی ناوچە کوردیەکان بۆ لیواکانی دیالەو کوت و، بۆ هەر گۆرینیکی کە ببێ بە هۆی جیابونەوەی لیوا کوردیەکان لە مەملەکەتی عیراق. من ئەو جۆرە خواستانە بە باشترین قازانجی کورد خۆیان یا بە هی عیراق دانانیم. راسپیریەکانی من تیری نەتەوەییە خوین گەرمەکان ناکا، کە لایەنی هەرە کەمی داواکانیان فراوانکردنی ناوچەی پەروەردەیی کوردی و دروستکردنی

لیوای دهۆکه. دەرگا با کراوە بێ بۆ فراوانکردنی ژیرانەی لەم بابەتە، بەڵام من لام وایە ئەبێ داخراو بێ لە روی هەر شتێکدا کە دژی یەکیتی عیراق بێ.

ئەوەی من بە شیوەیەکی سەرەکی داوای ئەکەم هاودەردیە لەگەڵ سکاڵا رەواکانی کوردا. بیستومە وتویانە مەسەلەی کورد نیە. لام وایە ئەمە لە راستیەوە دورە. کوردەکان نارەحەتن و گومانیان هەیەو لیشاویکی زۆری پروپاگەندەی زیانبەخش هەیە بەتایبەتی لە بەغدادەوە، ئەگەر ریگە بەمە بدرێ بەبێ لیپرسینەوە بەردەوام بێ و، ئەگەر هیچ نەکرێ بۆ چارەسەکردنی گازاندە راستەکان و چاندنی هەستی متمانە، دلنیام لەوێ کیشە پەیدا ئەبێ. نەك هەر بەتەنیا کیشە پەیدا ئەبێ، بەلکو خواستی کوردەکانیش لەگەلی زیاد ئەکا، هەتا ئەگاتە ئەوەی حکومەت ناچار بێ بەهیز روبەروی راوەستێ یان خواستەکانیان قوبوڵ بکا، کە هیچ هیوایەکی تیدا نابینرێ بۆ ئارامیی پاشەرۆژی.

هەلەیەکی گەورە ئەبێ ئەگەر حکومەت بە تەنیا بە تەمای جیبەجێ کردنی حەرفیی بەلینەکان بێ. ئامانجی ئەوان ئەوەیە کورد تیکەلی میللەتی عیراق بکەن، لەبەر ئەوە گیانەکەی لە جیبەجێ کردنی حەرفییان گرنگترە. باوەرم وایە، ئەگەر حکومەت بە بیریکی فراوان و بە هاودەردیەوە رەفتار لەگەڵ مەسەلەکە بکا، ئەتوانێ بناغەی هەندێ شتی هەمیشەیی لەماوەی دو سالی داهاتودا دابنێ.

گیروگرفتەکە یەکیکە لە گرنگترین و بە پەلەترینی ئەو گیروگرفتانەی کە ئەبێ حکومەت روبەروی ببیتەوەو، هیوادارم پایەبەرزتان بەمزوانە بیخاتە بەردەم وەزارەت.

موستەشار (FO371/14521)

# پاشکۆکان

١. بەیانیك دانیشتوانی قەزا کوردیەکانی موسڵو لیواکانی هەولیر، کەرکوك و سلیمانی پیشان ئەدا.

٢. سەرژمیری فەرمانبەران بەپێی رەگەز. (FO371/14521)

RACIAL STATISTICS FOR KURDISH AREAS ACCORDING TO LATEST FIGURES (FEBRUARY 1930).

| Liwa | Kurds | Arabs | Turcomans | Jews | Christians | Persians | Assyrians | T al |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| Arbil Liwa | 83,430 | 4,492 | 9,921 | 3,225 | 2,689 | 287 | 2,090 | ,13 |
| Kirkuk Liwa | 67,703 | 26,561 | 28,741 | 8,472 | 1,228 | - | - | ,70 |

Mosul Liwa :

(Kurdish Qadhas):

| Name of Qadha | Arabs | Kurds | Yezidi | Assyrians | Xtians of all creeds | Jews | Total | mar |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| Zakho | 198 | 18,731 | 500 | 340 | 5,614 | 1,471 | 26,854 | |
| Amadiya | - | 20,914 | - | 3,416 | 5,882 | 732 | 27,944 | |
| Zibar | - | 9,900 | - | 800 | 150 | 100 | 10,950 | |
| Aqra | - | 12,675 | - | 400 | 737 | 1,000 | 14,812 | |
| Dohuk | 5,645 | 16,645 | 1,692 | 4,536 | 2,388 | 843 | 31,753 | |
| | 5,847 | 78,865 | 2,192 | 9,492 | 11,771 | 4,146 | 112,313 | |

Sulaimani Liwa :

| | Kurds | Arabs | Turcomans | Jews | Christians | Persians | Assyrians | T al |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| Sulaimani Liwa | 91,426 | 37 | - | 1,327 | 148 | - | - | 938 |

Percentage of Kurds :

Arbil Liwa________________: 78,6

Kirkuk Liwa______________________: 49,5

Mosul Liwa (Kurdish Qadhas): 70

Sulaimani Liwa____________________: 99

OFFICIALS EMPLOYED IN ARBIL, KIRKUK & SULAIMANI LIWAS

AND IN THE KURDISH AREAS OF THE MOSUL LIWA.

(i) showing Kurds and others by departments

| Government department | Gazetted | Officials | Non-Gazetted | Officials | Total No. | Officials | Remarks |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | Kurds | Others | Kurds | Others | Kurds | x others | x Arabs are shown brackets after the total figu |
| Administration (Genral) | 43 | 25 | 61 | 49 | 104 | 74 (24) | From these final lis will be seen that out of a t number of |
| Agriculture | - | 3 | 4 | 18 | 4 | 21 (17) | 731 officials emplo in the |
| Awcaf | 4 | 2 | 3 | 2 | 7 | 4 (1) | northern Liwas (in case of |
| Census | - | 1 | 2 | 3 | 2 | 4 (2) | Mosul, statistics h only been |
| Customs | 2 | 7 | 5 | 20 | 7 | 27 (11) | given for the Kurd areas), |

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| Education | 1 | 2 | 79 | 101 | 80 | 103 (31) | there are 324 K and 407 |
| Finance | 1 | 2 | 52 | 39 | 53 | 41 (9) | Officials who are Kurds. Even |
| Health | - | 8 | 6 | 15 | 6 | 23 (9) | Allowing for Kirkuk promise |
| Jails | - | 1 | - | 1 | - | 2 (1) | there are still Arabs |
| Law courts | 9 | 7 | 16 | 9 | 25 | 16 (6) | Employed in the No If again |
| Police | 3 | 9 | 11 | 36 | 14 | 45 (27) | the statistics for Kirkuk Liwa |
| Posts and tels | 1 | - | 7 | 11 | 8 | 11 (6) | are excluded , it wil found that out of a t number of 502 |
| Public works | - | 1 | 4 | 17 | 4 | 18 (9) | Officials employed the other Kurdish areas, t are 279 |
| Surevys | - | - | - | - | - | - | Kurds, 107 Arabs, Turcomans |
| Tapu | - | 5 | 7 | 7 | 7 | 12 (8) | and 54 Christians, J etc. |
| Veterinary | - | 1 | 3 | 5 | 3 | 6 (4) | From the departn statistics it |
| Total | 64 | 74 | 260 | 333 | 324 | 407 (165) | will also be seen t the following departme |
| | 138 | | 593 | 731 | | (16 5) | have paid least regard the literal fulfilment of pledge. |

## {} نامەی هەمفریس ( F. H. Humphrys )، مەندوبی سامی بریتانی لە عیراق بۆ نوری سەعید، سەرۆکی وەزیرانی عیراق.

بۆ نوری سەعید، سەرۆکی وەزیرانی عیراق
بارەگا
بەغداد، ٧ی مارتی ١٩٣١

نیشانە بە نامەی پایەبەرزتان ژمارە ٦٤٦ی رۆژی ١٦ی شوباتو ژمارە ٨١١ی ٤/٥ی مارت، دەربارەی سیاسەتی کوردیی حکومەتی عیراق.

٢.پایەبەرزتان لە بیریتی، دەربارەی نامەی رۆژی ١٨ی شوبات، من وتم کە پیشنیار ناکەم هیچ کارێ لەسەر نامەی یەکەم، کە نیشانەی پێ دراوە، بکرێ تا کیشەی قانونی زمانە ناوچەییەکان بەلادا ئەخرێ. ئیستا حەز ئەکەم بە درێژی وەڵامی نامەی یەکەمی پایەبەرزتانو، خاڵەکانی نامەی ٤/٥ی مارتتان بدەمەوە. پایەبەرزتان ئەلین حەپەساون لە داوای بێ برانەوەی موستەشاری وەزارەتی ناوخۆ کە پەیتا پەیتا ئەیخاتە بەردەمتانو، لە ئەنجامی ئەوەدا گومانتان پەیدا کردوە لە بزوینەرو هۆی راستەقینەی ئەم داوایانە. پایەبەرزتان درێژەی ئەدەنێ کە ئەگەر هیچ مەبەستیکی سیاسی لە دواوە نەبێ، ئەبو ئەم داوایانە لە ناوچە کوردیەکاندا قەتیس بکرین بێ ئەوەی توخنی ریکخستنی حکومەت بکەوێ، بۆ نمونە، دروستکردنی هەندێ وەزیفەی دیاریکراو لە پایتەختدا. پایەبەرزتان داوا ئەکەن سنورێ دابنرێ بۆ ئەو داوایانەی کە موستەشار بەناوی ((رازی کردنی کوردەکان))ەوە ئەیخاتە بەردەم وەزیری ناوخۆ، یان ئەم داوایانە سنوردار بنو قەتیس بکرین لە ناوچە کوردیەکادا بێ ئەوەی توخنی ریکخستنی دەولەت بکەوێ.

حەزئەکەم ئەوە بە تەواوی رون بکەمەوە بۆ پایەبەرزتان کە من نیازم نیە دەس بخەمە ئازادی کاری موستەشاری وەزارەتی ناوخۆوە سەبارەت بەو پیشنیارانەی کە ئەو پێی وایە گونجاون یا هیچ بابەتیکی تر. پایەبەرزتان ئەزانن، هەروەکو منیش لە ئامۆژگاری کردندا ئەیکەم، ئەوە ئیشی خۆیەتی بیکا وەکو خزمەتکاری حکومەتی عیراق، ئەوەی پالی بە موستەشارەوە ناوە تەنیا ئارەزوی یارمەتیدانی حکومەتی عیراقە لە کارگیری گشتی بەریوەبەرایەتیداو، بەدەستهینانی پایەی دەولەتیکی بە تەواوی خۆ حوکم کردوی ئەندامی کۆمەلەی نەتەوەکانە.

لەبابەت ئەو ئامۆژگارییانەی ناو بە ناو لەلایەن سیر کیناهان کۆرنوالیسەوە دراون بە وەزیری ناوخۆ، پیویستە من دلنیاتان بکەم کە بە گەرمی پشتیوانییان

ئەکـەم چونکـە بـاوەرم وایـە ئـەو لـە یـەك نەگەیشـتنەی کـە لـە نیـوان کوردەکـان و حاکمەکانیاندا دروست بوە ناهیلیّ و، چەرخی بەریوەبەرایەتی چەور ئەکاو، کەشیکی برایەتی و نیازپاکی ئەخولقینیّ، کە پیویستن بۆ ئاشتی و حکومەتی باش لە ولاّتدا.

باوەرم وایـە ئـەو ئامۆژگاریـەی هەمیشـە بە پایەبەرزتان ئـەگا بـە شـایانی بایـەخ پـیّدانیکی جـددی وەرئـەگیریّ و، نـارەزایی و پشـیوی لەناوچـە کوردیـەکاندا، کـە لـە چـەند مـانگی رابوردودا پەژارەیـەکی ناخۆشـی بـۆ مـن دروسـت کـردوە، بـە جیبـەجیّ کردنی ئەو پیشنیارانە نامینیّ.

پیویست ناکا پایەبەرزتان هیچ ترسیکی هـەبیّ لـەوەی کە ئـەم پیشـنیارانە هیچ مەبەستیکی تری هەبیّ جگە لە بەهیزکردنی ماکینەی دەولەت و، دەنگیکی بە بەزەییتر لە بەرەیوەبەرایەتی کوردستاندا.

مـن هەسـت ئەکـەم دلنیـام، لـە هەلسـەنگاندنەوەکەتاندا، پایەبـەرزتان ئـەوە ئەسـەلمینن کـە پیشـنیارەکانی موستەشـار بـۆ وەزارەتـی نـاوخۆ، یـان هـی هـەر موستەشاریکی تر، کە بزوینەری سیاسی هەبیّ، بیّ بناغەیە.

٣.من بە تەلەگرام ئاگاداری حکومەتی خاوەن شکۆی بریتانیام کرد لەو وەلاّمەی لەلایەن وەزیری دەرەوە نیردراوە بۆ تەلەگرامی وەزیری عیراقی لە ئەنقـەرە، کـە تییـدا راپۆرتـی دابـو کـە حکومەتـەکانی تورکیـا و ئـیران پیشـنیاریان کـردوە پرۆتیسـتیکی هاوبەش بدەن لە کۆمەلەی نەتەوەکان دژی راسپیرییەکانی لیژنەی ئینتیداب. منیـان راسپاردوە کـە بـۆ پایەبـەرزتانی رون بکەمـەوە، ئەگـەر هـەر کـاریّ بـە ئاشـکرا لەگـەلّ پرۆتیسـتی پیشـنیارکراوی ئـیران و تورکیـا بکـا، بەمـە حکومـەتی عـیراق راسـتەوخۆ سوکایەتی بە دەسەلاّتی کۆمەلەی نەتەوەکان ئەکا. کاریکی وەها لە هەمو حالـەتیکدا، هـەر ئەبیتـە هـۆی شـیواندنیکی لـە چـاککردن نـەهاتوی وینـەی داهـاتوی عـیراق، بلاّوبونـەوەی راپۆرتەکـە لـە دەرەوەی کۆرەکـانی کۆمەلـەدا، کـەوا حکومـەتی عـیراق پشتیوانی یا تەنانەت تعاطفی لەگەلّ ئەم پرۆتیسـتەدا دەربریـوە، کاردانەوەیـەکی زۆر بەهیزی ئەبیّ و، حکومەتی خاوەن شکۆی بریتانیا ئەوسا بە مـەحالی ئـەزانیّ داکۆکـی لـە سیاسـەتی کوردیی عیراق بکا کە دائەنریّ بە نادلسـۆزو، دائەنریّ بـەوەی لـەژیر گوشاری ولاّتانی بیگانەدا داریژراوە. بە رەئی حکومەتی خاوەن شکۆ، لـەو حالـەتـەدا، هیوای چونی عیراق بۆ ناو کۆمەلەی نەتەوەکان بە تەواوی نامینیّ.

پایەبەرزتان ئەبینیّ کە حکومەتی خاوەن شکۆ هاوبیر نیە لەگەلّ ئەو وەلاّمەی کە بەپیّی رینوینیەکانی پایەبەرزتان نیردراوە بۆ وەزیری عیراقی لـە ئەنقـەرە، کـە هیچـی تـازەی تـیّدا نیـە، بەلاّم وا ئەگەیـەنیّ کـە حکومـەتی عیراق ئەیـەویّ بەشـداربیّ لەگـەلّ

حکومەتەکانی تورکیاو ئیران، لە پرۆتیستی پیشنیارکراودا. پیشنیار ئەکەم بۆ پایەبەرزتان ئیستا ئەوە بۆ وەزیری عیراق لە ئەنقەرە رون بکەنەوە کە حکومەتی عیراق نیازی شتی وای نەبوە. (FO371/15311)

## {} دانیشتنی ٢٦ەمی رۆژی پینجشەمەی ١٩٣٠/٢/١٣ی کۆبونەوەی ئاسایی سالانی ١٩٢٩ - ١٩٣٠، بە سەرۆکایەتی تۆفیق السویدی.

سەرۆك: مادەی دوەمی بەرنامەکە بە وەزیری لیپرسراو رائەگەیەنریّ.

پرسیاری مەعروف جیاوك (هەولیر) ئاراستەی سەرۆکی وەزیران کراوە دەربارەی ئەو بنچینانەی حکومەتی عیراق داینـاون بۆ ئەو گفتوگۆیەی ئەویستریّ بکریّ بۆ بەستنی پەیمانە تازەکەو، ئەو مەرجانە کۆمەلەی گەلان دانی پیّدا نابون دەربارەی ناوچەکانی سەرو. پرسیارەکە خویندرایەوە، ئەمیش دەقەکەیەتی: تکام وایە ئەم پرسیارانە لە سەرۆکی وەزیران بکریّ، بۆ ئەوەی بە دەم لەبەردەمی مەجلیسی بەرزدا وەلامیان بداتەوە. ئەو بنچینەو ریوشوینانە چین کە حکومەت داینـاون بۆ گفتوگۆی ویستراو بۆ بەستنی پەیمانە تازەکە؟ ئایا هیچ ئیعتیرازیّ لەسەر ئەو مەرجانە هەیە کە کۆمەلەی گەلان لە بابەت ناوچەکانی سەرو سەلماندویەتی؟ ئایا حکومەت بە تەمایە لەناواخنی پەیماننامەکەدا جیگیری بکا، هەروەکو خوا لی خۆش بو عەبدولموحسین سەعدون بەگ سالی ١٩٢٦ لەبەردەمی مەجلیسی بەرزدا پشتیوانی لی کرد؟

ناجی السویدی (سەرۆکی وەزیرانو وەزیری ناوخۆ): هیشتا گفتوگۆ نەکراوە. ئەو بنچینەو ریوشوینانەی حکومەت لە کاتی گفتوگۆدا پیرەوییان ئەکا، هەمان بنچینەن کە حکومەت لە کارنامەکەی خۆیدا لەبەردەم ئیوەی بەریزدا خویندویەتیەوە.

هیچ ئیعتیرازیّ لەسەر هیچ مەرجیك کە ئەوتریّ کۆمەلەی گەلان سەلماندویەتی نیە.

حکومەت بیر لەوە ناکاتەوە یا لای وا نیە شتیّ لە پەیماننامەیەکی ناودەولەتیدا باس بکا کە لەسەر بنچینەیەکی سیاسی دەولی گشتی لە نیوان دو دەولەتی بە تەواوی سەربەخۆدا ئەبەستریّ.

مەعروف جیاوك (هەولیر): وەلامی پایەبەرز سەرۆکی وەزیران ناتوانیّ نە منو نە مەجلیسی بەرز قانیع بکا. لیرەدا رونی ئەکەمەوە کە هەندیّ ماف هەن کۆمەلەی گەلان سەلماندویەتیو حکومەتی عیراقیش سورە لەسەر پشتیوانیو چەسپاندنی،

لەو مافانە کە خوێندن لە هەمو ناوچەکانی سەرودا بە زمانی کوردی بێ، فەرمانبەرەکان لەو کوردانە بن کە بە باشی زمانی کوردی ئەزانن بۆ ئەوەی خەلك‌و فەرمانبەران لە یەکتری تێ بگەن. باوەرم وایە ئەو بریارانە خراونەتە ناو قانونی ئەساسیەوە کە سویندمان بۆ پشتیوانی خواردوە، هەروەها خراوەتە ناو پەیماننامەی ١٩٢٢ەوە. ئەم مافانە یەکگرتویی عیراق دابین ئەکا، حەز ئەکەم پایەبەرز سەرۆکی وەزیران رونی بکاتەوە کە حکومەت گرنگی بەم مافانە ئەداو ئەیخاتە پەیمانەکەوە.

ناجی السویدی: (سەرۆکی وەزیران‌و وەزیری ناوخۆ): نازانم ئەو نوقتانەی نائیبی بەریز... بۆ دلنیاکردنی بیرو بیری نائیبی بەریز ئەلیم ئەو بنچینانەی حکومەت لەسەری رۆیشتوە بۆ باش بەریوەبردنی کاروباری دەولەت لە هەمو عیراق‌داو، لەو ناوچەیەشدا کە نائیبی بەریز باسی کرد، جیگەی ستایشی کۆمەلەی گەلان‌و دەولەتی هاوپەیمانیش بوە. ئەو بەلین‌و پەیمانانەی حکومەتی عیراق داویتی ناتوانێ لێی پەشیمان ببیتەوە. نازانم چ هۆیەك هەیە بۆ گومان کردن لە نیازی باشی حکومەتی عیراق سەبارەت بە جیبەجێ کردنی بەلینەکانی‌و، بەردەوام نەبونی ئەم بارودۆخو لە پاشەرۆژدا، لە کاتیكدا ئەو بەلینانە لە قانونی ئەساسیدا دراون. باوەر ناکەم هیچ هۆیەك هەبێ بۆ دودلی‌و گومان لەو بنچینانەی کە ئیستا حکومەتی لەسەری رۆیشتون‌و لەپاشەرۆژدا لەسەر ئەروات.

مەعروف جیاوك (هەولیر): پایەبەرز سەرۆکی وەزیران‌و، مەجلیسی بەرزو میللەت ئەزانن کە نارەزاییەکی بەهیز بەرامبەر سیاسەتی گشتی حکومەت هەیەو، ئەو وتاره من بلاوم کردۆتەوە هەموی راستە. (محاضر مجلس النواب، جلسة ٢٦ في ١٩٣٠/٢/١٣، ص٣٥٦).

## {} مولاحەڤاتمان دەرحەق بەیاناتی وەزارەتی حاچرە (سەعیدیە)

لەپاش تەدقیق‌و تەحقیقی ئەو بەیاناتە رەسمیەی وەزارەتی حاضرە کە لە ١٠/نیسانی/١٩٣٠دا لە جەرائیدی بەغادا نەشر کرا بو لە نەظەر میللەتی کوردا وا دیارە: کە سیاسەتی وەزارەتی حاضرە، سیاسەتیکی تەفرەدان‌و وەقت بەسەر بردنە، چونکە مەضمونی ئەم بەیاناتە شتیکی تازە نیە، ئەم وەعدە بیلفیعل بە حلی قەراری عصبه الامم‌و بە سیهەمین مادەی معاهدەی سالی ١٩٢٢و مادەی ١٧مینی دەستوری عیراقی موئەییەدەو لە طەرەف مەرحوم عەبدولموحسین بەگ سەعدونیشەوە چەند جاریك لە مەجلیسی نیابی‌دا رەسمەن وە بە کەمالی صەراحەت بەیان‌و ئیعتیراف کرا بو. ئەساسەن قیسمیك لە مەوادی ئەم موقەرەرانە لە قیسمیکی کوردستان‌دا بە تەواوی تەطبیق کراوە، بینائەن عەلەیهی میللەتی کورد وای لا خۆش ئەبو، کە وەزارەتی حاضرە دەرحاڵ ئیکمالی بەقییەی بکردایە. ئیتر میللەتی کورد نایەوێ

ئەوقاتی خۆی بە تەفرەدان ضایع، وە بە وەعدی ئیمرۆ سبەی خۆی ئیغفال بكا. بینا لەسەر ئەمە بەرامبەر ئەم وەعدەی وەزارەتە كە لە حاڵ زیاتر بۆ ئیستیقبالە میللەتی كوردیش تەشەكوراتی خۆی بۆ ئیستیقبال هەلدەگرێ.

لە مەسائیلی ئیداری حاضرەدا هەرچەندە لە تەعیین بونی (تۆفیق وەهبی بەگ) بۆ موتەصەرریفی سلیمانی نامەمنون نین چونكە ئومیدو ئینتیظاری چاكەی لێ دەكرێ، لە عەینی وەقتدا وامان ئەویست بۆ لیواكانی تریش پیاوانی دلسۆزو حاڵ شوناس و كوردخواهو كوردنەژاد تەعیین بكرایەو بكرێ. لەبەر ئەمە بۆ جەلبی ئیعتیمادی میللەتی كورد دەبوایە... كوردی موتەصەرریفی كركوكدا ئەم جیهەتە بەرچاو... ئەمجا ئیستاش بۆ ئەوەی ئیمان بە حوسنی نییەتی وەزارەت بهینن، كوردان ئارەزو ئەكەن بۆ موتەصەرریفی (هەولیر) ذاتیكی وا تەعیین بكرێ كە حائیزی ئەو صیفاتە بێ كە لە سەرەوە بەیانمان كرد.. وە هەروەكو لە مەجلیسدا لە طەرەف مەندوبە كوردەكانەوە طەلەب كرا بو حالەن لیوای (دهۆك و باجەلان) تەشكیل بكرێ.

ئیتر لە ئەقوال زیاتر ئینتیظاری ئەفعال ئەكرێ و، كوردیش قسەی خۆی بۆ دوایی هەلگرتوە..!

### {} هەمو شەویك رۆژیكی لە دوایە

شەری گەورە بە هەمو ئەوضاعی جانسۆزانەوە كە خەریطەی سەرزەمینی تیكداو لەلایەكی ترەوە كە چەند خانمانی قەرالیتی تارومار كرد كەچی لە سەریكی ترەوە زۆر میللەتی تری بەختیار كردو چەند حكوماتی وەكو لیتوانیا، ئۆقرانیا، پۆلۆنیا...ی هینایە وجود. وە دیسانەوە وەكو عائیلەی یالی عوثمانی سەفیل و سەرگەردان و دەربەدەر كرد كەچی جمهوریەتی توركیای، بە هەمو تازەگی و فەعالیەتەوە هینایە وجود.

بینائەن عەلەیهی ئیمەیش ئەتوانین بەپێی ئەوضاعی خۆمانەوە موقابیل بەم هەمو فەلاكەت، بۆمباردومان، موهاجەرەت و سەفالەتەوە كە میللەتی كورد بیلخاصە لیوای سلیمانی چاوی پێ كەوت و، بە ئیعتیباری ئەو ئینتیظاری لوطف و شەفەقەتەی كە لە حكومەتی ئەكرد و كە بەرامبەر بەم هەمو فەلاكەتە بە عەزمیكی تەواوەوە بە ئومیدی پاداشی چاكە ثەباتی كرد نەتیجە بە موكافاتی خۆی گەیشت، ئەوا شەوی لێ رۆژ بوەوە، ئەوا ئەمرۆ دەرگای بەختیاری بۆ كرایەوە یەعنی بە كوردی بیلیین بەرامبەر بەم هەمو تەحەمولی فەلاكەتە، بەرامبەر بەم هەمو چاوەروانیە، دەرگای لوطفی حكومەتی لێ كرایەوە: لە تیگەیشتوترین و چاكترینی میللەتەكەمان و لەسەر

ئەفرازانی عیلم و مەعریفەت کە ئەم وەطەنە پێی گەیاندوەو کە هەمو میللەت بە دلیکی رون و بێ غەشەوە خۆشی ئەوێ و کە یەگانە هەر ئومیدی بە عیلم و عیرفانی بوە سەعادەتی تۆفیق وەهبی بەگ تەعین کراو بو بە موتەصەرریفی لیواکەمان. بەجدی ئەلیین ئەم لوطف و شەفەقەتەی کە حکومەت ئەمجارە لەگەلیا کردین و کە ئومیدو تەمەنای میللەتەکەی هینایە جێ هەمو فەلاکەتیکی لەبیر بردینەوە، ماندوی حەسانینەوە، تاریکی لەسەر لابردین، نائیلی رۆژیکی روناکی دائیمی کردین و ئیستقبالیکی زۆر باشی بۆ حاضر کردین.

ئیمە بەهەمو مەوجودیەتمانەوە بەرامبەر بەم جولانەوەو حوسنی نیەتی ئەم قابینە عالیەی حکومەتە لە بەجێ هینانی شوکران زبان و قەلەممان عاجز ئەبینین. هەر ئەتوانین بەدڵ و بەگیان تەمەنای سەرکەوتنی قابینەی حاضرە بکەین. وە بۆ مۆفەقیەت و سەرکەوتنی ئەم موتەصەرریفە خۆشەویستەمان کە سەعادەتی تۆفیق وەهبی بەگە هەمو لایەك دەست بدەینە یەکتری و بۆ بەرزی و بلندی موشار ئیلەیهی لە خوا بپاریینەوە، وە بۆ سەرکەوتن و پیشکەوتنی وەطەنەکەمان هەول بدەین و لە هەمو خصوصیکەوە یاریەی بدەین.

پشت بەخوا لە غەزەتەی دواییمانا تەرجومەی حالی مەشار ئیلەیهی عەرضی خویندەوارانی ژیان ئەکەین.[31]

### {} تەشریف بردنەوەی موتەصەرریفی پیشو سەعادەتی ئەحمەد بەگ:

سەعادەتی موتەصەرریفی ئەکرەمی پیشومان رۆژی جومعە کە تەصادەفی نوێ مانگی کرد بە رێ و کەرکوکدا تەشریفی بردەوە هەولیر، بەصورەتیکی حورمەتکارانە لە طەرەف عمومی ئەشرافی شار، رەئیسی بەلەدیە، رۆئەسای دەوائیرو مەئمورینی لیواوە بە ئۆتۆمۆبیل لە طەرەف قیسمیکەوە هەتا تەینال و لە طەرەف قیسمیکی ترەوە هەتا کەرکوك رەوانەو عەرضی خواحافیظی لی کرا.

ژیان: سەعادەتی ئەحمەد بەگ لە مودەی ئەم سێ سالەدا کە لەم لیوایەدا مایەوە حەقیقەتەن وەکو ئەمنیەت و ئاسایشی لیواکەی تەئمین کرد، بۆ ئاوەدانی شارەکەیش گەلی هەولی‌داو بەرامبەر بە ئەهالی لوطف و شەفەقەتیکی تەواوی هەبو، گەورەو بچوکی لیواکە لی‌ی مەمنون بو و دائیمەن بەرامبەر بەم شەخصە عالیە حورمەتکار

---

[31] ژیان، ژ٢٣٩، ١٩ی مایسی ١٩٣٠

بـون. ئومیـد ئەکـەین لەهـەر کۆییـەکا ببـێ هـەر موفـەق‌و بـە بـەختیاری بـژی‌و ئـەم مەحەبەتەی کە دەرحەق بە ئەهالی ئەم لیوایە هەیەتی هەر باقی بمینیتەوە.[٣٢]

## {} تەشریف هینانی سەعادەتی موتەصەرریفی ئەکرەمی مان

موتەصـەرریفی تازەمـان جـەنابی تۆفیـق وەهـبی بـەگ لەگـەڵ رەفیقـەی فاضیلـەی موحتەرەمەی‌دا شەوی دەی مانگ لە بەغدادەوە بە ریگای ئاسن حەرەکەتیان فـەرمو و لە بەیانی‌دا گەیشتنە ئیستاسیونۆ کەرکوك‌و لـە طـەرەف لاوە پیگەیشـتوانی کـوردەوە لـە ئیستاسیونۆکە ئیستیقبال‌و بە چەپلە لیدان عـەرض بـە خیرهـاتنی کـراو لـەویوە لەگـەڵ موسـتەقبیلن‌دا بـۆ ئیسـتراحەتیکی چـەند دەقیقـەیی تەشـریفیان بـردە نـادی مەلـەکی کـەکوك‌و لـە دوای مـاندو حەسـانەوەیان بـە تۆتۆمۆبیـل رو بـە سـلیمانی حەرەکەتیان فەرموو لە طەرەف رەئیسی شارو عومومی ئەشراف‌و روئەسای دەوائیرو ئەکثەری ئەهالی سلیمانی‌و هەمو مەئمورینەوە قیسمیکی هەتا چەمچەماڵ‌و قیسمیکی لـە مەرکـەزی تـەیناڵ‌دا ئیسـتیقبالیان فـەرمو وە عـەرضی بـەخیرهاتن‌و بەرامبـەر بـەم تەشریف هینانەی دەرەجەی دلخۆشی‌و شادمانی ئەهالیەکەیان عـەرض کـرد. کوشـار ئیلەیهی لـە مەرکـەزی تـەیناڵ‌دا لـە ئۆتۆمۆبیلەکەی تەشـریفیان هینایـە دەرێ‌و یەکـە یەکە دەستی موستەقبیلینی گوشی‌و لە دوای خیطاب بە حاضرون ئەم نوطقە جوانـە کـە بـو بـو سـەبەبی مەسروریەتی هـەمو لایـەك ئـەی فـەرمو. وە فـەرموی موقیبـل بـەەم تەعینەم زۆر مەسرورم‌و خۆی بە بەختیار ئەزانم چونکە یەگانە ئارەزوی من هـەر ئـەوە بوە کە فرژەتیکم چنگ کـەوێ خدمـەتی وەطـەن‌و میللەتەکـەم بکـەن. وا شـوکر مۆفـەق بـوم‌و تەمەناکـەم هاتـە جـێ‌و بـۆ خدمـەت کردنـی وەطـەن‌و میللەتەکـەم، خـوا ئـەم فرصەتەی پێ بەخشیم ئیتر ئومید ئەکەم هـەمو فـەردیکی میللەتەکە بـە دلیکی پاك‌و جدیـەوە معاوەنـەتم بکـەن، دەسـت بدەینـە دەسـت یـەکتری‌و بـۆ پیشـکەوتن‌و بەرزبونـەوەی قەومەکـەمان لـەژیر بـەیداغی عیراقی خۆشەویسـت‌دا تـێ کۆشـین‌و ببینـە کارکەریکی بەشود لەناو ئەم وەطەنە شیرینەدا. ذمەتی موتەصەرریفی پیشو ئەحمـەد بەگ شایانی تەقدیرە. چونکە بناغەی پیشـکەوتنی قـەومیچك ئاسایشیەتی‌و ئـەویش بە راستی لەلایەنی ئەو ذاتە موحتەرەمەوە زۆر چاك دامەزراوە منیش بۆ ئاسایش هەر

[٣٢] ژیان، ژ٢٣٩، ١٩ی مایسی ١٩٣٠

لەسەر ئەو ریگایە ئەرۆم و بۆ زانست، ژیحەت، دەولەمەندی، ژنعەت، وە تەعمیرو زەراعەتی مەملەکەتەکە لە داخلی هیزی بەشەریەتدا تێ ئەکۆشم.

لە دوای تەواو بونی فەرمودەکەی لەگەڵ ئەو هەمو قالەبالغە زۆرەدا تەشریفیان هینایە سلیمانی و هەتا نا شار طاقم طاقم ئەهالی لە ڕێدا صەفبەستەی ئیستیقبال و ئیحتیرام بون.

ژیان: ئیمەش دیسانەوە بە ناوی عمومی میللەتی کوردو ئەهالی لیواکەمانەوە عەرضی بەخیرهاتنی ئەکەین و تەمەنا ئەکەین خوای گەورەو مەزن هەمو فرصەتیکی پێ ببەخشێ و بۆ خدمەتکردنی وڵات و میللەتەکەی موەفەقی بکات.[٣٣]

{} **داخلی:** موفەتیشی ئیداری خۆشەویستمان سەعادەتی کاپتان گاون بە مەئذونیەتی شەش مانگ رۆژی شەمەی ٣ی ئەم مانگە تەشریفی بردەوە بەریطانیا، لە طەرەف سەعادەتی موتەصەرریفی ئەکرەمی و رؤەسای دەوائیرەوە تەشیع و خواحافیظی لی کرا.

لە جێی موسار ئیلەیهی هەتا عەودەت ئەفەرمویتەوە سەعادەتی کاپتان ((البن)) موفەتیشی ئیداری عەمارە تەشریفی هینایە سلیمانی و موباشەرەتی بە ئیش فەرمو، عەرضی خواحافیظی سەعادەتی کاپتن گاون و بەخیر هاتنی موفەتیشی ئیداری تازەمان ئەکەین.[٣٤]

## {} موفەتیشی ئیداری تازەمان سەعادەتی کاپتان گاون

بە موناسەبەتی مەئذونیەت و تەشریف بردنی موفەتیش سەعادەتی کاپتن لاینەوە هەرچەند مودەتیك سەعادەتی میجەر لوئیدی موفەتیشی ئیداری کەرکوك بە وەکالەت تەماشای ئەم لیوایەشی ئەکرد، بەڵام ئەمجارە سەعادەتی کاپیتان گاون کە خاطرەو مەوقیعیکی عالی هەیە لەم لیوایەدا بۆ ئەم وەظیفەیە تەعین کرا. رۆژی پینجشەمەی ١٣ی مانگ تەشریفی هینایە سلیمانی.

وەقتیك کە حکومەت ئەم لیوایەی ئیشغال کردەوە موشار ئیلەیهی بە صیفەتی قوماندانیتی لەگەڵ جەیشی عیراقیدا تەشریفی هینایە ئیرەو مودەتیکی زۆر کە

[٣٣] ژیان، ژ٢٣٩، ١٩ی مایسی ١٩٣٠

[٣٤] ژیان، ژ٢٣٨، ٨ی مایسی ١٩٣٠

قوماندانی عمومی عەسکەری بوە وە کە سلیمانی لە ئینقیلاب و فەلاکەتیکی گەورەدا بو زۆر خدەمەتی کردین و بە هەمو قوەتیەوە بۆ محافظەی حەیات و مالمان و بۆ ئیصلاحی ئەو حالەمان سەعی و هیمەتی فەرمو، لە دواییش‌دا بە سەبەبی شارەزایی و خەدەماتی پیشویەوە بۆ بە موفەتیشی ئیداری لیواکەمان و مودەتیکی زۆریش لەم وەظیفەیەدا بۆ تەرەقی و تەعالیمان هەولی‌دا نەتیجە ئیدارەیەکی باشی لەم لیوایەدا تەنظیم و تەئسیس کرد، بە نەوعیك کە ئیستاش ئەهالی مەدیونی شوکرانیتین تەعینی ئەمجارەیشی بو بە سەبەبی مەسروریەتی هەمو ئەهالی و فەرەح و خۆشیەکی خستە دلی هەمو لایەکەوە.

بەناوی عمومەوە عەرضی بەخیرهاتن و قدومی موبارەکی ئەکەین و تەمەنای سەعادەت و مۆفەقیتی ئەکەین.[35]

### {} بەیانی رەسمی لەبابەت موعاهەدەی تازەوە:

موفاویزەکانی عیراق و بەریتانیا ئیتیفاقیان کرد لەسەر ئیمزای موعاهەدەیەکی تەعاروف و سەداقەت، کە لەگەڵ عیراق داخڵ بە عەسبەتول ئومەم بو پەلە ئەکرێ لە تەنفیزی‌دا، وە کە هەردولا ئیتیفاقیان لەسەر کرد لە عەینی وەقت و میعاددا لە بەغداو لۆندەرە نەشر ئەکرێ، ئەساساتی موعاهەدەکە ئەمەیە:

١- ئیعتیراف بە ئیستیقلالی تەواوی عیراق، وە دەر عوهدە کردنی مەسئولیەتی ئیدارەی هەمو شئونی بە تەنها. وە دەر عوهدە کردنی مەسئولیەتی داخلیە، وە بە پێی تەحالوف بەرامبەر بە ئیعتیدایەکی خاریجی مودافەعەی.

٢- لەغوی موعاهەدات و ئیتیفاقاتی کە لە بەینی عیراق و بەریتانیای گەورە کراوە.

٣- کە موعاهدەکە هاتە حەییزی تەنفیزەوە ئیعتیراف ساحیبی جەلالەتی مەلیکی بەریتانیا بەتەواو بونی مەسئولیاتی ئینتیدابیە کە ساحیبی جەلالەتی مەلیکی بەریتانیا دائیر بە عیراق قوبولی کرد بو لە خۆیەوە تەواو ئەبێ.

٤- کیشانەوەی هەمو قوای بەریتانیا لە هنیدی و موسڵ لە مودەتیکدا کە لە ئیعتیباری تەئثیریخی تەنفیزی موعاهەدەکەوە لە پینج ساڵ تەجاوز نەکات، وە بە ئیجار دانی سێ ٣ قاعیدەی هەوائی لە غەربی فورات و شەتتول عەرەبدا لەلایەنی

---

[35] ژیان، ژ١٨٠، ٢٠ی حوزەیرانی ١٩٢٩

حکومەتی عیراقییەوە بە ساحیبی جەلالەتی بەریتانیا بە شەرتی موحافەزەی ئەم قاعیدانە لەلایەنی حەرەسی خاسی ساحیبی جەلالەتی مەلیکی عیراقەوە ئیجرا بکرێ بە مەسرەفی خاسی ساحیبی جەلالەتی بەریتانیا.

٥- مودەتی موعاهەدە لە ئیعتیباری دەستکردن بە تەنفیزیەوە بیستو پینج سالە. بینا لەسەر تەلەبی یەکێ لە فەریقەینی موتەعاقیدین دەست ئەکرێ بە موفاوەزە لە بابەت موعاهەدەیەکی تازەوە بۆ تەئمینی مواسەلاتی ئەساسیەی جەوییەی ئیمپراتۆر، ئەگەر لەم مەسئەلەیەدا ئیختیلاف حاسیل بو حەوالەی مەجلیسی عەسبەتول ئومەم ئەکرێ.

٦- هەر تەرەفە لە موتەعاقیدەین لە وڵاتی ئەوی تریانا لە تەرەف مومەسیلیکی دیپلۆماسیەوە تەمسیل ئەکرێ. بەپێی ئوسولی مومەسیلینی دووەلی مەستەقیللە ئیعتیمادی ئەدریتێ.[٣٦]

## {} بە واسیطەی موتەصەرریفەوە بۆ ئەهالی سلیمانی

برقیتکم س١٤١ فی ٩ الجاری نرجو تبلیغ الجواب الاتی الی حفیدزاه عبدالقادر ورفقائه الموقعین علی البرقیه الموجهه الی رئاسه الوزرا .

ان المعاهده تشمل جمیع سکان العراق علی اختلاف طبقاتهم وتعود منافعها وواجباتها لهم وعلیهم جمیعا وبالطبع ان اخواننا الاکراد هم منهم والیهم اما الحقوق الممنوحه للاکراد فمحفوظه تماما بحکم القانون الاساسی الڗی فی واجب الجمیع تاییده ورعایه احکامه.

س٢٢٣٣ الداخلیه

جواب

١٥ تەموزی ٩٣٠

بەغدا: وەزیری داخلیە

تەلغرافی مەعالیتان بە واسیطەی موتەصەرریفەوە تەبلیغمان کرا. ئیمە تەطبیقی قەراری عیصبەتول ئومەم مان ئەوێ کە ئەمەیش بە تەواوی تەوافوق ئەکات بە ماددەکانی ١٠٩و ١١٠ لە قانونی ئەساسی.

عمومی ئەعیانو ئەشرافی سلیمانی.[٣٧]

---

[٣٦] ژیان، ژ٢٤٩، ٧ی تەموزی ١٩٣٠

{} رۆژی ۱۹۳۰/۷/۲۲ عمومی ئەشراف و قیسمیك عەشایەر چونە تەلغرافخانە رەئیسەل وزەرایان بانگ کردە سەر تەلەفۆن، لە وەکالەتی عمومەوە حەمە ئاغای عەبدورەحمان ئاغا ئەم قسانەی لەگەڵا کرد:

فەخامەتمەئاب!

لەو موعاهەدە تازەیەی کە کراوە ئەو حقوقەی کە عیصبەتول ئومەم خستویەتە قەرارەوەو بە کوردی بەخشیوە تیا دەرج نەکراوە، بۆ ئەم خصوصە موتەعەدید دەفعە لە طەرف عمومی عەشائیر، ئەشراف، توجار خولاصە هەمو کوردەکانەوە تەلغراف بۆ ذاتی دەولەتیتان نوسراوە، مەعەلئەسەف هەتاوکو ئیستا جوابیکی شافیمان و عادلمان وەرنەگرتۆتەوە، ئینتیظار ئەکەین.

جوابی رەئیسەل وزەرا بە تەلەفۆن

منیش وەکو ئیوە کوردم و ئارەزوی سەعادەتی ئەکەم و بۆ ئەم خصوصە سەعی ئەکەم و لەگەڵ مەندوبی سامیدا لە موذاکەرەدا ین، هەتا چوای رۆژی تر بۆ ئەم خصوصە دیینە سلیمانی و کفتوگۆتان لەگەڵا ئەکەین. رەئیسەل وزەرا.[۳۸]

{} تەلەغرافی ئەشرافی هەولیر کە نوسیویانە بۆ ئەشرافی سلیمانی

سلیمانی: میرزا تۆفیق قەزاز

لە موطالەباتی حقوقمان ثەبات باعیثی نەجاتە، میللەت پشتیوان خواش لەگەڵمانە. ۲۰ی تەموزی ۱۹۳۰. عوثمان ئەفەندی زادە: ئەحمەد. مەعروف جیاووك

جوابی سلیمانی

هەولیر: ئەعیان ئەحمەد بەگ و جیاووك

ثەبات ئەبەدیە پشتیوانی وەطەنپەروەران کافیلی موفەقیەتە. بەناوی سلیمانیەوە تۆفیق قەزاز.[۳۹]

---

[۳۷] ژیان، ژ۲٥٤، ۲۸ی تەموزی ۱۹۳۰

[۳۸] ژیان، ژ۲٥٤، ۲۸ی تەموزی ۱۹۳۰

[۳۹] ژیان، ژ۲٥٥، ۳۱ی تەموزی ۱۹۳۰

{} **له چەمچەماڵەوە:**
سلیمانی گەورەکانی موتەظاهرینی کوردان
بۆ بەرزی میللەتمان خۆمان و عەشیرەتمان فیداکارین بۆ سەرکەوتن پشتیوانین.
لاوانی کوردی چەمچەماڵ: رەئیسی بەگزادە، محەممەد ئەمین، رەئیسی هەمەوەند، ئەمین.

**جوابی سلیمانی**
چەمچەماڵ ئەمین ئاغا، ئەمینی رەشید ئاغا
حسیاتی بەرز، پشتیوانیتان هەزار قات قوەتی داینێ. بژی کورد، هەمەوەند.
بەناوی موتاظاهیرینەوە عەبدولقادر.[٤٠]

{} ١٩٣٠/٧/٢٣
بەغداد فەخامەتی مەندوبی سامی عیراق
بەغداد فەخامەتی رەئیسەل وزەرای عیراق
بۆ مەعلومات بۆ سەعادەتی موتەصەرریفی ئەکرەمی سلیمانی
بۆ مەعلومات بۆ سەعادەتی موفەتیشی ئیداری سلیمانی
مەوثوقەن خەبەر وەرگیراوە بە موناسەبەتی هاتنی فەخامەتتان بۆ کوردستان مەئمورینی ئەلویەی کوردیە کوردەکان تەضییق و تەهدید ئەکەن بۆ دەست هەڵگرتن لە حقوقیان ئەگەر مەقصەد لە ئیستیفتایە لەژێر ئەم شەرائیطەدا نەمەعقول و نەمومکینە تا کوردستان لەژێر تەئثیری نفوذی مەئمورینی ئیدارەی عەرەبدا بیت ئیستیفتایەکی عادلەو وەطەنپەروەرانە موستەحیلە. وە لە تاریخی بەشەردا نەبینراوە بۆ ئیستیفتا ئەفکاری حورەی میللەتیك تەضییق بکریت بۆ قبولی تەرجیحی ئەسارەتی خۆی بەسەر حورریەتدا. موقابیل بەم حالە بەشیدەتەوە پرۆتیستۆ ئەکەین. ئەشراف سلیمانی.[٤١]

---
[٤٠] ژیان، ژ٢٥٤، ٢٨ی تەموزی ١٩٣٠
[٤١] ژیان، ژ٢٥٤، ٢٨ی تەموزی ١٩٣٠

## {} ٢٤ی تەموزی ١٩٣٠

**لەندەن – نیەر ئیست، تەلغراف**

ئەو مەقالەیەی ئیوە کە لە خصوص موعاهەدەی ئینگلتەرەو عیراقەوە نوسی بوتانو ئیهمالی حقوقی کوردتان دەرخست بو و جەهدی غەیر ئەندیشانەتان بۆ حیمایەی.. لە طەرەف کوردانەوە بە تەقدیریکی عەظیمو تەشەکوراتی قەلبیەوە قبوڵ کرا، ئەم معامەلەی بەشەرپەرستانەیەی ئیوە موظاهەرەتیکی جوانی قەضیەی موحیقەی کوردانە.

کوردەکان موتەئەسیفن لە موعاهەدەکە، چونکە هیچ باسی ئەو حقوقەیان نەکراوە تیا، کە بە موجیبی ئەوە حکومەتیکی کورد لەژیر ئینتیدابی عیصبەتول ئومەمدا تەشکیل بکرێ.

مەئمورینی حکومەتی عەرەبیە تەهدیداتو تەضییقاتی ئیمە ئەکەن کە دەس لە حقوقی خۆمان هەلگرین، لوطفەن دائیمەن ئەم حەقیقەتە لە لاپەرەکانتانا نەشر بکەن.
تۆفیق قەزاز.[٤٢]

## {} پرۆغرامی

**فیرقەی موتەظاهرینی کوردان**

**کە لە رۆژی ١٦ی تەموزی ١٩٣٠ ئیجرا ئەکرێ**

١– ئاماو مەقصەد لەم موظاهەرەتە صرف لە رییەکی مەشروعەوە طەلەبی حقوقی مەعلومەی کوردانە کە وەختی خۆی عصبە الامم پێی بەخشیوەو قەراری لەسەر دراوە.

٢– فیرقەی موتەظاهرین بە عمومی مەجبورە تەبەعییەتی هەمو قەوانینو نیظاماتی حکومەتیی بکاتو حەتتەلئیمکان مەیدان بە حەرەکەتیك نەدات کە ببێ بە سەبەبی ئیخلالی ئەمنییەتو ئاسایش.

٣– مەحەللی ئیجتیماع لەبەردەمی سەرای حکومەتیو لەباغی بەلەدییەدا ئەبێ.

٤– عمومی ئەشراف مەملەکەتو روئەسای عەشائیرو ئەهالی ئەمرۆ کە موصادیفی ١٦ی تەموزی ٩٣٠ە ٩ ساعەت لە نۆی عەرەبی لەناو باغی بەلەدییەدا ئیجتیماع ئەکات.

٥– ساحەی جولانی فیرقەی موتەظاهرین لە بەردەمی سەرای حکومەتیەوە هەتا بەردەمی مزەوتی گەورەو لەم مەنطیقە مەحدودەدا ئەبێ.

---

[٤٢] ژیان، ژ٢٥٤، ٢٨ی تەموزی ١٩٣٠

٦-لە ساعەت نۆو نیوی عەرەبیدا فیرقەی موتەظاهرین لە حالی سکونەتو ئیعتیدالدا لە مەحەللی ئیجتیماعدا حەرەکەت ئەکاتو ئەچیتە بەردەمی مزگەوتی گەورە.

لەویدا بەناوی عوموموەوە (لە طەرەف رەمزی ئەفەندی حاجی فەتاح)ەوە قۆنفرانسیك ئەدریت.

٧-لەدوای قۆنفرانسەکە لە ساعەت دەی عەرەبیدا فیرقەی موتەظاهرین بڵاو ئەبیتەوە.

٨-هەیئەتی مومەثیلەی فیرقەی موتەظاهرین ئەم ذاتانەی لای خوارەوەن:

**عەبدولرەحمان ئاغای ئەحمەد پاشا. عیزت بەگی عوسمان پاشا. حفیدزادە شیخ قادر ئەفەندی. حەمە ئاغای عەبدولرەحمان ئاغا. رەمزی ئەفەندی حاجی فەتاح. میرزا تۆفیق قەزاز. مەجید ئەفەندی حاجی رەسوڵ ئاغا.**

**سلیمانی: ١٦ی تەمزی ١٩٣٠**

## {} تەشریف هینانی وەلیعەهدی بلند پایە و موقاهەرەتیکی عومومی کورد

رۆژی ١٦ی مانگ ئەمیر غازی وەلیعەهدی بولوندپایەی عیراق تەشریفی هینایە سلیمانی، هەمو ئەهالی لیوای سلیمانی، عولەما، سادات، ئەشراف، تیجار، رۆئەسای عەشایەر، رۆئەسای دەوائیر، مەئمورینی حکومەت، شاگردانی مەکتەب لە سەعات دوی کوردیەوە چون بەپیریەوەو لەسەر جادەی دەباخانە لەو چادرانەدا کە لەلایەن بەلەدییەوە هەلدرا بو حازیرو مونتەزیری تەشریف هینانی بولوندپایەیان بون، لە سەعات دەوری ٣ی کوردیدا تەشریفیان گەیشت. کە گەیشتە نزیك ئەم عەشاماتە لە ئۆتۆمۆبیل تەشریفی هاتە خوارەوەو تەفتیشی حەرەسی شەرەفو کەششافەی کردو لەگەڵ هەمو ئەشرافو رۆئەسای عەشایەرو مەئمورین‌دا موسافەحەی فەرمو.

لەدوای ئەمە تەشریفی سواری ئۆتۆمۆبیلی خوسوسی خۆی بو، هاتنە ناو شارو لە مالی سەعادەتیموتەصەرریفی خۆشەویست‌مان دابەزی.

ئەم میوانە گەورەو خۆشەویستە بە هەمو ئیحتیرامیکەوە قبوڵو ئیستقبال کرا.

هەر عەینی رۆژ لەلایەنی رۆئەسای عەشایەر، ئەشراف، تیجارو ئەهالی سلیمانیەوە نومایشیکی ... موتەنتەن‌و بەدەبدەبە ئیجرا کرا.

بەلێ ئەم نومایشە، رۆحیکی غایەت بەرزو بەقیمەت، بە حیسسیکی غایەت عیلویو موقەددەسەوە ئیجرا کرا. نەك هەر عولما، سادات، ئەشراف، تیجارو رۆئەسای موحتەرەمەی عەشایەر بەلکە هەمو میللەتی کورد، گەورە پیچون، مندالی

مەعسوم لە باوەش دایکیانا لەگەڵ دایکە بە رەئفەت و شەفەتەکەیان، بەلکە رۆحی هەمو مردوانی کورد لە سەمای مەعنەوییەت و رەحمەتدا ئیشتراکیان کرد.

بەلی ئەووەڵ جار ئەم ئیزدیحتمە لە سەعات نۆی کوردیدا روەو بازار رۆیشتن و لەپاشا گەرانەوە ناو باغچەی بەلەدییە–بەردەمی سەرای حکومەت. دو بەیداخ کە لەسەر شانی ئومیدی ئیستیقبالی میللەت: تەلەبەی مەکتەب، هەڵ گیرا بو ئەمانەی لی نوسرابو: *((رەوا بێ مەتالیبی کورد))، ((بەرقەرار بێ عەدالەتی عەسبەتول ئومەم)). لە دەمی هەمو فەردیك بەبێ ئیختیار گورانی وەتەنی ئەهاتە دەرەوە. ئەم ئیزدیحامە ئەوەندە زۆر بو ئەتوانین بلیین بەحریکی کەللە شەپۆلی ئەدایەوە. لەبەر زۆری قەلەبالغ لە باغچەی بەلەییەدا جیگا نەبوەوە ئینجا هەمو چونە سەر جادەی سابونکەران و لەبەردەمی چایخانەی حەمە ئاغا و مەکتەبی موتەوەسیتەدا راوەستا. لەوێدا جەنابی وەتەنی غەیور رەمزی ئەفەندی حاجی فەتاح لەسەر سەربانی چایخانەکەی حەمە ئاغا راوەستاو نوتقیکی غایەت قیمەتدارو موهەییجی خوێندەوە کە هەر حەرفیکی شایستەیە بە قەلەمی زەرین لە سەحیفەی تەئریخ و ئەعماقی... بنوسریت و لە طەرەف میللەتەوە بە ئیحترامەوە چەپلەریزان کرا وا عەینەن لە خوارەوە دەرجی ئەکەین.

لەدوای ئەمە جەنابی میرزا تۆفیق دیسان لەسەر عەینی سەربان ئیرتیجالی بەرامبەر بە میللەت چەند کەلیمەیەکی شیرینی ئەدا کرد. وە لە تەرەف هەمو میللەتەوە دەنگی چەپلەریزان و بژی، بژی گوێی ئاسمانی کەر کرد. وە لەلایەنی هەمو میللەتەوە تەوکیل کرا مەطالیبی میللەت بە وەلیعەهدی بلندپایە عەرز بکات.

ئەم نومایشە بە نەوعیکی وا مەدەنی و سکونەت جەرەیانی کرد کە چارەی هیچ کەسیك غەیری سرورو تەبەسوم هیچ عەلامەتی یەئس و تەئەسور وە یا تەهەور موشاهەدە نەئەکرا. لە دوای ئەمە لە سەعات دەو نیوی کوردیدا عولەما، سادات، ئەشراف، تیجار، رۆئەسای موحتەرەمەی عەشائیر، روئەسای دەوائیر چونە دەولەتخانەی سەعادەتی موتەصەرریفی خۆشەویست و لەوێدا زیارەتی میوانی عەزیزو بلندپایە کرا.

لەوێدا لەسەر تەکلیفی میللەت وەکیلی موحتەرەم جەنابی میرزا تۆفیق هەلسایە پییان لەپاش ئەوەی کە بەناوی هەمو میللەتەوە عەرضی بەخیرهاتنی وەلیعەهدی خۆشەویستی کرد مەطالیبی میللەتی بەم تەحرە کە لە خوارەوە ئەینوسین بە عەرضی گەیاندو جوملە جوملە لە طەرەف مودیری تەحریرات جەنابی جەلال صائیب ئەفەندییەوە بە عەرەبی تەرجومەو بە عەرض گەریەنرا. وەلیعەهدی خۆشەویست زۆر چاك لە هەمو جوملەیەکی گەیشت و بە دیققەت گوێی راگرت.

لەدوای تەواو بون موطالەباتەکە کە عیبارەت بو لە مەضبەطەیەکی عمومی لەلایەن خەطیبی موحتەرەمەوە تەقدیمی سموی وەلیعەهد کرا. تەرجومەو جوابی سموی وەلیعەهدیش بە واسیطەی رەئیسی بەلەدییەوە بە میللەت گەیەنرا کە ذاتی بلندپایەیان وەعدی فەرمو ئەم مەطالیبی میللەتە بە عەرضی عەتەبەی ملوکانەی بگەیەنێو بەم تەحرە موظاهەراتەکە هەتا ئیوارێ درەنگ دەوامی کردو لە دوای ئیوارێ خەلقەکە بڵاوبونەوە.[٤٣]

## {} نوطقی موحتەرەم رەمزی ئەفەندی ئەی کوردینە!

هەر وەکو قەطعیەتی ریاضیە ثابیتە ئیتر هەمو قەومیك بەلیسان، ئەدەبیات، تەئریخ، عەنعەنات، عورفو عادەتی خۆی تەرەقی ئەکاتو ئەم عەصری بیستەمینی مەدەنییەتە عەصریکی میللییەتە.

موحیطو حالاتی عمومیەی هیچ قەومیك نەبوە بە سائیقی تەرەقیو ئیعتیلا بۆ قەومیکی تر، بیلعەکس بوە بە سەبەبی فەلاکەتو ئیضمیحلالی.

لەپاش حەربی عمومی، تەئریخو خەریطەی عالەم بۆ ئەم موددەعایە شاهیدیکی عادلە.

هەمو زەریفی ئەزانین قەومی کورد ئایا لە ئەثنای حەرب عمومیداو ئایا لە پاشدا گەلێ فرصەتی قیمەتداری دەست کەوت، مەعەئلەسەف لە هیچیان ئیستیفادەمان نەکرد، لە هەمو دەوریکدا ئەم فرصەتە باشانە یەکە یەکە بون بە سەبەبی فەلاکەتو ئیدبارمان، مەسئەلە ئەهمیەتی کەسب کرد، لازمە ئەسبابی تەحلیلو تەحەری بکەینو برینەکانی ئیحتیماعیمان دەرمانو ساریژ بکەین، لە نەتیجەی ئەم تەحرییاتەدا دو عیللەت لە خۆمانا ئەبینین: یەکیکیان، لەناو ئەفرادا نیفاقی دائیمیو بێ مەحەببەتی. دوهەمیان، بۆ ئیحقاقی حەقو تەرویجی ئامالو مەطالیبی عمومییە، موراجەعەت بە عەقلو فیکر نەکردن.

بیو لاپەرەکانی تاریخی ئەقوام هەلبدەینەوە لە هەمو ئەقوامی مونقەریضدا ئەم دو عیللەتە موشتەرەکە ئەبینین کە بوە بە سەبەبی فەلاکەتو ئینقراضیان، ئەی کوردینە! لەم حالەشدا نابێ ئیمە مەیئوس ببین. چونکە ئیسلامین. پیغەمبەر (صلعم) فەرمویەتی: ((الیأس کفر)) یەئس کوفرە عەطالەت تەولید ئەکاتو نەتیجەی عەطالەتیش کردنە، فەلاکەتە، میللەتیك صاحیبی مەتانەتی ئەخلاقیە بێ بە عەقڵو

---

[٤٣] ژیان، ژ٢٥٢، ١٩٣٠/٧/٢٧

تەدبیری جوالیەوە لە فەلاکەت دەرسی عیبرەتو ئینتیباه وەرئەگرێو، فەلاکەتەکە ئەکات بە سائیقی تەیەقوظو ئیعتیلا بۆ خۆی.

کەوابو لازمە لەپیش هەمو شتیکدا لەناو خۆمانا نیفاقەکە هەڵ کرینو، لە جیگای ئەم کەلیمە مەشئومە تۆوی مەحببەتو ئیتیفاق بچینین. زۆر شوکر ئەمرۆ ئەثەری خیری ئەم ئیتیفاقە لە میللەتەکەماندا ئەبینین، گەورەو بچوك، داخلو خاریج بۆ حقوقی موکتەسەبەو مەشروعەمان لە دائیرەی عەقڵو قانون، مەنطیقو فیکردا موطالەبەو مودافەعە ئەکەنو هەوڵ ئەدەن. وە لازمە لەمەودواش لە هەمو ئیشیکمانا حەقو حەقیقەت بکەین بە پشتیوانو رەهبەرمان.

ئینجا بیینە سەر مەوضوعی ئەم ئیجتیماعو موظاهەریە:

مەعلومتانە، حکومەتی عیراق لەگەڵ حکومەتی بەریطانیا موعاهەدەیەکی تازەی کرد.

حقوقی ئیمە لە مادە ٣و ٤ی قەراری مەجلیسی عالی عصبە الامو مادە ٣ی موعاهەدەی ١٩٢٢و مادە ١٠٩و ١١٠ی قانونی ئەساسی حکومەتی عیراقییە تەثبیت کرا بو، وە کە لە طەرەف حکومەتی فەخیمەی بەریتانیاوەو جەلالەتی مەلیكو رەئیسی حکومەتی عیراقییەوە رەسمەن تەئییدو ئیعتیراف پێ کراوە. مەعەلئەسەف هیشتا ئەسیری دۆسیەو کاغەذەو لە شکلی عەنقادا ماوەتەوەو حەتتا لەم موعاهەدە تازەیەشدا کە یەك دفعە موناسەباتی ئینگلیزو عیراق قەطعییەتی کەسب کردوەو ئینتیداب نیهایەتی هاتوە دیسانەوە خراوەتە گۆشەی نسیانەوە، موعاهەدەکە وەکو فەلاکەتیکی تاکمەضهور ئومیدی ئیستیقبالی مەحو کردوینەتەوە.

لەبەر ئەمە غایەی موظاهەرەکە ئیحتیجاجیکە بۆ مەطالیبو حقوقی مەشروحەو مەشروعەمان. لازمە گەورەو بچوك هەمو کوردیك دەست بدەینە دەستی یەکتریو لەم رۆژە تاریخیە ئیستیفادە بکەن.

ئەمرۆ قەومی کورد بە وجودی مولاقاتی وەلیعەهدی عیراق مەسرورو شادانن بۆ عەرضی بەخیرهاتنو مەطالیبی حقوقیە لە طەرف عومومەوە کۆمەلیك هەلبژیراون. ئەم مۆمەلە هەیئەتی عومومیە تەمثیل ئەکەن بە پشتیوانی ئیوەوە موەفەق ئەبن. لازمە لە طەرف کۆمەلەوە سەعیو لە طەرف ئیوەوە موظاهەرەتو قوەت. ئیتر حەق رەفیقمانە.

بژی قەراری مەجلیسی عصبە الامم

بژی مەطالیبی قەومی کوردو موختارییەتی ئیدارە

بژی مەلیکی عەرەبو کوردان کە مەلیك فەیصەلی ئەووەلە

بژی حکومەتی فەخیمەی بەریتانیا.[٤٤]

---

[٤٤] ژیان، ژ٢٥٢، ١٩٣٠/٧/٢١

## {} موطالەباتی عمومی میللەتی کورد کە بە واسیطەی میروا تۆفیق قەزازەوە تقدیمی صاحب السمو ولیعهدی خۆشەویستی عیراق کراوە

لە پیشەوە بەناوی هەمو کوردانەوە عەرضی بەخیرهاتنتان ئەکەین. وە خۆمان بە بەختیار ئەزانین کە لەم فرصەتەدا تەشریفتان هیناوەتە لیواکەمان.

کوردەواری، کە لە هەمو وەقتیکدا بە ئیرتباطیکی مەتین و صەمیمەوە مەبوطی عەرشی بەرزی عیراقە خۆی بە شەرەف ئەزانێ کە مەعروضاتی ئاتییە بخاتە بەر نەظەری صاحیب سموتان:

مەعلومی صاحیب سموتانە کە لەم چەندانەدا موناسەباتی داخلییەو خارجییەی حکومەتی صاحیب جەلالەت مەلیك فەیصەڵی ئەوەل لەگەڵ حکومەتی بەریتانیادا رەبطی موعاهەدەیەك کراوە کە موافیقی ئەم موعاهەدەیە ئینتیداب مولغاو تەنها حکومەتی عیراق مەسئولی ئیدارەی داخلییە ئەبیت. لەم موناسەبەتەدا ئەمانەوێ بیهینینەوە خاطر کە وەقتێ لوجنەی ئیستیفتای عصبە الامم و حەللی ولایەتی موصل هاتە عیراق لە تەقریرەکەیدا وەهای تەوصیە کردوە ئەگەر کوردستانی جنوبی رەبطی عیراق بکریت لازمە بۆ موحافەظەی مەوجودییەتی میللیە، عەنعەنە، زمان و عصبە الامم و مادە: ١٠٩و ١١٠ی قانونی ئەساسی عیراقدا تەئییدو تەثبیت کراوە.

حالی حاضر، موافیقی موعاهەدەی تازە ئینتیدابی بەریتانیا رەفع و لەسەریکی تریشەوە لە بنودی موعاهەدەدا حقوقی مەشروعەو موئەییدەی کورد کە عیبارەتە لە موختارییەتی ئیدارە طەی و ئیعتیراق پێ نەکراوە، کوردەواری بە عمومی ئەم موعامەلەیە بە تەجاوزیکی صەریحی ئەزانن بۆ حقوقی موعتەرەفەیان بە یەك دڵ و یەك ئاواز مەطالیبی خۆیان کە عیبارەتە لە موختارییەتی ئیدارە بۆ کوردستانی عیراق یەعنی لیوای کەرکوك، هەولیر، سلیمانی، ئەقظییەی شیمالیی موصل و قیسمی سەروی لیوای سیروان ئیدیعا و عەرضی صاحیب سموتانی ئەکات کە بۆ تەطبیقیکی سەریعی حەوالەی سولطاتی علیای بفەرمون.[٤٥]

---

[٤٥] ژیان، ژ٢٥٢، ١٩٣٠/٧/٢١

## {} روداوەکانی کورد:

زۆر بە داخەوە نامەکانی سلیمانیم بە وردی خویندەوەو چەندم حەز ئەکرد لە وشەکانی بەریوەبەری رۆژنامەکە تینەپەرم. وەکو لێی تیگەیشتم ئەم نامانە ئازارم ئەدەن‌و، هەمو عیراقییەکی دلسۆز، کە سور بێ لەسەر قازانجی ولاتەکەی‌و لە پیناوی یەکیتی‌و سەربەخۆیی‌دا گیانبازی بکا، کە ببینێ کوردەکان لەم هەلومەرجە سەختەدا کە ولاتی پیدا ئەروا، بۆ ئەوەی مافەکانی بە خۆپیشاندان‌و ئاژاوە بسینێ، دور نیە بە هاندانی بیگانە یا کەسانی نەفس نزم بوبێ، بۆ قازانجی تایبەتی خۆیان زولم لە گەلەکەیان ئەکەن. نمونەی ئەمان زۆرن رۆژگار کەسایەتیەکانیمان بۆ دەر ئەخا. لەوەتی ئەم نامانە بلاو بونەتەوە چاودیرم ئەکرد بزانم کاریگەرییان چۆنە گەیشتمە چەند ئەنجامیکی تاڵ، لیرەدا هەندیکیان ئەنوسم:

١- کەرکوکیەکان ئینزاری کورد ئەکەن سەبارەت بەو شتانەی لە خواستەکانیان‌دا هاتوە کە خراونەتە بەرچاوی خاوەن شکۆی شاهانە ئەمیر غازی مەزن لەلایەن میرزا تۆفیقەوە کە کەرکوك لەناو ئەو کوردستانی عیراقەدایە کە ئینگلیز بۆی سەلماندون بە ویستی خۆیان بەریوەی بەرن یا ئیدارەی موختارییەت.

٢- کەرکوکیەکان بە هیچ جۆرێ دان بە کوردا نانین چونکە ریچەلەکیان بۆ دنیا ئاشکرایە، بەلکو هەمو بریاریان داوە لەگەڵ برا عەرەبەکانیان بژین‌و، هیچ پیوەندی‌و پەیوەستیەکیان بە کوردەوە نیە.

٣- کەرکوکیەکان داوا لە کورد ئەکەن ناوی کەرکوك‌و کەرکوکیەکان بەهیچ جۆرێ لەگەڵ داواکانی خۆیان‌دا باس نەکەن، چونکە هەرگیز لە پلەیەکدا نەبون دەستی بیگانە بتوانێ تۆوی ناکۆکی‌و نیفاقیان لەناودا بچینێ.

٤- کەرکوکیەکان ئامادەن سەرو ماڵ لەسەر یەکیتی عیراق دابنین.

بژی عیراق‌و بژی ئەوەی لە پیناوی یەکیتی عیراق‌دا هەوڵ ئەدا.
بمرێ‌و بروخێ ئەوەی هەولی تەفرەقەو نیفاق ئەدا. کەرکوك حەسەن سوداد.[٤٦]

## {} کەرکوك:

لەسەر موراجەعاتی موتەمادی کوردانی سلیمانی‌و کەرکوك‌و هەولیر فەخامەتی وەکیلی مەندوبی سامی‌و وەکیلی رەئیس ئەلوزەرای عیراق رۆژی جومعە ١٩٣٠/٨/٨ لە بەغدادەوە تەشریفیان هینایە کەرکوك‌و لە عەینی رۆژدا لە قشلەدا عمومی

[٤٦] الجهاد، ع٢٢٤، ١٩٣٠/٨/١٦

ئەشراف و ئەعیانی کەکوک و روئەسا گەورەکانی ئەو لیوایە کە هەمو کوردن کۆیان کردەوە لە دوای بەستنی کۆمەلەکە رەئیس ئەلوزەرا هەلسا ئەو بەیانەی کە هەمو کوردیك خویندویەتیەوەو لە پیشا نەشر کرا بو و کو گۆیا حکومەتی عیراق قەراری داوە بۆ کوردەکان موقەرەراتی عیصبەتول ئومەم تەطبیق بکات خویندیەوەو لە عەقەبی ئەوەوە فەخامەتی مەندوبی سامیش هەلساو نوطقیکی خویندەوەو تەئیدی بەیانەکەی حکومەتی عیراقی کردو فەرموی ئیمەش لەگەڵ عیراقا موتەحدین بۆ تەطبیقی موقەرەراتی عیصبەتول ئومەم.

لە دوای ئەمانە عەبدوللا صافی ئەفەندی یەعقوبی هەلساو گوتی: لەم بەیاناتە زۆر موتەشەکیرین ذاتەن ئەم لیوایە عیبارەتە لە تورك و عەرەب یەعنی نفوسەکەی صەد هەزاری لەم دو عونصورەیەو ئیمە عیراقین لە وەحدەتی عیراق جیا نابینەوە. مصطەفا ئەفەندی برایشی عەینەن تەئییدی قصەکەی کاکی کردەوە. بەلام ئیتر لە حاضرون و لەو هەمو قەلەبالغە غەیری فارس ئاغای بەیاتی نەبێ کە پیاویکی عەرەبەو شیخ محەممەد حەبیب ئەفەندی طالەبانی نەبێ کە چونکە کە قاضیو مەئمورەو مەجبورە کەسیکی تر تەئییدی نەکردنەوەو، حەتتا چونکە قسەکانی عەبدوللا صافی ئەفەندی هەموی عیبارەت بو لە بەیاناتیکی غەیرە حەقیقی و بە ئاشکرا مەوجودیەتیکی ئەکثەریەی کوردی پەنهان کرد، وەطەنپەروەرو جەوانمەردی غەیوری کورد محەممەد بەگی جاف مەندوبی پیشوی کەرکوك، هەلسایە سەر پێ و بە هیمەتیکی مەردانەو بە دەنگیکی بەرز فەرموی: ((لیوای کەرکوك ئەکثەریەتی عەظیمەی کوردن یەعنی لە ١٥٠ هەزار نفوس ١٢٠ هەزاری کوردیکی خالیصە. ئینجا ئەگەر بە زیادەوە حسابی بکەین ئەوی تری ئینجا تورك و عەرەبن و ئەم قسەیەی منیش مەعلوم و ئاشکرایەو فەرموی بەندە کە لیرەدا تەمثیلی عەشیرەتیکی زۆر گەورەی وەکو جاف ئەکەم غەیری ئەمیش روئەسای داودە، زەنگەنە، جەباری، شوان و سائیرە روئەسای کوران کە لەم کەجلیسەدا حاضرن بەندەیان تەوکیل کردوە کە بە ناوی عومومەوە عەرضتان بکەم کە ئەم کوردانە بەیەك وجودو یەك زبان داوای تەطبیقی موقەرەراتی عیصبەتول ئومەم ئەکەن. ئەمە حەقمانەو ئەم حەقەمان ئەوێ و هەتا ئاخری تەعقیبی ئەکەین)).

لەدوای ئەمە عەبدوللا صافی بەگ متەهەویرانە کە خیلافی ئاداب و ئیجتیماعیات بو هەلسا، گوتی: ((ئەم ذاتە بەناوی کیوە قسە ئەکات؟ ئەم جافانە عائیدی سلیمانیە، هەموی دو سالە رەبطی کەرکوك کراوە، با بچیتە سلیمانی داوای حەقی خۆی بکات!)).

لەسەر ئەوە محەممەد جافیش هەلساو جوابی دایەوە: ((من بە ناوی ١٥٠ هەزار جافەوە قسە ئەکەم. من کوردم، کورد ئەژیم و بەکوردی ئەمرم. ئەم مەملەکەتە کوردە،

لەبەر ئەوە هەمو کوردیك حەقی هەیە لە مەملەکەتی کوردانْدا طەلەبی حقوقی میللەتی وەطەنەکەی بکات)).

حەقیقەتەن خوینی کوردایەتی بە ئاشکرا لە دەمارەکانیا جەوەلانی ئەکرد. لەو ئەثنایەدا جەعفەر پاشا هەلساو روی کردە محەممەد جاف، گوتی: ((بە شەرەفی حکومەتو خۆم تەئمینت ئەکەم کە بە تەواوی موقەرەراتی عیصبەتول ئومەمتان بۆ تەطبیق ئەکریٚو ئەم لیوایەش ئیستیفادەی لی ئەکات)).

محەممەد جافیش لە جوابا گوتی: ((سا باشە تەشەکورتان ئەکەم!)).

لەو ئەثنایەدا سەید ئەحمەد ئەفەندی خانەقاو سەید محەممەد ئەفەندی جەباریو سائیری روئەسا موحتەرەمەکانی کورد عەلەنەن هەلسان تەئییدی محەممەد بەگی جافو حقوقی کوردیان داوا کردەوە. بەم نەوعە موناقەشەکە دوایی هاتو کۆمەلەکە بلاو بونەوە.[٤٧]

## {} بە درۆ خستنەوە: بروسکەیەك لە توزخورماتووەوە رۆژنامەکانی الجهاد، البلاد

ئەو بەیاناتەی لەلایەن فەخامەتی سەروەزیرانو مەندوبی سامیەوە دەربارەی مەسەلەی کورد لە کەرکوك دراوە ئەوەیە کە بە گشتی ئەمانەویٚ، لەسەری موافیقینو پشتیوانی ئەکەینو دەس ئەگرین بە عەرشی مەلیکی خۆشەویستمانەوە.

رەئیسی عەشیرەتی بەیات، حارس. رەئیسی داودە، رەفعەت.[٤٨]

## {} ملاحظیە المطبوعات

وەفدی وەزاری رۆژی ١٩٣٠/٨/٨ گەیشتە کەرکوك لە فرۆکەخانە پیشوازی کران، ئەشرافی لیواو وجەهاو زوعەمای سەعات دەی بەیانی بانگ کران بۆ دیوانی موتەصەرریفیەت. بەیانەکە خویندرایەوەو رستە بە رستەی کرا بە کوردی. وەفدەکە رو ئەکاتە سلیمانی. ئەهالی بە ارتیاحو ابتهاجی تەواوە پیشوازییان کردنو، زۆر بە گەرمی دلسۆزییو بەسترانەوەی خۆیان بە عەرشی هاوەن شکۆوە دەربری.[٤٩]

---

[٤٧] ژیان، ژ٢٥٧، ١٩٣٠/٨/١٤

[٤٨] الجهاد، ع٢٦٦، ١٩٣٠/٨/٨

[٤٩] الجهاد، ع٢٢٧، ١٩٣٠/٨/١٠

## {} زیارەتی هەولیر:

ڕۆژی شەمەی ١٩٣٠/٨/٩ لە کەرکوکەوە تەشریفیان بردە هەولیرو لەویش لە سەعات دەی ئینگلیزی‌دا لەسەرا لە مەقامی موتەصەرریفی‌دا ئەشرافو ڕوئەسای عەشائیرەکان کۆبونەوە، لە دوای کۆبونەوە ڕەئیس ئەلوزەرا ئەو بەیاناتەی کە لە کەرکوکیش خویندبویەوە بەیانو خویندیەوەو فەخامەتی مەندوبی سامیش هەلساو نوطقیکی خویندەوەو بەیاناتەکەی ڕەئیس ئەلوزەرای تەئیید کردەوە.

لە دوی ئەمانە جەنابی ئەحمەد ئەفەندی ئەعیانو وەطەنپەروەری غەیوری کورد هەلسا فەرموی: لە پیش ئەمەدا قسە بکەین ئیجاب ئەکات ڕوئەسای عەشائیر فکری خۆیان بەیان بکەن چونکە ئەوانیش مەضبەطەیان تەقدیم کردوە.

مەندوبی سامی فەرموی: باشە.

لەسەر ئەوە ڕوئەساکان گوتیان بە عمومی جەنابی خضر بەگی ئەحمەد پاشای، لە ڕوئەسای دزەییمان کردوە بە وەکیلو موما ئیلەیهی هەلسا گوتی: ئیمە هەمو عەشائیر موتەفیقەن تەئییدی مەطالیبی ئەهالی سلیمانی ئەکەین. ئیمە لەگەڵ سلیمانی‌دا ئەژینو ئەمرین!. یەکیکین. ئیستیرحام ئەکەین ئەم سێ لیوایە کەرکوک، سلیمانی، هەولیر نابێ لەیەك جیا بکرینەوە، هەرچی بە سلیمانی بدرێ ئەبێ ئیمەش ئیستیفادەی لی بکەین.

لە دوای ئەمە جەنابی ئەعیان ئەحمەد بەگ هەلسا فەرموی: ((ئیمە کوردینو حقوقی خۆمان ئەوێ بەندە چەند سالە لە خدمەتی حکومەتامو تیگەیشتوم کە کورد بە عمومی لەسەر حقوقی خۆی ئیصرار ئەکاتو ئەم حەقە بە قەراری عیصبەتول ئومەم دامەزراوە پیویستە بماندریتێ)) وە لەسەر ئیعتیراضو تەئثیری جەعفەر پاشا خیطابەن بە جەعفەر پاشا گوتی: ((پاشا تۆ بۆ عەرەبەکان دو پەنجەت دانا ئیمەش حەقی خۆمانە لە ڕێی ئەم حەقە میللیەمانا ڕۆحی خۆمان فیدا کەین. کەس حەقی عیتابی نیەو قەراری عیصبەتول ئومەم ئەوەیە: لوغەتی کوردی ڕەسمیی بێ. ئیمە بۆ ئەم حەقە موصیررین)).

وە لە پاش ئەم گفتوگۆیانە ئیسماعیل بەگی ڕەواندوزی هەلسا گوتی: ((پاشا ئیمە لەم قسە بروپوچانە تیر بوین. بەحثی موستەقبەل ئەکەین. موستەقبەل هەم سبحەینێ هەم دە سالی تر وەها ئاخری هەر موستەقبەلە ئیمە حالەن تەطبیقی قەراری عیصبەتول ئومەممان ئەوێ. وە فەورەن ئەبێ لیوای دهۆك تەشکیل بکرێ. میللەت بە ئارەزویەکی قەطعی ئەم طەلەبە ئەکات)).

لە پاشا مەعروف بەگ جیاوك هەلسا گوتی: ((وا ئەزانی جەنابی فەخامەتمەئاب وەکیلی موعتەمیدی سامی موساعەدە ئەفرەمویٚ دو قسە بکەم. بەندە عەرضیك و سوئالیکم هەیە: ئەو بەیانەی کە جەعفەر پاشا خویندیەوە دو شتی تیگەیشتم ١- طەلەبی وەحدەتی عیراقی - کوردو عەرەب. ٢-عەدەم ئیمکانی تەئییدی حقوقی کوردان بە ماددەیەکی خاص لە موعاهەدە. (لە پیش جواب دانما جەنابی مەندوبی سامی فەرموی: کە بەعضیٚ مەحافیل وا ظەن ئەکەن کە ئیمە تەشویقی بەعضیٚ کەس ئەکەین و ئەگەر کەسیکی وا بیٚ و بیتە دارەل ئیعتیمادو لە دوایی‌دا لە خۆیەوە قسەیەکی وای کرد بیٚ رەدی ئەکەینەوە ئیمە لەگەڵ حکومەتی عیراق یەکین) بەندە لەسەر ئەم فەرمودەیەی ئەلیم ئەبیٚ فەخامەت پەناه و جەعفەر پاشا چاك بزانن بەندە کوردم و هەمو کوردیکیش وەکو من تابیعی هیچ تەئثیریٚ نیە. میللەتی کورد بە سائیقی ویجدانی قسەو ئیددیعای حقوقی ئەکات. بەلی زۆر دەفعە بەعضیٚ کەس و بەعضیٚ لە گەورەکان و کە ئیستا لە مەواقیعی گەورەدان، تەئەددوب ئەکەم لەم مەجلیسەدا ناویان بینم روبەرو بە منیان ئەگوت ئیوە بە پەنجەی ئەجنەبی ئەم طەلەبە ئەکەن)).

مەندوبی سامی پرسی: ((ئەجنەبی کیٚیە؟)).

((ئەجنەبی یەعنی ئیوە: ئینگلیز! وە دەلیلم ئەوەیە کە پار ساڵ ئەم جەمال بابانە کە دانیشتوەو کە وەزیرە بە مەضبەطە داوای حقوقی میللی کردبو دیسان بەم تەرحە ئیهتیمامیان ئەکرد. بیینەوە سەر حقوقمان. جەنابی فەخامەتمەئاب وەکیلی مەندوبی سامی چاك ئەیزانیٚ کە حکومەتی بەریطانیا بە شەرەفی خۆی تەعەهودی کرد بو کە موقەرەراتی عیصبەتول ئومەم تەطبیق بکات ئیستا هەمو کوردیك مونتەظیرو ئەمینە کە حکومەتی بەریطانیا تەعەهودی خۆی دینیتە جیٚ. زۆر ئارەزو ئەکرا کە جەعفەر پاشا لەباتی ئەو کاغەذەی لە جانتاکەی دەری ئەهینیٚ، موقەرەراتی عیصبەتول ئومەمی لەگەڵ خۆی بهینایەو عەلەنەن بیخویندایەوە کە هەمو کەس تیٚ ی بگەیشتایە. مەعە مافیقی بەندە بە نەظەریکی حقوقی خویندومەتەوە، جەمال بابان و جەعفەر پاشایش چاك ئەیزانن کە من حقوقیم (لەسەر ئەمە جەعفەر پاشا و مەندوبی سامی و موفەتیشی ئیداری دەستیان کرد بە سرکە سرك و موفەتیشی ئیداری چوە دەرەوە) موقەرەراتی عیصبەتول ئومەم چیە؟ ١-ئەبیٚ مەئمورەکانی کوردستان لە عونصوری کوردی بن. ٢-لوغەتی کوردی رەسمیی بیٚ)).

لـەم ئەثنايـەدا موفەتيشـى ئيـدارى گەرايـەوەو لـەناو فايليكيـا موقـەرەراتى عيصبەتول ئومەمى تەسليمى مەندوبى سامى كرد، ئەويش فەرمووى ئەمە موقەرەراتى عيصبەتول ئومەم.

مولاحەظە: لەپيش ئەمەدا جەعفەر پاشا موصيررەن ئەيگوت نالى مەئمورەكانى كورد لە عونصورى كورد بن، ئەلى هەر كوردى بزانن.

مـەندوبى سـامى خويندنيـەوەو تەرجومـە كـراو مەعلـەم بـو كـە ماددەكـە ئـەلى مەئمورەكان لە عونصورى كورد بن.

لەسـەر ئـەوە ئەحمـەد ئەفەندى هەلسا فـەرمووى: ((ئەمـە تـەئويلو تەفسير قوبولْ ناكات چونكە صەريحەو مەعلومە)).

لەو وەقتەدا جەعفەر پاشا نەختيك شلەژاو مەوضوعيان گۆرى فەقەط جياووك دەوامـى كـرد گوتـى بـە مـەندوبى سـامى: ((وا ئـەزانم فەقـەرەى ئـەخيرى قـەرارى عيصبەتول ئومەم ئەلى: «ئەگەر تەبديليك لە حكومەتى عيراقا بو ئەبىَ حوكميكى ذاتى بە گويرەى رەغائيبييان بدرىَ بە كوردەكان»)).

مـەندوبى سـامى فـەرمووى: ((دوينـىَ ئـەم قسـەيەم لـە كـەركوكيش بيسـت. ماددەيەكى وا نيە)).

جياووك جوابى دايەوە: ((لە نيهايـەتى لائيحـەى هەيئـەتى عيصبـەتول ئومـەم لـە سەطرى ئەخيريا ئەم ماددەيە مەوجودە. بەندە تەدقيقم كردوەو مەنظورى عاليشت بوە)).

مـەندوبى سـامى: ((بـەلى! ئـەم لائيحەيـە لـە طـەرەف عيصبـەتول ئومەمـەوە تەصديق كراوەو بلاوكراوەتەوەو، شكلى قەرارى وەرگرتوە)).

لە دواى ئەمانە جياووك هاتەوە سەر ئەصلى مەوضوع گوتى: ((وەكو عـەرضم كـردن بەياناتەكـەى جەعفـەر پاشـا دو شـتى تيايـە: ١-ئيتيحـادى كـوردو عـەرەب.

جەعفەر پاشا چکی ئەزانێ ئیمە لەگەڵ عەرەبا مومکین نیە بە صورەتی تەوحید – جیاووك پەنجەکانی خستە نا یەکترو گوتی بەم صورەتە – بژین. فەقەط بە صورەتیکی – ئەمجارە پەنجەکانی جوت کرد کوتی – قابیلە بەم نەوعە وەکو ئاوستریاو مەجەرستان بژین. هەمو کەسیك ئەمەی ئیدراك کردوەو میللەت لە حالی ئینتیباه دایە. لەپاش ئەمە جەریدەکانی بەغداد هاوار ئەکەن ئیمە عەرەبین و حکومەتمان عەرەبە. ئەبێ کوردەکان وەکو ئەرمەنیەکان لی بکەین. ئیتر مومکین نیە پیکەوە بژین)).

لەسەر ئەمە جەعفەر پاشا بە تەهەورەوە گوتی: ((من قسەت نادەمێ و حەقت نیە ناوی عەرەب بینێ!)).

جیاووك: ((پاشا من قسەم لە مەندوبی سامی سەندوە. بەندەیش بە قەدەر تۆ عەرەبەکان تەقدیس ئەکەم. فەقەط کوردمو، کورد حەقی خۆی ئەوێ. وا دیارە ئەم جەرائیدانە بە رەضای حکومەت ئەنوسن وە ئیللا ئەباویە تەعطیل بکرانایە. بیینەوە سەر ماددەی دوەم، تەناقوضیکی ظاهیریی لەو قسەیەی جەعفەر پاشادا هەیە، چونکە لە جیهەتیکەوە ئەلی بۆ ئەم حقوقە موغایری ئوصولە مادەیەك داخلی موعادەکە بکرێ. بەندە ئەلیم بە نەظەریکی حقوقی مومکینە ماددەیەك داخلی معاهدەکە بکریت کە ئەو مادیە بە قانونیکی خاص حقوقی کوردەکان تەئمین بکات. لەمەدا مانیع چیە؟ خولاصە هەمو کوردیك مونتەظیری تەطبیقي موقەرەراتی عیصبەتول ئومەمە)).

بەم نەوعە خیتامی بەیاناتی جیاووك هات و، حاضرون بە عمومی بێ ئیستیثنا فەرمودەی جیاووکیان تەئیید کردوەو مەجلیسەکە دوایی هات و بڵاوبونەوە.[٥٠]

[٥٠] ژیان، ژ٢٥٧، ١٤/٨/١٩٣٠

{} **زینەلعابدین مەحمود، خەلکی هەولیر:**

**هەندێ کەس لایان وایە ئەهالیی هەولیر داوای مەسەلەی کورد ئەکەن، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە خۆیان بە بەشێ لە مەسەلەی کورد دانانین چونکە دلنیان لە ئەنجامی ئەم جولانەوەیەی کارەساتی بە دوادا دێ‌و نمونەیەکی بۆ قسە بە ناوبانگەکەی: ((فرق تسد)).[٥١]**

{} **تەشریف هینانی فوخامەتی مەندوبی سامی‌و ڕەئیسەل وزەرای عیراق**

**موافیقی تەلغرافێ کە ڕەسمەن بۆ مەقامی موتەصەرریفی هاتوە، ڕۆژی ١٩٣٠/٨/٩ کە تەصادوفی ئەم شەمەیە ئەکات فەخامەتی مەندوبی سامی‌و ڕەئیسەل وزەرای عیراق تەشریف ئەهیننە سلیمانی.[٥٢]**

---

[٥١] الجهاد، ع٢٦٦، ١٩٣٠/٨/٨

[٥٢] ژیان، ژ٢٥٦، ٧ی ئاغستۆسی ١٩٣٠

{} بەياننامە

ئەم میللەتی کورد!

بە دیققەتەوە گوێ بگرن، ویجدانی میللی، ڕۆحی پیشینان و پاشینان خیطابتان ئەکاتێ. داوای تیکوشین و تیهەلچونتان لی ئەکات.

ئەی کورد!

لەم عەصری میللەت و ئازادیەدا، لەم عەصری نورو سەربەستیەدا تەنها هەر کوردی بێ چارە ذەلیل و بێ بەش ماوەتەوە، وەطەنی کورد وەك مالی مناليمی نابالق بەسەر بیگانەدا دابەش کراوە.

مەعلەمی هاوخوینە خۆشەویستەکانمانە لەم چەندانەدا موعاهەدەیەك لە بەینی حکومەتی بەریطانیا و عیراقدا بەستراوە هەرچەنەدە موافیقی موقەرەراتی عیصبەتول ئومەم و سائیری وعودی بەینەلدوەلی ئەبوایە مەسئەلەی کوردستان بخرایە ئەوەل بەندی ئەم موعاهەدەیە، فەقەط بە کەمالی تەئەسسوف و تەعەجوببەوە ئەبینین کە ئەمە هاتوە کە لەو حالەدا لازمە عیصبەتول ئومەم لە خصوص کوردەکانەوە حەرفییەن تەطبیق بکرێ.

بینائەن عەلەیهی ئیمە بە پشتیوانی ئیوە هەتا ئیستا بە وەسائیلی موختەلیفە بۆ موحافەظەی حقوقی کورد لە جەهدو موراجەعەت غافڵ نەبوین و هەتا ئاخر نەفەس دەوام ئەکەین. هەدەف و غایەی تەشکیلی حکومەتیکی کوردیە لەژێر نەظارەتی عیصبەتول ئومەمدا. بۆ مەشرعییەتی ئەم طەلەبە دو دەلیلی غەیرە قابیلی ڕەدمان بە دەستەوەیە:

١- قەراری عیصبەتول ئومەم صەراحەتەن ئەلی: وەقتێ کە ئینتیداب نیهایەتی هات ئەبێ بۆ کوردەکان موافیقی ڕەغائیبی خۆیان حکومەتیکیان بۆ تەشکیل بکرێ.

٢- بەیانیکی ڕەسمیی موشتەرەك کە لە ڕۆژی ٢٤ی کانون ئەوەلی ١٩٢٢دا لە طەرەف حکومەتی بەریطانیا و عیراقەوە نەشر کراوە، ئەم بەیانە بەر وەجهی ئاتیە:

حکومەتی صاحیب جەلالەتی بەریطانیاو حکومەتی عیراق ئیعتیراف ئەکەن بە حقوقی ئەو کوردانەی لە داخلی حدودی عیراقا ساکنن، بۆ تەشکیلی حکومەتیکی کوردیە لە داخلی ئەو حدودەداو حکومەتی بەریطانیا و عیراق ئومیدیان هەیە کە عەناصیری کوختەلیفەی کورد لە بەینی خۆیاندا ڕێ ئەکەون بۆ خصوص حدودو شکلی ئەو حکومەتە کوردیەو بۆ ناردنی موفاویضینی مەسئول بۆ بەغداد کە

موذاكەره بكەن لەبابەت موناسەباتی ئیقتیصادیەو سیاسیەیانەوە لەگەڵ حكومەتی ئینگلتەرەو عیراقدا.

ئەی میللەتی نەجیب!

پاش ئەم تەفصیلاتە ئیخباریان ئەكەین كە رۆژی یەكشەممە ١٠ی ئاغوستوسی ١٩٣٠ مەندوبی سامیو رەئیسەل وزەرای عیراق بۆ موذاكەرە كردنی ئەم مەسئەلەیە دین بۆ سلیمانی. قەناعەتی تاممەمان هەیە كە هەمو كوردەواری یەك دڵو یەك زبان لە طەلەب كردنی ئەم حەقە مەشروعەدا پشتیوانمانن.

ئەی كور!

تاریخ لاپەرەكانی كردۆتەوە حەرەكاتمان تەسجیل ئەكات، موحافەظەی شەرەف رابوردو و ناموسی ئایندەمان بە دەست نەسلی حاضرەیەوە. ئێوەش خۆتانو عیرەتتان.

عەزمی بابان. عەبدولقادر حەفیدزادە. حەمە ئاغا عەبدورەحمان ئاغا. عیززەت عوسمان پاشا. حەمە صالح محەممەد عەلی بەگ. شێخ محەممەد گوڵانی. عەبدورەحمان ئەحمەد پاشا. فائیق بابان. تۆفیق قەزاز. رەمزی حاجی فەتاح.

## {} سەردانی وەفدی وەزاری بۆ سلیمانی

لە دوای تەواو بونی موناقەشەو موجاهەدەی هەولیر، فەخامەتی مەندوبو رەئیسەل وزەراو هەیئەتەكە روەو سلیمانی تەشریفیان هینا. ١٩٣٠/٨/١٠ لە سەعات ٣ی كوردیدا كە میعادی هاتنیان بو عومومی روئەسای دەوائیرو مەئموران و عولەماو ساداتو ئەشرافو روئەسای عەشائیر كە بیلعموم لە سلیمانیدا حاضر بون. چون بە پیریەوە. لە جادەی دەباخانە لەو رەشماڵانەدا كە بەلەدییە هەلی دابو دانیشتن، غەیری ئەمانیش طاقمیك عەسكەری جەیش دور لە ئەهالییەكەوە وەستا بون. كەششافەی مەكتەب، قوتابی مەكتەبەكان، بیلعموم ئەهالی شار هەمو طەبەقەیەكی حاضر بو بو. دوكانو بازار چۆڵ كراو قیسمی ژنانیش لە دەباخانەوە هەتا قاپی (سەرای) حكومەت كۆمەڵ كۆمەڵ وەستا بون. فەخامەتی مەندوبی سامیو هەیئەتەكە لە سەهات دوی عەرەبیدا مواصەلەتی چەمچەماڵ ئەكەنو لەویش هەمو ئەهالیو روئەسای عەشیرەتی هەمەوەند لەسەر جادە وەستا بون. كە تەشریفیان گەیشتە ئەوێ هەمو بە دەنگی بەرز هاواریان كردو داوای حقوقی كوردایەتییان كرد بو. لە دوای ٣٠ دەقیقە ئیسراحەت لە چەمچەماڵەوە حەرەكەتیان كردو ذاتەن سەعادەتی موتەصەرریفو موفەتیشی پۆلیسو مودیری پۆلیس بە ئۆتۆمۆبیل لە بەیانییەوە

بەرەوپیریان رۆیشت بون. لە سەعات چوارونیوی کوردیدا گەیشتنە سەرجادەی دەباخانە. لە دوای ئەوەی لەلایەنی عەسکەرەکەوە بە سەلام بەخیرهاتنیان کرا هاتە بەردەمی ئەو عەشاماتە زۆرەوە کە بێ حەددو حساب راوەستا بون کە لە ئۆتۆمۆبیلەکە دابەزین بە کەرەتی دەست کرا بە چەپلەریزانو هەر بژی کوردو کوردستانو بە کەرەتیك هاوار ئەکرا کە بە قەطعی تەشکیلی حکومەتی کوردیمان ئەوێ. لەو وەقتەدا قوتابیەکی مەکتەب بە جلی کەششافەوە هاتە بەدرەمیانو خیطاب بە مەندوبی سامی نوطقیکی ئینگلیزی خویندەوە کە لە خوارەوە دەرج کراو نوقطەکە بە چەپلە لیدانو هەر بژی حکومەتی بەریطانیا و کوردستانو هەر بژی فەخامەتی مەندوبی سامی موقابەلە کرا. لە دوای ئەمانە بە ئۆتۆمۆبیل هاتنە ناو شارەوە. لە ریگا لە هەمو نوقطەیەکدا ژنەکان لە کۆلانو سەربانەوە هاواریان ئەکرد: هەر بژی کوردو کوردستانو حکومەتی کوردیمان ئەوێ.

وەکیلی فەخامەتی مەندوبی سامی تەشریفی بردە مالی موفەتیشی ئیداریو وەکیلی رەئیسەل وزەراو وەزیری داخلییە لە مالی موتەصەرریفو وەزیری عەدلیە لە مالی بابان عەزمی بەگ میوان بون.

ئەو قەلەبالغییە هەتاکو ئیوارێ لەبەر دەرکی سەراو جادەکانا مایەوەو، موتەمادی هاواریان ئەکرد: حقوقی کوقەددەسی خۆمان ئەوێ. ئەو رۆژە وا دەوامی کرد. هەر شەو تەرتیبات کرا بۆ موذاکەرە. تەذکەرە نوسرا بە شوین ئەشرافو روئەسای عەشائیردا. سبەینێ سەعات دوی کوردی هەمو لایەك لە مەقامی موتەصەرریفدا کۆبونەوە. دیسان بازار داخراو ئەهالی روی کردە بەردەمی سەرای حکومەتی. طەلەبەی مەکتەبو هەمو ئەهالی لە حالیکی مونتەظەمدا وەستا بون کە فەخامەتی مەندوبی سامیو هەیئەتەکە تەشریفیان هینایە سەرا لە بەردەمی تەلخانەدا بە کەرەتیك چونە بەدرەمی ئۆتۆمۆبیلەکەیەوەو بە کەرەتێ هاواریان ئەکر: حقوقی میللیەمان ئەوێو ئەبێ حکومەتی فەخیمەی بەریطانیا بۆمان تەئمین بکات.

حاصلی بەم نەوعە داخلی سەرا بونو چونە مەقامی موتەصەرریفیو لەوێدا هەمو لایەك کۆبونەوە. ئەوەڵ جار لە طەرەف رەئیسەل وزەراوە ئەو بەیانەی کە لە پیشا لە جەریدەکانا نەشر کرابو و خوینرایەوە. لە دوای ئەو فەخامەتی مەندوبی سامییش هەلسا ئەو بەیانەی کە لە کەرکوكو هەولیر دابویان عەینەن خویندییەوە.

لە خیتامی ئەمانەدا، جەنابی حەمە ئاغای عەبدورەحمان ئاغا هەلساو، فەرموی: ((جەماعەتی حاضرە کە تەمثیلی هەمو ئەشراف، سادات، عولەما، عەشائیری لیوای سلیمانیو قسمیك لە لیوای کەرکوك ئەکات بە عمومی رەمزی ئەفەندییان تەوکیل

کردوه کە جوابی بەیاناتی فەخامەتی مەندوبی سامیو ڕەئیسەل وزەرا بداتەوەو طەلەبی حقوقی میللیەمان بکات)).

لەدوای ئەمە ڕەمزی ئەفەندی هەڵساو گوتی:

((فەخامەتمەئاب!

بەناوی عمومی ڕوئەسای عەشائیرو ئەشرافی کوردەوە عەرضی بەخێرهاتنتان ئەکەم. میللەتی کورد تەشریف هێنانتان بۆ حەیاتی حورییەتو موستەقبەلەی خۆیان بە فەئلێکی خێر عەدد ئەکات. بەیاناتی ڕەئسەل وزەراو مەندوبی سامی کوللیەن موخالیفی موقەڕەراتی عیصبەتول ئومەمو ئیعتیرافاتی فەخیمەی بەریطانیاو عیراقە. لە پێش هەمو شتێکدا ئەبێ اطاعەی حقوقی موقەددەسەو ئیستیقلالی کوردان ببێ بە سەبەبی ئیتیحادی عونصوری کوردو عەرەب.

لای فەخامەتمەئابتان مەعلومە کە کوردەکانی کوردستانی جنوبی لە ئەثنای حەربی عمومیەوە تا ئەمڕۆ بۆ تەئمینتی حورڕیەتو ئیستقلالی خۆیان لە سەعی دوانەکەوتونو بۆ ئەم غایە موقەددەسە دائیمەن ئیلتیجایان بە موعاوەنەتی موشفیقەی حکومەتی فەخیمەی ئینگلیز کردوە، مەعەل ئەسەف تا ئەمڕۆ نائیلی ئامالیان نەبون گەرچی لەم خصوصەوە گەلێ مەواعیدیشیان دراو، بە عیصبەتول ئومەمەیش ئەم مەواعیدانە تەئیید کرا لاکین تا ئەمڕۆ هیچیان بۆ تەطبیق نەکرا.

مەعلەمی فەخامەتتانە ئەوەڵ موعاهەدەی حکومەتی عیراقو ئینگلیز لە تاریخی ١٠ی تشرینی ئەوەلی ١٩٢٢دا تەصدیق کراوەو لەپاش ٧٤ ڕۆژ لە تاریخی ٢٤ی کانونی ئەوەلی ١٩٢٢ بۆ تەشکیلی حکومەتی کوردیە لە بەینی حکومەتی فەخیمەی بەریطانیاو عیراقدا ئەم بەیانە نەشرو ئیعلان کرا بو. مادامکە ئەصڵ عیصبەتول ئومەم ئینتیدابی عیراقی داوە بە ئینگلیزو لە قەراری ئەم ئینتیدابەدا کوتویەتی هەچ وەقتیک عیراق صالح بێ ئیستیقلالی ئەدریتێ لەهەمان کاتیشدا پیویستە حکومەتیکیش بۆ کوردەکان تەشکیل بکرێ. حقوقەن وا لازم بو کە لە پیش تەنظیمی موعاهەدەی تازەی ئینگلیزو عیراقدا، کە تەئییدی قەراری عیصبەتول ئومەمو ئیستیقلالی حکومەتی عیراق ئەکات، حکومەتیکیش بۆ کورد بە صەراحەت بخرایە مەتنی ئەم موعاهەدە تازەیەوە. لەمەشدا ضەربە لە حکومەتی کوردەکان درا.

لای فەخامەتتان مەعلومە کە حکومەتی عیراق کوردەکانی بە قوەتی تۆپو تفەنگ ئیستیلا نەکردوە لە عەقەبی موتارەکەدا کوردەکان بەو شەرطە خۆیان خستە حەلقەی رابیطەی ئینگلیز کە حکومەتیکی کوردیەی موستەقیلمان بۆ تەشکیل بکرێو، لەسەر ئەمە ئیتیفاق واقیع بوە کەوا لازمە چۆن عەرەبەکان لە قەراری

عیصبەتول ئومەم موستەفید کراون کوردەکانیش موستەفید بکرین کە  طەلەبی هەمو کوردەکان: تەشکیلی حکومەتیکی کوردیە لەژیر ئینتیدابی حکومەتی فەخیمەدا)).

رەئیسەل وزەرا: ((من لەو بەیاناتە زیاتر کە لە پیشا بۆم خویندنەوە صەلاحییەتم نیە بە صورەتی رەسمیی گفتوگۆیەك بکەم. وا فەخامەتی مەندوب قسەتان لەگەلا ئەکات)).

لەسەر ئەمە فەخامەتی مەندوبی سامی هەلساو ئەم بەیانەیدا:

((لە خوطبەی رەمزی ئەفەندیدا دو نوقطەی موهیم هەیە: ۱-بەیانی ۱۹۲۲و، ۲-موقەرەراتی عیصبەتول ئومەم. بەیانی ۱۹۲۲ هەروەك رەئیس وزەرا وتی وەختی خۆی لەلایەن حکومەتی  بەریطانیا جواب دراوەتەوە، لەم کاتەدا حەظ ناکەم لەسەر ئەم مەوضوعە موناقەشە بکەم. دوەم، موقەرەراتی عیصبەتول ئومەم. بەلای منەوە تەوصیاتی عیصبەتول ئومەم تەطبیق کراوەو  من موتەئەسیفم ئەگەر ئەم تەوصیاتە شکینرابێ، فەقەط تەقدیری تەنفیذو عەدەم تەنفیذی ئەم موقەرەراتە بە دەست عیصبەتول ئومەم خۆیەتی. حکومەتی بەریطانیاو عیراق هەردولا هەولْ ئەدەن بۆ تەنفیذی موقەرەراتی عیصبەتول ئومەم. عیصبەتول ئومەم ئەگەر بینی موقەرەراتەکەی تەطبیق نەکراوە موداخەلە ئەکات)). وە گوتی: ((بەعضێ کەس موراجەعەتیان کردوە بە عیصبەتول ئومەمو جوابیان وەرگرتۆتەوە کە بە  تەوەسوطی حکومەتی مونتەدەبەوە ئەبێ موراجەعەت بکرێو ئیستاکە عەیتی موراجەعەت  بە من کراوە. من لەم خصوصەوە موفەصەلەن لەگەلْ حکومەتی عیراقدا موذاکەرە ئەکەم. لەم قسانە کەس وا تێ نەگات کە مەقصەدی من مانیع هینانە پیشەوە بۆ موراجەعاتی خەلقی. هەمو کەس سەربەستە لە موراجەعەت کردن. فەقەط لازمە مەطالیبو تەصریح بە تەفصیل بەیان بکرێ. تەشکیلی حکومەتیك لیرەدا موشکیلە... ئایا قابیلە کوردستان ئەم حکومەتە بتوانێ رابگرێ؟ ئەمەوێ بزانم رەمزی ئەفەندی تەمثیلی سائیری کوردستان ئەکات یا هەر سلیمانی؟)).

رەمزی ئەفەندی: ((مەضبەطەی هەولیر مەعلومتانە. ذاتەن لەوێ بە خۆشتانیان وتوە کە رەئیسمان لەگەلْ خەلقی سلیمانیە. قیسمیك لە عەشائیری کەرکوك وا لەم مەجلیسەدا حاضرن. ئەوانیش هەر لەگەلْ ئیمەدانو مەضبەطەی عومومی  عەشائیری کەرکوك تەقدیم ئەکەمو مومەثیلی هەولیریش لیرەدا حاضرە)).

مەندوب: ((چوینە هەولیرو کەرکوك. لەویش مومەثیلی کوردان کۆبونەوە عەینی موناقەشە کرا. فەقەط کەس ئیظهاری جیابونەوەی نەرکرد تەنیا سلیمانی طەلەبی ئیفتیراق ئەکات)).

رەمزی ئەفەندی جوابەکەی سەرەوەی تیکرا کردەوەو، وتی: ((ئەم دو لیوایە لەژیر تەضییق و تەئثیرا بون لەبەر ئەوە حسیاتی حەقیقیەی خۆیان ئیظهار نەکردوە ئەمر بفەرمو بینە ئیرە ئەوسا مەعلومتان ئەبێ کە ئەمە تەئکید ئەکەنەوەو، کوردستان هەموی لە هەمان فیکر دایەو یەك هەدەف تەعقیب ئەکات کە سەربەخۆیی کوردستانە)).

مەندوبی سامی: ((کەوا بو لازمە هەمو لایەك مەطالیبی خۆیان بە صەراحەت و بە تەفصیل بۆ عیصبەتول ئومەم بەیان بکەن.کوردەکان چ جۆرە حکومەتیکیان ئەوێ، مەلەکی یا جمهوری؟ پارلەمان، رەئیسی وزەراو مەجلیسی وزەرایان ئەبێ یا نە؟ ئایا فیکریان بەرامبەر بە مەلیك فەیصەل کۆریوە یان نە؟ ئایا ئەیانەوێ هەرجۆرە... حکومەتی و گومرگ و مەکوس، ئیشغالی عامە، پۆلیس، صیحەو عەسکەریان ببیت؟ ئایا موناسەبات و عەلائیقی حکومەتەکە وا تەشکیل ئەکریت چی ئەبێ لەگەڵ بەریطانیا؟)).

رەمزی ئەفەندی، خیگاب بە مەندوبی سامی گوتی: ((فەخامەتتان فەرموتان کە بەیانی ۱۹۲۲ رابوردو کۆنە. حەق کۆن ئەبێ نامرێ. ئەم بەیانە کافیلی حقوقی موقەددەسەی ئیستیقلالی قەومیکە طەلەبی تەطبیقی ئەکەین)). بەسە. بەسە. بەسە!

حەمە ئاغا: ((ئیمە کوردین و، کوردستان عیبارەت نیە هەر لە سلیمانی. لە زاخۆوە هەتا خانەقین کوردەواریتیە و، نایانەوێ لەگەڵ عیراقدا بژین و، حکومەتیکی موستەقیللەی کوردیمان ئەوێ لەژیر ئینتیدابدا. ئەگەر ئینگلیزیش نامانداتێ موراجەعەت بە عیصبەتول ئومەم ئەکەین)).

خیطاب بە رەئیس وزەرا: فەخامەتتان زۆر چاك ئەیزانن کە حیسسیاتی میللیە بە نەوعیك چۆتە میشکی عونصوری عەرەب و کوردەوە کە هیچ هیزیك نیە مەحوی بکاتەوە، بینائەن عەلەیهی ئیمکانی ژیانیکی موتەحید نیە لە نیوان عەرەب و کوردا و هیچیان ئیستیفادە لە یەکتر ناکەن. بۆ هەردولا وا چاکە کوردستانیك لەژیر ئینتیدابێ عیصبەتول ئومەم چونکە ئەمم ئینتیدابە بە نەوعێ عەرەبەکان ئیستیفادەیان لی کرد کە لە ماوەی ۰ ساڵدا ئەوەتا ئیستیغنا لە حکومەتی ئینگلتەرە ئەکەن)).

خیطاب بە مەندوبی سامی: ((ئەم دەنگی کوردایەتیە تەنها، وەکو جەنابتان ئەفەرمون، مەخصوصی دۆلی سلیمانی نیە. هەولیرو کەرکوك لەژیر تەضییقی

مـەئموریني عـەرەب دان. ئەگـەر بـانگ بكرينـە ئـيرە مـەعلوم ئـەبێ كـە هــەمو غايــە يەكيكە)).

رەئيس وزەرا: ((تەشەكوری بەيانەكەتان ئەكەم. زۆر مەسرورم كە لە قيطعەيەكی عيراقدا ئەهالی لەسەر غايەيەكی وا ئيتيحادی كردوە. لە خصوصـی بـەيانی ١٩٢٢ەوە ئەمـەوێ بـە صورەتـی خصوصيـەوە قسـە بكـەم، چونكـە ئـەوی صەلاحيـەتدار بم بليـم عيبارەتـە لـەو بەبانـەی كـە لـە پيشـەوە عـەرضم كـردن. وەكـو رەمـزی ئەفـەندی ئـەلی موعاهەدەی عيراق و ئينگليز هەرچـەندە لـە ١٩٢٢دا عـەقد كراوە فەقـەط لـە ١٩٢٤دا لـە طـەرەف مەجليسـی تەئسيسـيەوە تـەصديق و حـەقی قـانونيی كەسـب كـردوەو لـەو مەجليسـەدا مومـەثيليني كورديـش هـەبو. زۆر چـاك لەبيرتانــە لــەژير رياســەتی و ئەمارەتی شيخ مەحمودا ئيدارەيەكتان بۆ دامەزرا بو، لە پاشا ئەهالی كەوتە تەظەلوم و شكايەت لە شيخ مەحمود كە ئيستاش دلن پيتان ئەسوتێ كە حكومەتی مـەجبور بـو بە ناردنی ئۆردو. لەپاش ٣ سالْ حەرەكاتی عەسكەرييە ئەوسا وەضعييـەتی بـۆ چـاك كرا. ئەم بەياناتەم بە صورەتی خصوصييە بۆ تەنويری ئيوەيە)).

شيخ قادر: ((شيخ مەحمود فەرديكی ئەم ميللەتەيە. ميللـەتی كورد ئەبـەن عـەن جـەد حورمـەتی شـيخ مـەحمودو سـاداتيان گرتـوە. ظولمـی شـيخ مـەحمود بەقـەدەر ظولمـی عـيراق تـەئثيری نەكردۆتـە سـەر ئيمـە. رەئيـس وزەرا گوريـز ئـەكات. ئيمـە ميللـەتيكی سـەربەخۆين لـەژير ئينتيـدابدا حكومــەتيكی كورديمــان ئـەوێ وەگــەر ناژين)).

رەمزی: ((ئـەم حەقـە بـە ميللـەتی كـورد دراوە. ئەگـەر شـيخ مـەحمود خـەطای كردبێ ديسانەوە ميللـەت قەباحـەتی نيـە. مـەعلومی فەخامەتتانـە خـەطای كەسـيك حقوقی ميللـەتيكی وا مـەحو ناكاتــەوە. شـيخ مـەحمود لەلايـەن دوژمنـانی كـوردەوە ئيغفال كرا بو. مەسئەلەی شيخ مـەحمود تـەئثيری نـەبو بـۆ ئيمحـای ميللـەتمان. بـەلاّم ئيوە ئەتانەوێ بە كەرەتيك بمانكەن بە عەرەب)).

عيززەت بەگ: ((ميللـەتی كورد تەنها عيبـارەت نيـە لـە سليمانی. لـە زاخـۆوە تـا خانـەقين هـەمو داوای ئـەم حەقـە ئـەكات و هيچ كورديـك كـەرەتيكی تـر لەگـەلْ عيراقـا نـاژی. بـۆ ئيحقـاقی حـەقمان موراجەعـەت بـە حكومـەتی مونتەدەبـە ئەكـەين. ئەگـەر ئـەويش نەيپرسـی، شـكايەت ئەبەينـە بـەر عيصبـەتول ئومـەم. كـورد حكومــەتيكی موسـتەقيللەی ئـەوێ لـەژير ئينتيدابدا. بەهــەمو هيزمانـەوە بـۆ ئـەم غايەيـە سـەعی ئەكەين، ئەمجارە سيلاح و تفەنگمان قەلەم و موراجەعاتە)).

رەئیس وزەرا: ((لام وایە عونصوری کورد لی عیراقدا لە عونصوری عەرەب مەحتەرەمترو مورەفەهترە. هەرچی مەشەققەتو ئەذییەتە بەسەر عەرەبەکانەوەیە. حقوقی کورد مەحفوظە، یەکێ بلی مەئموریکی عەرەب ظولمی لە کورد کردبێ؟)).

مەجید ئەفەندی حاجی رەسول ئاغا: ((بەلی کورد دائیمەن مەعروضی ظولمی عەرەبەکان بوە. پار کە لە بەینی عەرەبەکانی فەلەستینو سەهیۆنیەکاندا شەر بو عەرەبی عیراق بە یەکجار کەوتنە تەعزییەوە. ئەنواعی موراجەعاتو موظاهەراتیان کرد، کەچی ئیستا هاوخوینو براکانمان لە کوردستانی شیمالی لەلایەن تورکەوە سەر ئەبررین، غەزەتەکانی بەغدا بە ئاشکرا تەقدیری تورکەکان ئەکاتو بەیانی شادمانی دەرئەکاو، بە تۆپو تفەنگو مەترەلۆز تەهدیدی ئیمە ئەکات کە ئەلی لەگەڵ تورکا ئەتان پلیشینینەوەو عەرەب هیچی لە تورك کەمتر نیە. عەلاوەی ئەمەش، لە رۆژی تەشەکولی حکومەتی عیراقەوە هەتاکو ئیستا موتەعەدید موعەللیمتان لە ئەوروپا، ئینگلتەرە، سوریەو جیگاکانی ترەوە تەرتیب کردوەو، هەمو سالیك کۆمەلیکی زۆر قوتابی عەرەب کە بە ئیستیعدادو زیرەکی لە کوردەکان دونترن داخلی بەعثەی عیلمییان ئەکەن کەچی قوتابیە کوردەکان لەسەر مەصرەفی خۆیان ئەچن بۆ بەغدادو غوربەت ئەکیشن بۆ ئەوەی داخلی بەعثە بکرین. بەخۆرایی نومرەیان ئەشکینن‌و دوایان ئەخەن. ئەمساڵ ٥٠ قوتابی کورد کە دائیمەن لەپیش عەرەبەکانەوە بون هەر لەبەر ئەم سەبەبە دوایان خستن)).

رەئیس وزەرا: ((بۆچی ئیوە نازانن کە غەزەتەکانی بەغداد بەیانیو ئیوارێ چەند جنیو بە حکومەتی عیراق ئەدەنو چۆنمان تەنقید ئەکەن. کێ ئەلی غەزەتەکان بە تەشویقی حکومەت عەلەیهی کوردن؟ بۆچی مەعلوم نیو غەزەتە چۆنو بە چ واسیطەیەکەوە شت ئەنوسێ؟ قوتابی وەرەقەی ئیمتیحانیان مەوجودەو کەس ناتوان' خیلافی ئەوە بکات. لام وایە قوتابیەك بێ ئیستیحقاق تەرفیع بکات نە بۆ خۆیو نە بۆ وموجتەمەعی موجیبی ئیستیفادە نابێ)).

مەجید ئەفەندی: ((بەلی غەزەتەکانی بەغداد کە لە عەلەیهی حکومەت مەقالەیەکیان نوسی گورج دای ئەخەن، بەلام کە تەهدیدی کوردەکان بکاتو لە عەلەیهی ئیمە بنوسن تەشویقیان ئەکەنو پارەیان ئەدەنێ)).

حەمە ئاغا: ((هەمو ئەیزانین کە فەخامەتی رەئیس وزەرا شەخصیکی نیشتیمانپەروەرەو بۆ غایەی وەطەنییە زۆر سەعیی کردوە، بینائەن عەلەیهی، ئەبێ

تەقديری ئيمەش بكات و حەقمان بداتێ بۆ حەقيكی مەشروعی وەطەنی و ميللی خۆمان تی ئەكوشين)).

رەئيس وزەرا: ((بەلی هەمو نوعە حيسسياتيكی وەطەنييە بە ئيحتيرامەوە قوبوڵ ئەكەم فەقەط لەم مەسائيلانەدا ئيمە لازمە مەنطيقی و عەمەلی تێ فكرين عەجەبا كوردستان وەكو ئەلين لە خانەقينەوە هەتا زاخۆ جيا بيتەوە بەبێ عيراق ئەژی؟ واريداتی كيفايەت ئەكات؟ بەرامبەر بە دراوسيكانی حدودی پێ موحافەظە ئەكرێ و، خاصەتەن لە نوقطەی تيجارەتەوە لە عيراق زياتر بەندەريكی هەيە؟ بۆ ئوموری نافيعەی كوردستان هەتاكو ئيستا عيراق بە لەكها روپيەی صەرف كردوە)).

رەمزی ئەفەندی: ((يەك دەفعە عەرضمان كردن كوردو عەرەب قابيل نيە پيكەوە بژين. ئيمە ئاريين و ئەوان ساميين، ئيمە شاخيين و ئەوان دەشتەكيين، حەتتا خاكی كوردستان بەرين بۆ عەرەبستان و هی عەرەبستان بهينين بۆ كوردستان هەردوكيان هيزی ئينباتييەيان ون ئەكەن)).

رەئيس وزەرا: ((ئەی توتنەكەتان بۆ كوێ ئەبەن؟)).

رەمزی ئەفەندی: ((ئەيبەين بۆ ئەوروپا. غەيری ئيمەش مەجبورن توتنی ئيمە بكرن چونكە لەمە هەرزانترتان دەست ناكەوێ و، لە ئيمەش زياتر لە بازرگانیدا لەم توتنە ئيستيفادە ئەكەن)).

رەئيس وزەرا: ((نە نايبەن بۆ ئەوروپا هەموی لە عيراقا صەرف ئەكرێ. كوردەكان ئەلحەمدوليلا بازرگانی زۆر وريايان تيايە و زۆر چاك تەقديری ئەكەن كە كوردستان بێ عيراق ناژی)).

رەمزی ئەفەندی: ((لە بيدايەتی حەربی عومومیدا كە ريگا و بەندەرەكانی عيراق گيرا بو كە بەغداديش ئيستيلا كرا ئيمە لەگەڵ شيمال و شەرق و غەرەبدا مونتەظەمەن تيجارەتمان ئەكرد. ثەروەتی عومومیەو وەضعی ئيقتيصادييەمان لە ئەمرۆ گەلی باشتر بو. جەعفەر پاشا ئەفەرموێ كە بە لەك پارەمان بۆ ئوموری نافيعەی كوردستان صەرف كردوە. ئەو ئوموری نافيعەيەی ئەوان ئەلين قەلاو ئيستحكاماتە بۆ موحافەظەی جەيشەكەی خۆتان لەباتی ئەمە مەكتەبتان بۆ بينا بكردينايە. ئەگەر حكومەتی كورديە تەشكول بكات هيچ لزومان پێی نابێ و ئيستيغنای لی ئەكەين)).

رەئيس وزەرا، بە تەئەثورو هەيەجانەوە، : ((براكانم بزانن كە لەم دەمارەدا خوينی كورديشم تيايە وەلاكين من عارەبم. بۆ كەلكی ئيوە قسە ئەكەم. بە حيسسيات حەرەكەت مەكەن. مەبن بە ئالەت بە دەست خەلكەوە. بەزەييتان بە ميللەتەكەدا بيتەوەو توشی نارەحەتييان مەكەن. ئەوا لە سەرەوە كوردەكان پارچە پارچە ئەكەن و

سەریان ئەبرن. لە دنیاوە ئاشکرایە کە کورد میللەتیکی دیندارە. لە بیرتان نەچێ کە دینتان عەرەبیە. قورئان عەرەبیە. محەممەد عەرەبە. وە فەیصەل کوری محەممەدە. براکانم تکاتان لێ ئەکەم فاجیعەی کەربەلا دوبارە مەکەنەوە)).

ششیخ قادر: ((جەعفەر پاشا بە بەیان کردنی فاجیعەی کەربەلا هەرەشەمان لێ ئەکات. ئەبێ بزانێ ئەگەر ئینگلیز لە بینا نەبێ عەرەب ناتوان' بیتە خاکمانەوە)).

جەعفەر پاشا: ((رجا ئەکەم سوئی تەفاهوم پەیدا نەبێ. مەبەستم هەرەشە نیە.

رەمزی ئەفەندی زۆر جار داوای قسەکردنی کرد. مەیدانی نەدرا. نیهایەت بە حیدەتەوە هاتە پیشەوە گوتی: ((پاشا! دین، ئیمان، مەفکورەی میللی، حکومەتیکی میللی کوردی ئەوێ. جەماعەت وانیە!)).

خەمو بە جاریك: ((بەلی وایە!)).

رەمزی ئەفەندی دەوامی کرد: ((پاشا! ئەم قسانەت ناچیتە جەوالی کوردەوە. ئەمە هەموی ئیغفالاتەو بیخەرەوە جەوالەکەی خۆتەوەو دەرگای ببەستەرەوە)).

جەعفەر پاشا: ((قسەکەت وەرگرەوە. تۆ پیاویکی دنیادیدەیت لە کۆبونەوەیەکی وادا نابێ قسەی ناشیرین بکرێ)).

رەمزی ئەفەندی: ((تۆ قسەم نادەیتێ. لە سوئالەکانم گوریز ئەکەی. بەلی تەسلیم بوم)).

میرزا تۆفیق: ((ئیستاکە دیانەت بابەتی باس کردن نیە. مەسەلە میللەتەو دامەزراندنی حکومەتیکی کوردیە. ئەگەر بە دین بێ ئەبێ ئیرانیش واز لە میللەتی خۆی بهینێ و داخلی حکومەتی عیراق ببێ. داوای لێ بوردنت لێ ئەکەم باسەکە مەگۆرە!)).

جەعفەر پاشا: ((قیاس مەعەل فاریق کردن زۆر بێ مەنطیقیە.ئیرانیەکان دو هەزار ساڵ زیاترە کە دامەزراوە)).

میرزا تۆفیق: ((ئەگەر لەبەر دین لازمە ئیمە تابیعی ئیوە بین لە هەمو عالەم ئاشکرایە کە کورد زۆر دیندارە. بینائەن عەلەیهی، پیویستە عەرەب لەژیر ئیدارەی ئیمەدا بێ)).

رەمزی ئەفەندی: ((یەکەم قسەم هەیە. خەلافەتی عەبباسییە لە کۆتایی سەلتەنەتیدا دەستی کرد بە بەکارهینانی کاربەدەستانی تورك، فارس و کورد. ئەمە بو بە یەکتا سەبەبی ئیضمحلالیان. حەز ئەکەم حکومەتی عیراق ئەم تاقی کردنەوەیە دوبارە نەکاتەوەو کاربەدەستانی کورد لەناو خۆیانا بەکار نەهینیت، چونکە ئەبێ بە

سەبەبی ئینحیطاطی. هەروەها بەکارهینانی کاربەدەستی عەرەبیش لە کوردستانا ئەبیّ بە هۆی لەناو چونی بو نەوەی کوردەکان)).

رەئیس وزەرا: ((سوپاسی پەندو ئامۆژگاریەکانت ئەکەم کە لە پیش روودانی ئاگادارتان کردین)).

لە پاش ئەوە رەئیس وزەرا کە بینی باس کردن لەم باسەوە سودیك نابەخشیّ و، میللەت یەك ئاواز بۆ داواکارییەکانی خۆی دوپات ئەکاتەوە. پیویست نەبینرا بە دریژ کردنەوەی باس و کۆبونەوەکە بەتالٌ بوەوە.

لە ناوەراستی کۆبونەوەکەدا سالار مستەفا جەعفەر سولتان هەلساو بە ناوی سادات، عولەما، شیخان و بە ناوی ئەو هۆزانەی سنور کە لە ناو عیراق دان تەئییدی داواکارانی کوردی کرد بۆ تەشکیلی حکومەتیکی کوردی و لە هەمان بابەتەوە مەضبەطەیەکی مۆرکراوی پیشکەش بە نوینەر کرد. لە کۆتایی کۆبونەوەکەشەوە لەلایەن فەتاح ئاغای حەمە رەضای سەرۆکی هەمەوەندەوە کە لە شاری کەرکوك دائەنیشن لە هەمان مەئال مەضبەطەیەکی تۆی پیشکەش بە مەندوبی سامی کرد. هۆزی جاف کە ئیستاکە سەر بە کەرکوکن لەم کۆبونەوەیەدا لەلایەن جەنابی کەریم بەگی فەتاح بەگەوە تەمثیل کرا بون.[53]

## {} بەیاناتی فەخامەتی رەئیس وزەرا لە سلیمانی لە وەقتی ئیجتیماعەکە خوینرایەوە

((موشەررەف ئەبم بەیانی ئیضاح کردنی ئەو سیاسەتی خۆشەویستییە کە حکومەتی عیراق خەریکە ئیتیباعی بکات بە نەظەر ئەو وەعدانەی کە بە کوردەکانی هاوولاتمان و براکاتمان دراوە. ئەو کوردانە کە عضویکی موهیمن لە جیسمی مەملەکەتی عیراقدا. ئاگاداری ئەو تەلغوراف ئیستیدعایانە بوم کە لەلایەن هەندیّ ئەشخاص بە ئیحتیجاج لەبەر ناو نەبردنی مەسئەلەی کورد لە ناو موعاهەدەکەی ئاخریدا تەقدیم کرا بو. بە صەرف نەظەر لە بەحث کردن لەو ئەسباب و عەوامیلە کە سەبەبییەتیدا بە تەقدیم کردنی ئەو ئیحتیجاجاتانە من بۆتان تەصریح دەکەم کە حکومەتی عیراق بە صورەتیکی ئەکیدە قەراری داوە کە بە نەظەری ئیعتیبار تەماشای ئەو وەعدانە بکات کە بۆ تەئمینی ئارەزوی برا کوردەکان دابوی لەوەش نەك تەنها هەتا سالی ۱۹۳۲ مەرعیەل ئیجرا ئەبیّ بەلاّم هەتا ما بەعدب ئەو تاریخەش

[53] ژیان، ژ۲٥۸، ۱۹۳۰/۸/۲۸

دەوام دەکات. هەروەکو حکومەتی صاحیب ئەلجەلالە ملك فیصل بە تەواوی وە بە هەمو مەعناوە حەریصە بۆ لزومی موحافەظەی و تەطبیق کردنی ئەم پرۆگرامە کەوا لەسەرەوە بەیان کراوە لە عەینی زەمانا بە هەمو شیددەتیك بۆ مەحو کردنی هەمو جۆرە تەعرەیەکی کە ببیتە سەبەبی تەفرەقەو ئیخلالی وەحدەتی وەطەنییەی عیراق، یاخود ببیتە سەبەبی ئیخلال کردنی حقوقی دراوسیتی لەگەڵ هەردو حکومەتی دۆستمان: ئیران و تورك. دیسان حکومەتی عیراق بە پیویستی ئەزانێ تەقدیم کردنیی ئەبنای وەطەنی عیراق لەناو دائیرەی یەکیتی عیراقدا بەبێ تەفریق لە مابەینی کوردو عەرەبا مەمنون و مەسرور ئەبێ، هەر بەم رۆحەوە لە هەمو هەنگاویکا چۆتە پیشەوە لەم خصوصەوە ئیستیعدادی نیشان داوە.

هەروەکو لاتان مەعلومە ئیمە کە ئەوسا مەسئولیەتی ئیدارەمان هاویشتە سەر شانی خۆمان بەیاننامەیەکمان نەشر کرد بو، لەو بەیاننامەدا گوتمان کە ئیمە حازرین بۆ دانانی لائیحەیەکی قانونی بۆ زبانی کوردی لەو جیگایەنەدا کە ئەکثەرییەنی ئەهالیەکەی کوردن وە ئەو لائیحەیەشمان بالفعل تەواو کردوە.. لە اجتماعی اولی پەرلەمانا بە هەمە حاڵ تەقدیمی مەجلیسی ئەکەین وە هەتا ئەمەش ئەکرێ ئەمرمان داوە بۆ دائیرەی مختصە کە بە موافیقی رۆحی ئەو ئوصولی لە لائیحەکەدا دانراوە حەرەکەت بکا لە خصوص موعامەلاتی عەدلییەو، ئیدارەی مەعاریفەوە. غەیری ئەمەش وا حکومەت موفەتیشیکی مەعاریفی تەعیین کردوەو دائیرەی تەرجومەیەکی کوردی دامەزراند کە ئیشی ئەم دائیرەیە هەر تەنها موعەمەلاتی کوردەواریە، وە موعاونیکی کە مودیری ئیدارەی داخلیەی عامەی تەعیین کردوە کە خەبەرداره لە ئوموری ئەلویەی کوردیە، وە موفەتیشیکی مەعاریف تەعیین کراوە بە صورەتی عام مەداریسی لیوای سلیمانی و مەداریسی کوردییەی لیوای هەولیرو کەرکوك تەفتیش بکاو حکومەت تەدابیری لازمەی ئیتیخاذ کردوە بۆ ئیحضاری قۆمیسەرو ظابیطان و مسجل پۆلیس کە ئاشنای زبانی کوردی بن بۆ ئیستیخدام کردن لە مەناطیقی کوردیە.

من نامەوێ ئەم بەیاناتەم تەواو بکەم بەبێ تەقدیم کردنی تەشکوراتم بۆ جەنابی وەکیلی مەندوبی سامی کە لەم سەفەرەمدا مورافەقەتی کردین و ئومید وایە کە موشار ئیلەیهی ئیستا بۆتان سیاسەتی حکومەتی بەریطانیا لەم خصوصەوە بەیان ئەکات و بە تەواوی ئاگاداری حەقیقەتی حاڵ ئەبن وە قسەی بەعضێ ئەشخاصی صاحیب غەرەض کە چاویان لە تەقدیر کردنی رەفاهی حەقیقی کوردانە وە رەعییەتی صاحیبی جەلالەت مەلیك فەیصەل موعەظەمو تەبەعەی دەولەتی عیراق کویر بوە وە قسەیان ئیغفال نەبن.

بەم موناسەبەتەوە جەنابی وەکیلی فەخامەتمەئاب موعتەمیدی سامی بۆ قسە کردن دەعوەت دەکەم بزانن ئیمە هەردولا بە تەواوی لەسەر تەعقیب کردنی ئەم پرۆگرامە موتەفیقین. ئیستا بۆتان بەیان ئەکات)).[٥٤]

## {} بەیاناتی فەخامەتی وەکیلی مەندوبی سامی

بینا لەسەر طەلەبی حکومەتی عیراق، لەگەڵ فەخامەتی وەکیلی رەئیسە وزەرا هاتوم، بۆ ئەوەی کە هەر کەسیک لە مەوضوعیکدا شكو شوبهەیەکی هەیە بە تەواوی بۆی ئاشکرا بکەم، کە قەت شتیکی وا نیە لە هیچ نوقطەیەکی عیراق، کە بلین حکومەتی عیراق یان حکومەتی بەریطانیا هەر یەکە بۆ خۆی تەعقیبی سیاسەتیك بکا. تازە ئەوا موعاهەدەیەك ئیمزا کراوە کە ئەم دو مەملەکەتە بۆ ٢٥ سالی تر لەگەڵ یەکتری بە تەحالوفیکی صەمیمی رەبط دەکات. ئەمە بە تەنها ئەبێ کافی بیت بۆ ئەوەی دەلالەت بکات کە لە بەینی ئەمانە هیچ مەسئەلەیەکی موهیمو ریك نەکراو نەماوە. ئەبینم قیسمیکتان ئیحتیجاجی حکومەتی بەریطانیاو عیصبەتول ئومەم ئەکەن بۆ ئەوە کە لە موعاهەدەی تازە باسی کوردستان نەبوە.

وەکو فەخاکەتی وەکیلی رەئیس وزەرا ئیضاحیان فەرمو ئەسبابی ئەوە عیبارەت لەمە بو: کە هەردو حکومەت، هیچ لزومی ئەوەیان نەکرد. چونکە حکومەتی عیراق قەراری داوە کە بۆ حالی حازرو موستەقبەل تەطبیقی ئەو سیاسەتە ئەکات، کە تازە فەخامەتی وەکیلی رەئیس وزەرا بەیانی فەرمو. بە زەریفی تێ دەگەن کە حکومەتی عیراق بە صیفەتیکی منەوەر بە تەواوی ئەوەی تەقدیر دەکات کە هەتاکو چ حەدیك خۆی موجب بینی، ئیعتیراف بکات کە لە قسمیکی موهیمی عیراقدا زمانی کوردی، نەك هی عەرەبی، زمانی دایکوبابە. هیچ شتیکی وەها نیە کە بلی مندالیکی کورد ئیجبار بکریت کە تەحصیلی ئیبتدائی خۆی بە زمانی تر نەك هی باوكو دایکی بخوینیت، یان بلی کوردیك ئیجبار بکریت لە مەحکەمەدا خۆی بە زمانیکی تر دیفاع بکات، یان گوێ لە مەسئەلەیەیکی خۆی بگرێ بە زمانیکی کە تێی نەکات مەحاکەمە دەکریت. هەروەها تەعیینی مەئمورانی کە کوردی ئەزانن لەناو فروعی مەرکەزی ئیدارە دەلالەت لەوە دەکات کە حکومەتی عیراق رازیە کە لە بەینی کوردو عەرەبو رەعیەتی جەلالەتی مەلیك فەیصەل هیچ نەوعە جیاوازییەك نەکات.

---

[٥٤] ژیان، ژ٢٥٨، ١٩٣٠/٨/٢٨

هـەتا ئـەو حـدودەی کـە عـائید بـە حکومـەتی بەریطانیایـە ئـەوان قـانیعن کـە حکومەتی عیراق بە تەواوی ریعایـەتی ئەو وەعدانە ئەکات کە عائیدی کوردەکانە وە بەناوی خۆی لە طەرەف حکومـەتی بـەریطانیا لـە عیصبـەتول ئومـەم دراوە وە غایـەی یەکەمینیان ئەوەیە کە تەئمینی تەئسیس دەولەتیکی عیراق بکات کە ئازادو سەربەخۆ بیت وە بە شوکرانەو حـەق شوناسـی مـەربوطیان وە لـە عیصبـەتول ئومـەم لـە گـەلیان عضویك بیت. هەرچی حەرەکەتیك لەگەڵ ئەم سیاسـەتە تـەوافوق نـەکات حکومـەت بـە باشـی سـەیری ناکات، وەکو جیابونـەوەی کوردان. سـەیر دەکـەم بەعضـیٚ جیـهاتی نامەسئول وای دەهینیتە پیشـەوە کـە تەشجیع کردنـی حەرەکـەتی قەومییـەی کـوردی سیاسەتیکی قەطعیەی حکومەتی جەلالەتی مـەلیکی بەریطانیایـە ئەمـە نـەك تەنـها بۆ عیراق بەلکو بۆ دراوسیٚو دۆستەکانی تری کە حکومـەتی ئیرانو تورکیایـە موجیبی ئیرتیباك دەبیـت. هیچ شـتیك نیـە کـە لەمـە زیـاتر لـە حەقیقـەت دور بیـت. هەرکـەس تەصەووری ئەوە ئەکات کە بە هـاتنی بـۆ لای فەخامـەتی مـەندوبی سـامی یـان بـۆ لای من بۆ سیاسەتیکی وەها تەشجیعی دەست ئەکەویٚ خەطایەکی گەورە دەکات.

ئەوەی کە هەردو حکومەت: بەریطانیا و عیراق، حـەز ئەکـەن ببینـن پیشـکەوتنی صولحپەروەرانـەی عیـراقی یـەکگرتوە، کـە لـەویٚ هـەمو ئـەو عونصـورە موختەلیفانـەی ئـەهالیی تەشـکیل دەکـەن، غـەرەضی زۆر موهیمیـان ئـەوە بـیٚ کـە ببن بـە: عیراقییـەکی چاك)). [٥٥]

## {} گیروگرفتی کورد لە عیراقدا

دەربـارەی راگەیاندنـە رەسمییەکـەی حکومـەت لەبابـەت روداوە کوردیەکانـەوە لـە ژورو.

روداوە کوردیەکان لە سەروی عیراقدا، بە تایبەتی لە سلیمانی، خەریکە ئەچیتە قۆناغیکی نویوە. هەندیٚ درکاندنو داوا کە لەو پەری خطورەتان، بڵاو کراونەتەوە، چ ئەوانـەی لەبـەردەم خـاوەن شـکۆی شـاهانە ئـەمیر غـازیدا خوینرایـەوە، چ ئەوانـەی بـە بروسکەو عەریزە نیردراون بۆ هەندیٚ جیگای رەسمیی لە بەغدادو لەندەنو جنیڤ.

ئەم جوڵانەوەیە دوای ئیمزاکردنی پەیمانی عیراقی بەریتانی چالاك بوەو هـەندیٚ رۆژامــەی ئیســتیعماریی ئینگلــیزی ئاگرەکــەیان خۆشــتر کــردوە. ئــەوەی ســەیرە جوڵـانەوەی کـورد لـە عیراقدا کەوتۆتـەوە چالاکیو تونـد بـوە لـە کـاتیکدا حکومـەتی

[٥٥] ژیان، ژ٢٥٨، ١٩٣٠/٨/٢٨

توركی دووەمین شۆرشی كوردی لە ئارارات دامركاندۆتەوەو، حكومەتی فارسی بە سەر شۆرشگێرانی كوردا زاڵ بوەو تەفروتونای كردون. لامان وایە حكومەتی عیراق هەستی كرد دوژمنانی وڵات خەریكی پیلانگێرانن، وەزارەتەكەی ئیستا بە راگەیاندنی مەرسومی زمانی كوردی دەستی پێكرد، وای زانی ئەم تەگبیرە ریگە تەخت ئەكا بۆ سەركوتكردنی ئەو بیروبۆچونانەی لە میشكی داواكارانی موختارییەتی كوردی دایە.

ئەگەر هەلومەرجی نائاسایی ناچاری كردبێن ماددەكانی ١٠٩و ١١٠ بخەینە قانونی ئەساسییەوە كە ریگە بە هەندێ رەگەز ئەدا زمانەكەی بەكار بهینێ، نابێ ئەمە وا بگەیەنێ كە رێ ئەدەین بە دەستی بەدی بیگانە یەكیتی عیراق هەلبوەشینێ و نیشتمانی خۆشەویست پارچە بكا.

پیش ئەمرۆ رونمان كردەوە ئەوەی كورد لە عیراق كەلكی لێ وەر ئەگرێ، هی عەرەب لەوە باشتر نیەو ئاسودەییان بەستراوە بە مانەوەی حالەتی ئیستایانەوە. ئەگەر لەم نیعمەتە بێ بەش كران و توشی نەگبەتیی جیابونەوە یان سەربەخۆیی بون، نەمان ئەبێ بە نسیبیان وەكو ئەوەی بە دوای مردنی خۆیدا ئەگەرێ بە گوللەیەك، چونكە نە توركیا لەلای ژورویو نە ئیران لەلای رۆژهەلاتیەوە ریگە بە دامەزراندنی ئەم كورەیە ئەدا كە پریشكی شۆرش و پشیوی ئەهاویژێ. لە راستیدا ئەگەر ریماندا كورد ئەوەی پێی ئەلین (موختارییەت یان سەربەخۆیی ئیداری)یان بدریتێ، بەوە پەیمانی دۆستایەتی لەگەڵ هەردو دراوسیمان توركیا و ئیران ئەدرینین. لە دوای ئەوەی حكومەت بە رونی سیاسەتی خۆی بەو بەیانە راگەیاند كە فەخامەتی وەكیلی سەرۆكی وەزیران لە لیواكانی ژورو خوێندیەوەو دوای ئەوەی خەلگ گوییان لەو بەیانە بو كە نوینەری حكومەتی بریتانی خوێندیەوە كە وازهینانی حكومەتەكەی لە سیاسەتی هاندانی نەتەوەی كورد راگەیاند، پیویستە ئیتر حكومەت ریگەی توندی بگرێ و بە زۆر سیاسەتەكەی خۆی دریژە پێ بدا.

هەروەها لەسەر حكومەت پیویستە وڵاتی كورد پاك بكاتەوە لە فەرمانبەرانی عیراقی یا بریتانی، كەوا لەمەوپیش ناسراون بە هاندانی راپەرین، لە ریگەی نەتەوەیی كوردەوە یان كاركردن بۆ حسابی بیگانە لەناو جەرگەی وڵاتەوە.[٥٦]

---

[٥٦] الجهادن ع٢٢٩، ١٩٣٠/٨/١٢

## {} كوردو يەكیتی عیراق:

تـا ئیسـتاش بەسەرسـورمانەوە ئـەو هەواڵانـە وەرئـەگرین کـە لـە ناوچـەکانی ژوروەوە بەتایبەتی لە سلیمانیو هەولیرەوە دینو ئەلیت برا کوردەکانمان لەویَ کە داوای مافەکانیان ئەکەن لەبەردەم سەرای حکومەتدا لـە سـلیمانی خۆپیشـاندانیان کردوەو لەویش زیاتر ئەگیرنـەوە کـە موراجەعـەتی دار الاعتمـاد لـە بـەغدادو کۆمەلـەی گەلان ئەکەن.

لـەم حالەتـەدا دلـی هـەمو عیراقییـەك، کـە سـور بـیَ لەسـەر یـەکیتیو هەسـت بـە فرمانی خۆی بەرامبەر نیشتمان بکا، ژان ئـەکا. چونکـە ئـەم جـۆرە جوڵانـەوانـە، ئەگـەر راست بیَ بوبیَ، لە سەرچاوەی موغریزەوە دائەکەویَ کە خیری عیراقیـان نـاویَو، بـە زۆریی لەوانەوە دیَ کە تـەماعو مەبەسـتی تایبـەتییان هەیـەو زۆر دورە لـە بەتەنگـەوە هـاتنی قازانجی کوردو پاشـەرۆژو چارەنوسیان، چونکـە ئەگـەر ئیمـە لـەبارو دۆخـی کوردەکانی عیراق لـەم سـەردەمەدا ورد ببینـەوە ئـەبینین کەسایەتی رەگـەزیی خۆیـان هەیە، هیچ کاتیکی کەی ئەو زەمانەی بە حکومەتە دوابراوەکانـەوە بەسترا بـون نـەیان بـوە. ئـەوەندە بەسـە بـۆ کـورد کـە ئـەمرۆ حـالی خـۆی بـە ئـەقلیکی پیگـەیشتوو دلیکی هۆشـیارەوە، دور لـە عاتیفـە، ریـك بخـا، ئـەبیَ کەسـایەتی لـە کۆمـەلی عـیراقیو حکومەتەکـەیدا ئشـکراو رونـەو هیچـی کـەم نیـە. بـە ئازادیـەکی بـیَ سـنور ئـەژیو زمانەکـەی بـە رەسمـی دانـی پیـا نـراوەو، کـەلك لـە هـەمو ئـەو ئیمتیـازاتو مافانـە وەرئـەگریَ کـە بـۆ هـەمو عیراقییەکانـە بیَ جیاوازی عیراقی عـەرەبیو تەعـەرەبی. ئـەو پارەیە گەنجینەی دەولەت لە ئاوەدانیو پرۆژەکانی لیواکانی ژورودا سەرف ئەکا.

ئەگـەر ئاوریَ لـە بەشداری کـوردا لـە مەسئولیاتو کاروبـاری حوکمدا بدەینـەوە ئەبینین ئەوانـە ریچەلـەکیان کوردە یـا کوردەکـانی ئیسـتا پایـەو وەزیفـەی دەولـەتیان بەدەستە لە هـەمو پلـە جیاوازەکانی نـاوەندی حکومـەتو سەرانسـەری عیراقدا هـەن. لەم ساڵانەی دواییدا حکومەتی عیراق هەولی دا فەرمانبەرانی ناچە کوردیەکان کورد بـن. گـەلی کـورد هـەن لـە سەرانسـەری عیراقدا پایـەو وەزیفـەیان بـە دەسـتە. میـژوی حوکمی نیشتمانی لە عیراقدا پرە لەو ضماناتەی لەم وڵاتـەدا کەسایەتیو ژیانیك بـۆ کورد تۆمار ئەکەن، کە لە هیچ جیگەیەکی تری رۆژهەلاتدا نایبینین. ئەوە کوردەکانی تورکیا بە دەس قەلاچۆ کردنەوە ئـەنالینو ژیانیـان وەکـو زەهـر لی تـاڵ کـردونو ئـەوە کوردەکانی ئیران بەبیَ بەرگریو توندو تیژی چاو لیك نانین.

سلامەتی ژیانو بەختیارییان بەستراوە بە رادەی توندی خۆبەستنەوەیانەوە بە یەکیتی عیراقەوە.

ئەوەی زۆر ئەمانترسینێ دەربارەی پاشەڕۆژی براکانمان ئەوەیە، ئەوان بەم جولانەوانە، کە لامان وایە کوردی عیراق بە گشتی ئیستینکاری ئەکەن. زولم لە خۆیان بکەن پشیوی بیان خواو، ببن بە خۆراکی مەبەستو ئارەزوی بیگانە وەکو بەسەر ئەرمەن هات، کە ئارەزوی جۆراوجۆر شروهوری کردن.

باوەرمان زۆرە کە پیاوە ژیرەکانی ناو برا کوردە عیراقییەکانمان، هەست بەو مەترسییانە ئەکەن کە لەسەریانە، پیش ئەوەی شەرەکەی بتەنیتەوە چارەی ئەکەنو، زۆر بەتوندی ئەوە ئەگرن کە شانی عیراق بەرز ئەکاتەوەو قەوارەی ولات بەهیز ئەکا.[57]

## {} موفارەقەتی سەعادەتی
## تۆفیق وەهبی بەگ بە تەواوی تەئثیری کردۆتە میللەتەکەمانەوە.

رۆیشتنی موتەصەرریفی غەیورمان سەعادەتی تۆفیق وەهبی بەگ بۆ بەغدادو خەبەری ئینفیصالی لە موتەصەرریفیەتی لیرە جدەن زۆر تەئثیری کردە ئەهالیەکەمان. بە عومومی کوردەکانی عیراقو بەتایبەتی ئەهالی ئەم لیوایە بە گەورەو بچوکو ژنو پیاوەوە موتەئثیرو بۆ ئیعادە کردنەوەی حەسرەتکەشنو بۆ هاتنەوەی لە هەمو لایەکەوە ئیستیرحامنامەیان تەقدیمی حکومەت کردوە.

ئەمیش حەقیقەتەن حەقە چونکە ئەم لیوایە کە لە عیراق لیوایەکی موهیمو عادەتەن بە مەرکەزی کوردستانی جنوبی ئەناسرێ مودەتیکی زۆر لە هەمو ترەقیاتیك مەحرومو بێ بەش مایەوەو ئەم موحیطە کە طەبیعەتەنو فیطرەتەن ئەهالیەکەی مایلی عیلمو عیرفاننو مەحەبەتی مەعاریفیان هەیە پەردەیەکی جەهل بە سەریا راکشا بو فەقەط بە هاتنی سەعادەتی تۆفیق وەهبی بەگ کە لە پیگەیشتوانی ئەم وەطەنەیەو ذاتیکی داهیو موتەبحیرە ئەهالیەکەمان لە تاریکی جەهل رزکاری بوو ولاتەکەمان بە چرای مەعاریف روناك کرایەوەو حەقیقەتەن موشار ئیلەیهی لە پیش هەمو شتیکا بۆ ئینتیشاری مەعاریفو بۆ تەئسیسو دامەزراننی موئەسەسەی عیلمیەو بۆ زیاد کردنو کردنەوەی مەکاتیبی ئینتیدابی لە تەشەبوث کردن غافڵ نەبو و بە عەزمیکی مەتینەوە بۆ تەرەقیو تەعالی وەطەنەکە هەولیداو غەیری ئەمانیش بە واسیطەی تەطبیقی قوانینو نیظاماتی حکومەتەوە عەدالەت بە هەمو مەعنایەوە لە

[57] التقدم (بدلا من جريده البلاد)، ع٢١٣، ٢٣ تموز ١٩٣٠

ناو ئەم موجتەمەعەدا تەجەسومی پێ کرا بو وە بەم سەبەبەوە لە بەینی حکومەت و میللەتا مەحەبەتیکی موتەقابیلە هاتبوە وجود.

بەلی هەرچەند لەو زەمانەدا وەکو ئیستا بە موناسەبەتی بەستنی موعاهەدەی تازەوە میللەتەکەمان بۆ طەلەبی حقوقی موقەرەرەو موعتەرەفەیان کەوت بونە موراجەعاتەوە فەقەط ئەم حەرەکەتە وەنیە هەر لە سلیمانیا بوبێ بەلکو لە هەمو لیوا کوردەکانی تراو لە هەمو مەنطیقەیەکی کوردستان دەستی پێکرا بو. وە ئەم حەرەکەتەیش هیچ وەقتیك نەبو بو بە سەبەبی تەفرەقەو نەفرەتیکی ئەهالی بەرامبەر بە حکومەت. ئەهالی لەگەڵ ئەم هەمو موراجەعەتەیشیا زیاتر مەربوطوچاکتر موطیعی ئەوامیرو قەوانینی حکومەت بو.

ئەگەر بە نەظەریکی رەئفەت تەماشای موراجەعات و ئیستیرحامنانەی ئەم ئەهالیە بکرێ مەعلوم ئەبێ کە ئەم تەشەبوثاتە لە فکریکی خراپەوە نەهاتۆتە دەرێ و بە واسیطەیەکی غەیرە مەعقولە پەیدا نەبوە، وەنیە ئەمە ئەوەڵ جار بێ کە ئەهالی طەلەبی حەقی خۆی ئەکات، هەتاکو ئیستا موتەعەدید دەفعە ئەهالی بۆ ئەم حەقە صەریحەیان تێ کۆشاون و ئەمجارەیش ئەهالی رێ ئەکی مەدەنییانەو مەعقولانەی گرتوەو لە عورف و عادەت دەرنەچوەو شوکور حەرەکەتیکی وا نەکراوە کە ببێ بە سەبەبی ئیختیلالی ئەمنیەت و ئاسایش و لە هەمو ئانیکدا سەطوەتی حکومەتی زیاتر مەوجودو ئەهالی زیاتر ئیطاعەتی کردوە ئەمیش هەر بە سەبەبی تەدابیری حەکیمانەی مەئمورینی ئیدارەو سەعادەتی موتەصەرریفی غەیور تۆفیق وەهبی بەگەوە هاتۆتە جێ چونکە حەقیقەتەن حکومەت لەگەڵ ئەهالیدا بە لوطف و شەفەقەتەوە جولاییەوەو ئەهالیش بەرامبەر بەم لوطفە قەراریدا کە هەمو موراجەعاتەکەی حەصر بکاتە سەر تەشەبوثات، سەر نوسین و ئیستیرحام کردن و غەیری ئەمە نەیویست و قەطعیەن نایەوێ رییەکی تۆ بگرێ و غایەیەکی خراپ تەعقیب بکات.

ئینجا ئەگەر حکومەت بە نەظەریکی موشفیقانە تەماشای وەضعیەت و تەدقیقی مەسائیل بکات بە تەواوی بۆی مەعلوم ئەبێ کە بەقای سەطوەتی حکومەت و مەوجود بونی ئەمنیەت و ئاسایشی کاملەی ئەم لیوایەو مەربوطیەت و ئیطاعەتی ئەهالی بەرامبەر بە حکومەت بە سەبەبی دەهای خاریقەو تەدابیری حەکیمانەی مەئمورینی ئیدارەو خصوصەن سەعادەتی تۆفیق وەهبی بەگەوە هاتۆتە وجودو محافەظە کراوە.

ئینجا ئەهالی بەرامبەر بەم شەفەقەتە ئومیدی قەوی هەیە بە حکومەت ئەو ئیستیرحام نامانەی کە بۆ ئیعادەی سەعادەتی تۆفیق وەهبی بەگ لە هەمو لایەکەوە تەقدیم کراوە قبولی ئەفەرموێ و بە ئیعادەکردنەوەی موشار ئیلەیهی میللەتەکە مەسرور ئەکاتەوە.[٥٨]

{} ئەو رۆژە کە سەعادەتی موتەصەرریفی ئەکرەمی تۆفیق وەهبی بەگ تەشریفی بردە بەغداد ئەهالی لە تەئەثوردا چونە تەلغورافخانەو ویستیان لەگەڵ فەخامەتی مەندوبی سامی و رەئیسەل وزەرادا بە تەلەفۆن گفتوگۆ بکەن. فەقەط لەبەر ئەوەی فەخامەتی مەندوبی سامی لە کوردی نەئەگەیشتن و فەخامەتی رەئیسەل وزەرایش لە دائیرە مەوجود نەبو مەجبورەن قەراریان دا ئەم تەلغورافەی کە لە ژێرەوە بە عەرەبی عەرض ئەکرێ کەشیدەو تەقدیمی بکەن و نەتیجە بەم ئیمضایانەوە تەقدیم کرا.[٥٩]

{} **لە سلیمانیه** ١٩٣٠/٨/٢٠

**بغداد: فخامه مندوب السامی**

((**رئیس الوزرا**))

بعد سفركم تاملنا بالمباشرة في تطبيق المقررات الامنية بتبديل موظفين غير اكراد لكن خاب املنا بتحويل موظفين الاكراد الى اماكن البعيدة في الجنوب وجلب المتصرف الى بغداد هذه الامور استوجب التوحش والهياج ان طلب الحقوق التي اقرتها العصبة لا يستوجب التحامل قانونا بالنظر الى وجود الانتداب الفعلي في العراق. سعينا بكل ما لدينا في الطلاقة والطاقة في تسكين الاهالي والعشائر منعا لحدوث امور لايرضى بها فخامتكم خارت قوانا. لهذا نتجرد عن مسئولية تتولى في المستقبل راجين الاهتمام بكف المعاملات التي من شئنها الاستياء.

حمه اغا عبدالرحمن اغا بابان: عزمي بك. عزت بك عثمان پاشا. حفيدزاده: شيخ قادر. ميرزا توفيق قزاز. عبدالرحمن اغا احمد پاشا. حمه صالح بك حاجى حمه علي بك. فايق بك بابان. مجيد افندي حاجى رسول اغا. رمزي افندي حاجى فتاح.

---

[٥٨] ژیان، ژ٢٥٩، ٤ی ئەیلولی ١٩٣٠

[٥٩] ژیان، ژ٢٥٩، ٤ی ئەیلولی ١٩٣٠

وەقتیك كە سەعادەتی موتەصەرریف تۆفیق وەهبی بەگ مواصەلەتی بەغدادی كردو كە غەزەتەكان نوسییان ینفیصال پێ كراوە لە هەمو لایەكەوە ئەهالیو روئەسای عەشائیر بۆ ئیستیرحامی ئیعادە كردنەوەی موشار ئیلەیهی ئەم تەلغورافانەیان نوسیو تەقدیم كرد وا قیسمیكی تەلغورافەكان بە ریزە نەشر ئەكەین.[٦٠]

{} ١٩٣٠/٨/٢٤

## بەغداد: فەخامەتی مەندوبی سامی

صورەتی بۆ فەخامەتی رەئیسەل وزەرا

تەبدیلی موتەصەرریف موغایری ئەفكارمانو سەبەبی تەئەثوری عمومی كوردانە. ئیتیرحام ئەكەین زو ئیعادەی بفەرمونەوە.

هەورامان، ئەفاسیاب بەگی رۆستەم سولتان. هەورامان، مصطەفا بەگی جەعفەر سولتان. هەورامان، محەممەد ئەمین بەگی مەحمود خانی دزلی. هەورامان، شیخ محەممەدی شیخ حیسامەدین.[٦١]

{} ١٩٣٠/٨/٢٦

**بغداد: فخامە مندوب السامی**

**((رئیس الوزرا ))**

گۆرینی موتەصەرریف تۆفیق وەهبی بەگ ئەبێ بە سەبەبی تەئەثوری عمومی كوردان رجا ئەكەین ئیعادەی بفەرمونەوە.

رەئیسی هەورامان جەعفەر سولتان.[٦٢]

## {} لە سلیمانیەوە لە عەینی مەئال بە ئەشرافو توجارو ئەهالی سائیرە سێ تەلغوراف نوسراوە.

لە پشدەریشەوە بە ئیمضای جەنابی عەباس ئاغای مەحمود ئاغاو قیسمیكی زۆر لە روئەساكانی تریان سێ تەلغراف نوسراوە.

لەبەر ئەوەی صورەتەكانمان لا نەیو نەمانتوانی عەینەن دەرجیان بكەین.[٦٣]

[٦٠] ژیان، ژ٢٥٩، ٤ ئەیلولی ١٩٣٠

[٦١] ژیان، ژ٢٥٩، ٤ ئەیلولی ١٩٣٠

[٦٢] ژیان، ژ٢٥٩، ٤ ئەیلولی ١٩٣٠

### {} بەیانی رەسمیی:

بە بۆنەی هەلبژاردنی هەیئەتی تەفتیشەوە لە لیوای سلیمانی و کۆبونەوەی هەیئەتی هەلبژێردراو ئەمرۆ لە مەرکەزی حکومەت، مقاطعینی انتخاب لە بەردەمی شوینی کۆبونەوەکەدا مظاهرەیان کرد، بەو هۆیەوە پیکادان رویدا، هەندێ لە پۆلیس و سەربازو خەلك ئەنگیوراون. پاش چەند دەقیقەیەك ئاسایش گەرایەوە. ئەوانی بون بە هۆی ئەم روداوە گیراون و لیکۆلینەوە بەردەوامە.[64]

### {} روداوەکەی سلیمانی:

لەسەرچاوەیەکی رەسمیی پەیوەندیدارمان پرسی کە ژمارە کوژراوەکانی روداوەکەی سلیمانی بە بۆنەی دەسکردن لە هەلبژاردنی نیابیەوە وەکو بەیانە رەسمییەکەی لەکاتی خۆیدا بلاومان کردەوە، چەندە. نەمانتوانی ژمارەی ویستراوی لێ بەدەس بهینین، بەلام بریندارەکانی پۆلیس و خەلك بۆ چارەسەرکردن نیردراون بۆ نەخۆشخانە.[65]

### {} بەیان لە (مةحظیه المطبوعات)ەوە

روداوەکەی سلیمانی: لەبەر بلاوبونەوەی زۆر واتەواتی درۆ دەربارەی ئەو روداوە ناخۆشەی کە لە ٦ی ئەم مانگەدا لە سلیمانی قەوماوە، لەلایەن کەسانیکەوە کە ئەیانەوێ ترس و نائومیدی بخەنە دلەوە، حکومەت بە پیویستی زانی ئەم بەیانە دەربکا سەبارەت بەوەی روی داوە.

وەکو وەکیلی موتەصەرریف ئاگادار کرا بو ژمارەیەکی زۆر ئەشراف و تاجیرەکان ئەیانویست هەلبژاردن بکرێ. لە ٥ی ئەیلولدا ریوشوینی هەلبژاردنی هەیئەتی تەفتیشی بۆ رۆژی دوایی دانا. لەبەر ئەوەی زانی کە ژمارەیەکی کەمی ئەشارف ئەیانەوێ موقاطەعە بکەن، ئاگاداری کردن کە هەلبژاردن ئازادە، کەس ناتوانێ زۆریان لێ بکا هاوبەشی بکەن ئەگەر خۆیان نەیانەوێ، هەروەها کەسیش هەقی نیە رێ لەوانە بگرێ کە ئەیانەوێ ئازادی خۆیان بەکار بهینن، ئیتر ئەوە بە زۆر بێ یان بە

---

[63] ژیان، ژ٢٥٩، ٤ ئەیلولی ١٩٣٠

[64] الزمان، ع٢٤٩، ١٩٣٠/٩/٧

[65] الزمان، ع٢٥١، ١٩٣٠/٩/٩

ترساندنو هەرەشە. وەكیلی موتەصەرریف تێی گەیاندن كە كاری وەها بە تاوانیكی گەورە دائەنرێو، ئەركی حكومەتە منتخبەكانیان لێ بپارێزێ.

بەیانی رۆژی شەشی ئەیلول دەعوەتنامە نیردرا بۆ نزیكەی ٣٠ لە ئەشراف كە نوینەرایەتی هەمو گەرەكەكانی شارەكەیان ئەكرد بۆ ئەوەی لەسەرای حكومەت بۆ هەلبژاردن ئامادە بن. بەراستی ئامادە بونو لەگەڵ سەرۆكی شارەوانی كۆبونەوە. دوای ئەوە هەواڵ گەیشت كە نزیكەی ٥٠ كەس لە قوتابیو هەرچیو پەرچی لە بازار كۆ بونەتەوە خەریكن بە زۆر دوكانیان بێ دائەخەنو خەلك كۆ ئەكەنەوە، ئینجا رویان كردە سەرای حكومەت. ریزیك پۆلیس ریگەی لە كۆبونەوەكەیان گرت. قەلەبالغییەكە زۆر بو و لە نیزام دەرچون، دەركەوت كە هیزی فریاكەوتن پیویستە. داوا لە فەرماندەی حامیەی جەیشی عیراق كرا ١٠٠ سەربازی بێ چەك بۆ یارمەتی پۆلیسەكان بنیرێ. بارو دۆخەكە تا ئەهات دژوارتر ئەبو. هەندێ لە قەلەبالغییەكە كورسی چایخانەكانیان وەكو چەك لە دژی پۆلیس بەكار ئەهیناو هەندیكیان بریندار كردن. لەبەر ئەوە دەركەوت هیز پیویستە، داواكە گۆرا، داوای سریەیەكی چەكدار كرا. قەلەبالغییەكە پەلاماری پۆلیسەكانیاندا كە بە ژمارە كەم بون. كەوتنە بەردبارانی پۆلسەكانو سەرای حكومەت. داوا لە فەرماندەی حامیە كرا فەوجێ بنیرێ بۆ پشتیوانی لەو سریەی بە ریگەوە بو بۆ سەرا. قەلەبالغییەكە بەردبارانی زیادكردو كەوتە بەكارهینانی دارو تیلا. كە سەریە پیادە چەكدارەكە گەیشتە سەرا بەردبارانیش راوەستا. لەگەڵ ئەوەی هەندێ لە قەلەبالغییەكە كشایەوە، بەلام بەشیكیان لە شوینی خۆیاندا مانەوە. فەرمان بە سەربازەكان درا بلاوەیان پێ بكەن. بە بلاوی بە جادەكەدا كەوتنە رۆیشتن. ئاژاوەچییەكان بە تیلای گەورەو، بەو بەردانەی بو بەردریژی جادەكان دانرابونو، بە كورسیو شتی تر تییان بەر بون.

لەم كاتەدا گوللەیەك تەقیو سەربازیكی عیراقی كوژرا. بەدوای ئەوەدا چەند گوللەی دەمانچە تەقی دو سەربازیش بریندار بون. سەربازەكان دەستیان كرد بە تەقەو قەلەبالغییەكە بلاو بوەوە. لەو كاتەدا فەوجەكە گەیشتو چاودیری شاری گرتە ئەستۆو ئاسایش گەرایەوە.

ئەنگاوتە: لە پۆلیس تا گەیشتنی سەربازەكان ١٠ پۆلیس بریندار بون. نۆیان بە بەردو تیلاو یەكیكیان بە خەنجەر. ١٥٣ پەنجەرەی سەراو ١٨ گلۆپی جادەكە شكاوە.

لە جەیشی عیراق: یەك سەرباز كوژراوەو دو سەرباز بریندار بوە، یەكیكیان بە بەرد.

لە ئەهالی: ٣ كوژراو و ٢٣ بریندار.

گیراوەکان: ئەم مەسانەی ناویان لەخوارێ نوسراوە دوای ئاژاوەکە گیراون: ١- شیخ قادری برای شیخ مەحمود. ٢-میرزا تۆفیق. ٣-رەمزی ئەفەندی. ٤-حەمە ئاغا. ٥-عەزمی بەگی بابان. ٦-عیززەت بەگی عوسمان پاشا. ٧-ئەورەحمان ئاغای ئەحمەد پاش. ٨-محەممەد صالح بەگ. ٩-مەجید ئەفەندی کانیسکان. ١٠-فایەق بەگی بابان. ١١-شیخ محەممەدی گولانی.

بەم راپۆرتەدا دەرئەکەوێ دەسەلاتی حکومەت ناچار کراوە بۆ بەکارهینانی هیز لە بلاوەپیکردنی هەرچیو پەرچیە یاخییەکاندا کە ئەیانویست ئاسایش تیک بدەن. ئەم پشیوییە لەوە دروست بوە هەندێ کەسی هەلخەلەتینراو ئەیانەوێ فەرمانبەرانی گویرایەلی قانونو ئەوانەی ئەیانەوێ لە هەلبژاردندا بەشدار بن، بتۆقینن. ملاحظ المطبوعات.[66]

## لیدوانی رۆژنامەی (بەغداد تایمس):

وا دەرئەکەوێ بارودۆخی ناوشاری سلیمانیو لیواکەش هیمن بێو حکومەت کاروباری گرتۆتەوە دەست. ئەو هەوالانەی بە شیوەیەکی تایبەتی بۆمان هاتون ئەلین ئاژاوەکە تەواو بو بە کوشتنی ١٣ کەس کە یەکیکیان سەربازیکی عیراقییەو ٣٥ بریندار کە ٤یان سەربازو ٩یان پۆلیسن. ئەمانەش کە ناویان لە خوارەوە نوسراوە گیراون: عیززەت عوسمان پاشا، عەزمی بەگی بابان، فایەق ئەفەندی بابان، رەمزی حاجی فەتاح، شیخ قادر شیخ سەعید، محەممەد صالح، مەجید ئەفەندی، محەممەد عەبدورەحمان، تۆفیق قەزاز، ئەمانە نیردراون بۆ کەرکوك بۆ لیکۆلینەوەیان لەگەڵ بکەن. خۆپیشاندەران دژی هەلبژاردن لەسەرەتادا ژمارەیان زۆر نەبو تا گەیشتە ١٠٠٠ تا ٢٣٠٠ کەس. هوتافیان ئەکیشا بروخێ هەلبژاردن. لەناو خۆیاندا ئەیانوت هەلبژاردنەکە ئازاد نیە. کۆمەلانی خرۆشاو سەعات ١١ی بەیانی دەستیان کرد بە بەردبارانی پۆلیسو سەرا. زۆر لە خۆپیشاندەرەکان دەمانچەو خەنجەرو تیلایان پێ بو، لە بەردەرکی سەرادا کۆبونەوەو چونە ژورو هاتنە دەرەوەیان خست بوە مەترسیەوە. دەسبەجێ فەرمان بە پۆلیس درا، کە تەنیا داریان پێ بو، بلاوە بە عەشاماتەکە بکا. بەلام هیزەکەیان بەس نەبو بۆ چارەسەرکردنی کیشەکە، کاربەدەستانی وا لی کرد جەیش بانگ بکەن بۆ یارمەتیدانیان. لیرەدا پیکاهەلپژان دەستی پێ کرد. جەیش ناچار بو تەقە لە خۆپیشاندەران بکا. تەئکیدمان کردوە کە

[66] الزمان، ع٢٦١، ٢١/٩/١٩٣٠

پۆلیس و جەیش دەستپێشخەر نەبون لە دەستدرێژیدا. جەیش وەڵامی ئەو تەقانەی دایەوە کە خۆپێشاندەران لە جێگەیەکی نزیکەوە کردبویان.[٦٧]

### {} ئینتیخابات لە سلیمانی:

رۆژی ١٩٣٠/٩/١٥ لە مەقامی موتەصەرریفیدا عمومی ئەشارف و توجارو سائیری طەبەقەی ئەهالی بۆ ئینتیخاباتی هەیئەتی تەفتیشیە کۆبونەوە.

لەنەتیجەدا ذەواتی ئاتیە بە ئەکثەریەتی ئارا بە ئەعضای هەیئەتی تەفتیشیە ئینتیخاب کران.

چەند رەئی بوە

٣٤ حاجی ئیبراهیم ئاغا

٢٢ مەجید بەگی حاجی رەسوڵ بەگ

٢٢ غالی ئاغا

٢١ حاجی ئەحمەدی حاجی کەریم

٢٠ عەبدولکەریم ئەفەندی عەلەکە

١٩ سەید ئەحمەدی توتونچی

١٧ کەریم بەگی محەممەد بەگ

١٦ حاجی کاکە حمە

١٥ حاجی مەلا محیدین

١٥ حاجی عەلی حاجی حەسەن ئەفەندی.[٦٨]

### {} تەشریف هینانی سەعادەتی موتەصەرریفی تازە

رۆژی یەکشەمە موصادیفی ٢٨ی ئەیلولی ١٩٣٠ سەعادەتی ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ، موتەصەرریفی تازەو خۆشەویستی سلیمانی تەشریفی لە کەرکوکەوە مواصەلەتی فەرموە سلیمانی لە رۆژی لەوە پیشەوە قیسمیکی زۆر لە ئەشراف و روئەسای دەوائیرو مەئمورین و منەوەرانی سلیمانی بۆ ئیستیقبالی موشار ئیلەیهی چو بون بۆ کەرکوك هەتا سەر محەطەی شەمەندەفەرو قیسمیکی تریش لە روئەسای

---

[٦٧] الزمان، ع٢٥٣، ١٩٣٠/٩/١١

[٦٨] ژیان، ژ٢٦٠، ٢٢ی ئەیلولی ١٩٣٠

دەوائیر کە خەسەبەل وەظیفە ئیمکانی چونی کەرکوکیان نەبو رۆژی مواژەلەت هەتا دەربەندی بازیان و تەینال و بیجگە لەمانەش هەمو ئەهلی مەملەکەت بە ئیختیلافی هەمو طەبەقاتیانەوە، لەگەڵ بلوکیك عەسکەری جەیش و طاقمیك پۆلیس بەناوی حەرەسی شەرەفەوە لەبەردەمی جادەی دەباخانە بە دلیکی پر فەرەح و سرور حاضری ئیستیقبال و چاوەروانی تەشریف هینانی سەعادەتی بون.

لەبەر ئەوەی لە ریگا و لە دەربەند تەئخیر بو بون لە سەعات نزیك هەشتی عەرەبی مواصەلەتی فەرمو، ئەوەل جار زیارەتی حەرەسی شەرەفی جەیش و پۆلیس و لە پاشا لەگەڵ عولەما، سادات، ئەشراف، روئەسای دەوائیرو مەئمورینی حکومەتدا بە لیویکی پر تەبەسومەوە کە ئاوینەی صەفوەتی قەلب و حوسنی نیەتی بو یەکە یەکە موصافەحەو بەیانی خۆشنودی و مەمنونیەتی لە موستەقبیلین فەرمو وە بە چەند کەلیمەیەکی شیرین و جوان و ئومیدبەخش ئەم ئیستیقبالەی لەسەر خۆی بە قەرضیك وەرگرت کە بە سەعی کردن بۆ تەئمینی ئەمن و ئاسایش و هەوڵ دان بۆ تەرەقی و تەعالی میللەت و مەملەکەت مەجبور بێ بە ئەدای ئەم قەرضە. ئیتر لەویوە لەگەڵ ئامیر مەنطیقەی عەلی رەضا بەگ و حەمید بەگی شالچی ئامیری فەوج و سائیری موستەقبیلیندا بە ئۆتۆمۆبیل تەشریفیان هینایەوە دەولەتخانەو لەوێ لەپاش ئیسراحەت کردن و قاوە خواردنەوە ئیتر ویداعی لی کرا..

موشار ئیلەیهی کە یەکیکە لە منەوەران و ئەنجەبی خانەدان و ئەشرافی سلیمانی، نەعین فەرمونی بۆ ئەم وەظیفەیە بە راستی هەمو ئەهلی سلیمانی خاصەتەن و، هەمو میللەتی کوردی بە عمومی مەمنون و بەرامبەر لەم لوطفی حکومەتە مەدیونی شوکران کرد.

ژیان: لەگەڵ هەمو میللەتی کورد تەمەنای موەفەقیەت و سەعادەت و ئیلەل ئەبەد دەوام و بەقای ئەکات.[٦٩]

## {} وەفدی سلیمانی:

رۆژی ١٩٣٠/٩/٢٨ وەفدی سلیمانی کە لە ریاسەتی رەئیسی بەلەدیە موحتەرم مەحمود ئەفەندیدا تەشەکولی کردوەو عیبارەیتن لە محامی نەجیب ئەفەندی، وە لە روئەسای جاف جەنابی ئەحمەد بەگی محەممەد صالح بەگ، وە حاجی مەلا کوری حاجی عەباس ئاغا رەئیسی پشدەر، بۆ عەرضی تەعظیمات و ئیستیقبالی جەلالەتی

---

[٦٩] ژیان، ژ٢٦١، ٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٠

مەلیك فەیصەل ئەوەل کە لە لەندەنەوە عەودەتی فەرمۆتەوە، تەشریفیان بردۆتە بەغداد.[70]

## {} وەفدی کوردەکان:

شەوی پینجشەممە ٩/١٨ گەیشتە پایتەخت وەفدیك لە لیوای کەرکوك و چەمچەماڵەوە کە پیکهاتوە لە ٧ کەس کە ئەمانەن: سەید محەممەد ئەفەندی رەئیسی جەباری، عەبدولکەریم وادی رەئیسی زەنگەنە، رەئیسی عەشیرەتی بزەینی، سلیمان ئاغای هەمەوەند، رەشید ئاغا رەئیسی شوان، عەلی ئاغا رەئیسی سنجاوی. دیدەنی فەخامەتی رەئیسی وزەرایان کردو دەسگرتنیان بە یەکیتی عیراق و خۆبەستنەوەیان بە عەرشی جەلالەتی مەلیکەوە دەربری. هەر ئەم وەفدە رۆژی دوینێ سەردانی پایەبەرز وەزیری ناوخۆ جەمیل مەدفەعی و وەزیری دیفاع جەعفەر عەسکەری‌یان کرد. ئەم وەفدە پیشوازی لە دو نوینەر کرد: یەکیکیان هی بیلاط شیخ عەبدوللا ئال مەضایفی، دوەمیان سەروەزیران و یاوەرەکەی جەمیل بەگی روحی. وەفدەکە لە ئوتیلی ماجستیك دابەزینران.[71]

## {} وەفدی لیواکان بۆ بەخیر هاتنەوەی خاوە شکۆ:

مەلیك فەیصەل لە ١٩٣٠/١٠/١ گەیشتەوە عیراق. ئەم وەفدانە چونە بەغداد بۆ بەخیرهاتنەوەی:

**وەفدی سلیمانی:** ١-مەحمود ئەفەندی سەرۆکی شارەوانی. ٢-ئەحمەد بەگی حەمە سالح بەگ. ٣-حاجی مەلا ئاغا عەبباس ئاغا. ٤-عوسمان ئاغای عومەر ئاغا. ٥-نەجیب ئەفەندی غەتاح ئەفەندی.

**وەفدی هەولیر:** ١-عەبدوللا ئەفەندی ئەلموفتی. ٢-ئیبراهیم بەگ ئەلیوسف.

**وەفدی کەرکوك:** ١-حاجی محەممەد عەلی قیردار. ٢-موظەفەر بەگ ئەلیەعقوبی. ٣- جەمیل بەگ بابان (کفری). ٤-محەممەد رەشید ئاغای هەمەوەند (چەمچەماڵ). ٥-دارا بەگ رەئیسی داودە (چەمچەماڵ). ٦-رەفعەت بەگ رەئیسی داودە (چەمچەماڵ). ٧-فارس بەگ رەئیسی داودە (چەمچەماڵ). ٨-نەجیب بەگ

---

[70] ژیان، ژ٢٦١، ٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٠

[71] الزمان، ع٢٦١، ١٩٣٠/٩/٢١

رەئیسی تالەبانی (چەمچەماڵ). ٩-نوری ئەفەندی (مەسیحی). ١٠-ئیسحاق ئەفرایم (موسەوی).

موصل: ١-حازم شەمدین ئاغا. ٢-شیخ حەبیب سەعید (میری شیخان). ٣-شیخ غیاثەدین.[٧٢]

## {} وەفدی کوردستان

**بێ کەس**

((پینج خشتەیەکی لەسەر شیعری پیرەمیرد))

*قەدری میللەتتان بەجارێ شکان*
*نە حەیاتان ما نە ناوونیشان*
*باری تەعنەتان وا هاتە سەرشان*
*((وەفدی کوردستان، میللەتفرۆشان*
*هەرزە وەکیلی شاری خامۆشان))*
*حاجی توتنەکەت مادەم فرۆشرا*
*قیروسیا لە صەد کوشتن و هەرا*
*دەخیلە هەستە ریکەوە خیرا*
*((دەسکێ لەو گولەی باغەکەی سەرا*
*کەوا بە خوینی لاوان ئاو درا))*
*تاقمێ ریکخەن زۆر بە پەرلاقی*
*بە بەزمو رەزمو ئاهەنگ و ساقی*
*بۆ ئەوەی بکەن دەفعی مەراقی*
*((بیبەنە بەردەم عەرشی عیراقی*
*بلین یار باقی و، هەم صوحبەت باقی))*
*نە بارانتان دی، نە با ئەی فەقیر*
*نە لاوان کوژران بە گوللەو شەستیر*[١]

[٧٢] الزمان، ع٢٧٠، ١/١٠/١٩٣٠

[١] ئەم نیوە بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆرەیە:
نە لاوان کوژران بە سونگی و شەستیر

*نه پێی نازداران خرایه زنجیر*

*((پەردەو تارای سور بەرن بۆ ئەمیر*

*بلین پاش کوشتار هیشتا تۆی دلگیر؟))*

*هاوا به مالم چیمان پێ کرا*

*له چارەکیکا صەدمان لی خرا*[2]

*هیشتا خەڵاتیان ئەکەن به بەرا*

*((دەك خەجالەت بن له روی مەحشەرا*

*ئیمەش خاکی غەم ئەکەین به سەرا))*

*قەت وا تێ نەگەن چاومان شکاوە*[3]

*کوشتن‌و برین دائیم بۆ پیاوە*

*لەناو دۆشەکا کەی حەق سەنراوە؟*[4]

*((خەیالتان خاوە، کورد نەفەوتاوە*

*بەراتی نەجات به خویت نوسراوە))*

میللەت مەتینە عەزمی نانەوێ

له غایەی بەرزی خۆی هەر ناکەوێ

لەت‌و پەت کرێ حوقوقی ئەوێ

((من رەنگی سورم بۆیە خۆش ئەوێ[5]

مژدەی شەفەقی لی دەرئەکەوێ!))

سلیمانی ١٩٣١

---

[2] ئەم نیوە بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆرەیە:

لە چارەکیکا صەد مالی کوژرا

[3] ئەم نیوە بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم جۆرەیە:

قەت وا تێ نەگەن چاومان ترساوە

[4] کەی حەق سەنراوە: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە (حەق نەسەنراوە).

[5] سوورم: لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە (ئالم).

## هەروەها - حەمدی - وتویەتی

*بۆ هەوا ئالۆزە بۆچی لێڵ و سوورە ئاسمان ؟*
*گێژەلووکەی نەگبەتە یا فیتنەی ئاخر زەمان*
*هەوری قەهری مەوجی دەریایی غەضەب دینێتە جۆش*
*یا فورغان و دووکەڵی ئاهی هەناسە سەردەکان*
*رەنگی گوڵ بۆچی پەری، بولبول دلی بۆچی شکا ؟*
*ناکرێ ئەوەڵ بەهاری شادمانی بێخەزان*
*بەفرە باریوە لەسەر بەختی رەشی خاکی وەطەن*
*یا بەدەم شەصتیرەوە میشکی هەژارانە بژان*
*بۆ وەطەن زەرد هەڵگەراوە بەرگی سوورە شین ئەکا ؟*
*رەنگە ئەشکالی شەهیدی بێنەوامان دانیشان*
*وەك بریشکە قرچە قرچی جەرگی سك سووتاوە دێ*
*یا گورەی مەترە لۆزە قرمە قرمی طوپەکان*
*ئەم هەموو لاوە نەمامن نێژران لەم باغچەیە*
*ریشەی کوردایەتی بوو یەعنی بۆمان نێژران*
*جەژنی قوربانە سلیمانی بە مەزبەح دانرا*
*کورد مەرن بۆیە بەجارێ هەر لەوێدا سەربران*
*یان ( کە ئیبلیسی ( علیه اللعنه ) قاورمە بکا*
*کۆمەڵی ئینسان بەجارێ وائەبێ بکرین لە جان*
*بۆ شەریفی کورد خەڵاتە هاتووە سەر تا بەپێ*
*یا کەلەبچەی دەست و طەوقی گەردن و پیوەندیان*
*بۆچ مەغۆل هەڵساوە یاخو دەوری نەحسی جەنگیزە*
*قەتڵ و عامی ئەرمەنە یا حادیثەی رۆم و بەیان*
*ناوی خۆی نابوو زەمانی میللەتی کورد خۆ ژیان*
*بۆچی بەستراوە زمانی وادەبێ ئاخر زەمان*
*بۆ نەبوو قەط ئەهلی حالێ دەردارێ بۆ نییە*

*ئەم و قووعاتە چ بوو بۆچی کرا بیکا بەیان*
*چا وەطەن فەرمووی لە پەردەی سینەما وەك ( سینەما )*
*صوورەتی گیراوە فەرمور بۆت بکا یەکسەر عەیان*
*جارێ تەئریخی بنووسە جا بگۆرە قافیە*
*تا بەیاناتم بنووسی لیت نەبێ حەرفێ نیهان*
*بێهەزار ناوی سلیمانی بە تەئریخ ( مشهد ) ە*
*ئەم حسابە عاقیبەت رۆژێ دەبێ بیکا زەمان*
*مەقصەدی ئەصلی و ئەساسی هەر دوعاکەی پیشووە*
*ئیستە تیکراری بکە بەلکە بکا مەبحەث رەوان*
*رەبی مووی لێبێ زمانی و پەنجەکانی هەلوەرێ*
*هەرکەسێ گولشەن بە دەردی دۆزەخ بەرێ*

# شەهید

**گۆران**

**((بەیادی شەشی ئەیلوول ، شەری بەردەرکی سەراوە))**

*هەزارو نۆصەدو سی بوو ، شەشی ئەیلوول کە رۆژ هەلهات :*
*غریوی ویستنی حەق کەوتە ناو شاری سلیمانی ؛*
*(هەلۆ بەگ) ئەو جوانەی پر دلی بوو بۆ وەطەن ئاوات ،*
*لە پیش جەمعیکەوە تا بەرسەرا رووی هەلمەتی هانی .*

*لە گەڵ یارانی ئەیوت : ((ئەی حوکوومەت ! تا نەکەی تەثبیت*
*حوقووقی کوردەواری ، نایەوێ کورد ئینتیخاباتت ؛*
*ئەوانەی بانگکراون و تۆ بە بەقووەت دەوریان ئەگرت :*
*دەنی و قانزاج پەرستن ، هیچ نەبێ پێیان مەبالاتت !*

ئەوانە کەی لە میللەت بوون هەتا تەمثیلی رەئی کەن ؟
حوکوومەت ! ئیمە کوردین ، وا ئەلیین : (( نامانەوێ نوواب
کە داوینی غەرەز بگرن بە هەردوو دەست، وەطەن بەردەن !
نەکی ، مەشرووع نییە .. دەرکە لەسەر سەودایی ئینتیخاب ! .. ))

ئەمە جوملەی قسەو ئامالی یارانی هەلۆ بەگ بوو ،
نە نامەشرووعی تیا بوو ، نە تەجاوز بوو بە ئەمنییەت ..
کەچی عەسکەر بە مەترالیۆزەوە بۆ قەتلی عام دەرچوو ؛
درایە بەر شەقەی شەستیر رجا و ئامالی میللییەت !

شەقەی شەستیرو قرچەی دەستریژو هەلمەتی سونگی
بە خوینی وردی بێتاوان شەپۆلی خستە سەرجادە :
نەما جوانێ کە سونگی نەیسمیبێ صەد کەرەت سنگی ،
نەما پیرێ لە ریزی گوللە بووبێ قەلبی ئازادە ! ...

هەلۆ بەگ گوللەیی ئەووەڵ لە رانی دا ، دووەم دەستی :
کە خۆی و قەومەکەی وادی ، بە چەشنی شیر نرکانی ،
پەلاماری کە دا بۆ ضابطێ : یەك زللە خپ خستی ..
دەمانچەی سەنگ لە دەستی و ئاگری دا تاوەکوو توانی ...

بەڵام فیشەك نەما ، هەر ضابط و یەك دوو نەفەر کەوتن ..
لە پاشا عەسکەریش دەستریژی لی کردو بەلادا هات ؛

*لەسەر دەریای خوین بوو کەشتی‌یی عومری بەرەو مردن*
*ئەچوو ، ئەیوت : خوا حافیظ ، ئەوا ئەمرم وەطەن ! هەیهات ،*

*لە باوەشتا پشووی عومرم نەدی تاوێ بە سەربەستی ،*
*هەتا مردن زرەی زنجیری دیلی بوو لە گەردنما ،*
*ژیانم عارو ذیللەت بوو لەژێر پێڵاوی دوشمنما ،*
*بە خوین بێو ، گڵ هەلی لووشێ ، کەوابێ ، هەیکەلی هەستی ! ...*

*خواکەی بولبولی باغی سەرا ! .. هەرچەندە پاییزە ،*
*بەخەینی خۆم گولت بۆ ئاو ئەدەم ، سا بۆم بلاوینە !*
*لەگەڵ ئەو جوانە پاکانەی لە دەورم مەیتیان ریزە*
*لە خوینا وینە شیواوین ، بە دایکمان بناسینە ! ...*

*بلێ بەو بووکی تازەی یەکشەوەم گەر هاتە سەر نەعشم ،*
*نەلێ خۆی بۆ وەطەن کوشت و لەریی عەشقی منا نەژیا ..*
*وەظیفەم بوو لە پیناوی وڵاتیکا سەرم بەخشم :*
*کە تۆی پەروەردە کرد بۆ من لە داوینی چیاو کەژیا ! ...*
*ئەگەر خوای گەورە بەخشی پیت هەتیوێ ، پیی بلێ : رۆلە*
*لە من فرمیسکی ویست باوکت ، لە تۆش داوا ئەکا تۆلە ! ...*

هەلەبجە . ئەیلوولی ١٩٣٢

# بۆ کۆمەڵی ئەقوام[1]

## (عصبة الامم)

### تەرجیع بەند

-١-

*(عصبة الامم) کۆمەڵی گەورە*
*بە پیچ‌و پەنا بە فێڵ‌و دەورە*
*لە دوور بە دوور بۆ حەقی کوردان*
*تەکانت ئەدا خۆت دائەشرنگان*
*بە جۆش‌و کوڵبووی بۆ کوردی هەژار*
*ئەتگوت ئەم قەومە ئەکەم رستگار*
*لوجنەی ئینتداب[2] مەرەخەسی هات*
*گەرا کەشفی کرد سەراسەر وڵات !*
*ئەگەر راست ئەکەی هەلی سوورینە*
*بەس بۆ سیاسەت هەلمان پەرینە*

[1] ئەم هەلبەستە لە کۆواری (هاوار)دا کە لە شام دەر ئەچوو بەکوردی. وە بەتەرجەمەکراوی فەرەنسەیی بڵاوکراوەتەوە، وەهەروەها میستەر مینۆرسکی رۆژهەلا ت ناسی بەناوبانگی ئینگلیزی سالی ١٩٣٤ کە بۆ یادی هەزار سالەی(فردەوسی) هاتبوو پچی بۆ ئیران‌و هاتە سلیمانی وینەیەکی ئەم هەلبەستەی لەگەل وینەی شاعیردا وەرگرت‌و لەگەل خۆی بردی ، بەلام هیچ ری‌و شوینی دەرنەکەوت، وەهەروەها قونسلی ئیران شازادە محمد فاضل میرزا کە لە سلیمانی قونسل بوو ۆینەیەکی ناردوە بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئیران ، وە لەهیچ رۆژنامەیەکی ئیراندا نەم دی بنوسری. وەهەروەها (قرەبیدیان)ی ئەرمەنی لە دوای تەرجەمە کردنی فرەنسەیی وینەیەکی بە پۆستەدا ناردووە بۆ کۆمەلەی ئەقوام، ری‌و شۆینی ئەویش نازانم.

[2] لوجنەی ئینتیداب یەکیچکە لە لیژنەکانی (عصبە الامم) و لە سالی ١٩٢٥م دا بۆ ئیستفتای رەئی (جینوە) وە هەندی لە ئەندامەکانی هاتنە (موسل) وە هەموو شارەکانی کوردستان خواروو گەراو سەرۆکی لیژنەی ناوبراو ناوی مستەر(تلیکی)بوو.

*تەریق نابیتۆ تۆ چیت پێ ئەکەن*
*( کوتەکی دەستی میستەر هەندرسن )*[3]

-٢-

*بۆ ئەقەلیات کەوتیتە سەما*
*خزمی نەستووریت لە کوی بنیات نا ؟*
*مەر بە هیچ و پووچ بەم دەنگو باسە*
*تۆ خوینی کوردت بۆ کردە کاسە؟*
*هەر چوار دەورمان لی بو بەدوژمن*
*ئیران و تورك و....*
*نفووسی ئیمە کەم ئەکەیتەوە!*
*وەها نەستووری ریك ئەخەیتەوە؟*
*لە عدالەتا کەی ئەمە دەئبە؟*
*یاخو هەر شیوەو ئوسوولی غەربە!*
*کۆمەلی درۆ، جیگەی مەکرو فەن*
*(کوتەکی دەستی میستەر هەندرسەن)*

-٣-

*خۆ تۆ وەصی بووی، ئەقوام بوون هەتیو*
*دەمی کوردت کرد بە تەلەی تەقیو*
*غایە ئاسووری ناوی کورد بردن*
*لایەق بە خۆتە پیچ و ناو ئاخن*
*تا تۆ نەگەرای بە ناومانا*
*دەستمان گرتبو بە کلاومانا*
*بۆچ کوردت فەوتان بەم بەنوباوە*
*ئیستەش لە جینوە*[4] *خۆت مەلاس*[5] *داوە*

---

[3] میستەر هەندسەن : لە سالی ١٩٣١م دا وەزیری دەرەوەی دەولتی بەریتانیا بوو.

[4] جینوە : ناوچەی گشتی کۆمەلەی (عصبە الامم) بووە.

[5] مەلاس : ئەم وشەیە هەر بۆ حەیوانی درندە بەکار ئەهینری یەکجار بۆ بەراز.

*مەنشەئی فیتنە کۆمەلی تەزویر*

*وا ئەدەی حەقی ئەقوامی (صغیر)؟*

*کارخانەی فەساد کۆمەلی میحەن*

*(کوتەکی دەستی میستەر هەندرسەن)*

-٤-

*لە عەدالەتتان واقم ورماوە*

*لە سیاسەتتان سەرم سوورماوە*

*خوینی ملیۆنی کورد ئەرژینی*

*بۆ ئەوەی تۆزی تورك بترسینی*

*خوینی مەزلومی کوردی رووت و قووت*

*حەڵالە لەلای.....*

*لە سلیمانی جادەی بەسەرا*

*بە خویناوی کورد ئاورشین کرا*

*تۆ نەبی نایکا دوژمن بە دوژمن*

*حەق بۆ نەستووری ئیمە بۆ کوشتن*

*چۆن عاجز نابی لەم خوین رشتنە*

*لەلای تۆ ئەلبەت حقووق کوشتنە*

*ناترسی تەئریخ لەعنەت بکەن*[1]

*(کوتەکی دەستی میستەر هەندرسەن)*

---

[1] ئەم نیوە بەتیە بەلامەوە لەبگە وەدەبوایە وابوایە.
(ناترسن تەئریخ لە منەتتان بکەن).

# ئەی وەتەن

بیکەس

*ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم‌و شیوەتم بیرکەوتەوە*
*وەختی بەندی‌یو ئەسارەتم، پی بە تەوق‌و کۆتەوە*
*من لە زیکرو فیکری تۆ غافل نەبووم وا تی نەگەی*
*حەپس‌و تی‌هەلدان‌و زیللەت تۆی لە بیر بردۆتەوە*
*بەو خودایەی بی‌شەریك‌و لامەکان‌و واحیدە*[1]
*عەشقی تۆ نەوعی لە دلما ئاگری کردۆتەوە*
*ئاگریکی‌وا هەزار سال ئاوی برژینیتە سەر*[2]
*قەت. نەگرو گلپەو بلیسەی تا ئەبەد نەکوژیتەوە*
*باسی مەحزوونی‌و کەساسیی خۆت نەکەیت توخوا وەتەن*
*چونکە بەو باسە برین‌و زامەکەم ئەکولیتەوە*
*ماتەمینی تا بە کەی، دەی پی کەنەو سەر هەلبرە*
*موفتەخیر بە شوهرەتت وا عالەمی گرتۆتەوە*
*نەگبەتی لاچوو سەعادەت بۆتە پشتیوانی تۆ*
*کەوکەبی بەخت‌و فریشتەت بەرزە ئەدرەوشیتەوە*
*گەرچی بەینیکە زەلیل‌و دیلی دەستی زالمی*
*نۆبەتی شادیتە ئەمجا ناحەزت لیك بیتەوە*
*لافی میللی‌ییەت بەدەم لەم عەسرەدا کەلکی نی‌یە*
*رۆژی هەولە هەر بەهیممەت گۆی هونەر ئەبریتەوە*
*بی قسوورە چەند جەسوورە صەد شوکر ئەولادەکەت*
*وا لە ریی تۆدا لە خوینا سەیری چۆن ئەتلیتەوە*[3]
*بەسیە تەعنەم لی مەدە هەر رۆلەکەی جارانتم*
*هیندە حیلمت بی هەتاکو دەست‌و پیم ئەکریتەوە*
*شەرتە شەرتی پیاوەتی بی گەر خودا دەستم بدا*
*دوژمنت پەت بکەم وەکوو سەگ بیخەمە ژیر پیتەوە...*

---

[1] لامەکان‌و واحیدە: لە هەندی نوسخەدا نووسراوە(تاك‌و تەنیا‌و بیٚکەسە)

[2] هەزار سال : لە هەندی نوسخەی نوسراوە(بە شیددەت)و، لە هەندی نوسخەی تردا نووسراوە(کە صەد سال).

[3] وا لە ریی تۆدا : لە هەندی نوسخەدا نووسراوە (وا لە ژیر پیدا).

# ئەیلوولی خویناوی

ئەخۆڵ

بەجارێ مالی ویرانم سلیمانی خرۆشاوە
بەسەر هیچ کەس نەیەت خوایە ئەوەی لەم شارە قەوماوە
بەیانی بوو شەشی ئەیلوول لەناکاو گوللەی وەك باران
لەباری بۆ قری میللەت، ئەوی پیرەو ئەوی لاوە
بەدەم شەستیرەوە لاشە وەکو زۆربەی گەڵاریزان
لە ریدا عەینی ئەت وت بەردەبازی جۆگەلەی ئاوە
لەبەر دەرکی سەرا دیارە لە هەر لایەك تەماشاکەی
سەواسەر پر لە لاشەی مردووە شیلراوە کوژراوە
لەهەر کووچەو پەنایەکدا تەری‌و سوریت ببینیایە
ئەوە خوین‌و سروشکی دایك‌و جوانان بوو کە ریژراوە
لەکام ماڵ گویت ئەگرت هەر باوکە رۆ بوو رۆڵە رۆو کاکە
لەکوێ سەیرت دەکرد هەر لاشەیە تیکەڵ بە خویناوە
ئەوی دوینێ جگەر گۆشەو عەزیزی باب‌و دایك بوو
ئەوا ئەمرۆ لەژیر خاکا شەهیدەو چاوی لیك ناوە
دەمەو ئیوارە ئەتنواری بە وینە ریچکە میروولە:
بە ریز تابووتی کوژراوان بەرەو سەیوان ملی ناوە
چەقینیکە چە زۆلمیکە،؟ چە کوشتارو برینیکە؟؟
ئەبێ قەت بیر نەچێ هەرگیز هەتا کورد زیندوەو ماوە

# چوارینە

ساقی پیری هات... جوانیش دوعا خواز
تۆ مەی بەدەست‌و منیش هاوراز
دوا جامم بەرێ با ببریتەوە
لە دنیای فانی هیندە گلەیی‌و راز

## نامەی شیخ مەحمود بۆ سەرۆکی ئەنجومەنی ((کۆمەڵەی گەلان)) ( عصبە الامم )

پاریس ٢١ مارس ١٩٣١

بەریز جەنابی سەرۆك

شانازی ئەوەم هەیە ترس و شکاتی نەتەوەیەکتان پێ ڕاگەیەنم کە حودی خۆتان خستوتانەتە ژیر ئینتداب و پاراستنی خۆتانەوە و دەشگوترێ ئەوەی ئینتداب دەکات، پاریزەریشتە. ئەم نەتەوەیە نەتەوەی کوردە کە من زۆر شانازی بەوەوە دەکەم بەیەکیك لەوان دەژمیریم و ئیستا ئەم نەتەوەیە لە بەشی باشوری وڵاتیگەورەی کوردان کە بە عیراقەوە لیکنراوە، نیشتەجێیە.

من بە ئەرکی خۆمی دەزانم سەرنجی بەریزتان بۆ ئەو خالە راکیشم کە خاکی کوردستانی لیکنراو بە عیراقەوە، بە هیچ شیوەیەك وەك (( بین النهرین )) نەکەوتۆتە ژیر دەستی هیچ یەك لە هیزەکانی دەولەتە یەکگرتووەکان یان دەولەتە هاوپەیمانەکان. کوردەکان خۆیان لە ١٩١٨ دا چەکیان هەلگرت و هیزەکانی تورکیان ناچار کرد خاکەکەیان چۆڵ بکەن، سەربەخۆییان راگەیەند و دەولەتیکیان دروستکرد کە بەریوبەرایەتی وڵاتی بەناوی (( دەولەتی کوردستانی باشور )) گرتە دەست. لەو سەردەمەدا عیراق پشیوی تیکەوتبوو، هیشتا هیزەکانی یەکگرتوو ( متحد ) و هاوپەیمانی ( متفقین ) لە ناویدا جەنگیان دەکرد. پاشان بۆ بەدبەختی ئیمە خاکەکەمان بە عیراقەوە لکینرا و ئەوروپاش کە لافی ئەوەی لێدەدا بۆ بەرگریکردن لە ماف و دادپەروەری چەکی هەلگرتووە، لە بەرامبەر ئەم ستەمە گەورەیەدا بیدەنگ بوو. ستەمیك کە چارەنوس و داهاتووی نەتەوەیەك کەئەگەرچی نەك بە رەسمی بەڵام بە کردەوە بوو بوە خاوەن دەولەتی خۆی بەستەوە بە چارەنوسی نەتەوەیەکی دیەوە، کە نەژادو داب و نەریت و میژوو و زمان و سیمایان لەیەك جیاوازە. گەرچی هیشتا جێی سوپاس بوو کە باری ئەم ستەمە گەورەیە بەو بەلینە کەم بۆوە کە

(( کۆمەڵەی گەلان )) سەبارەت بە بەخشینی خودموختاریەکی تەواو بە کوردستانی باشوری دابوو.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەچەندان ساڵ بەسەر ئەو بەڵینەدا تیدەپەڕێ کەچی نەك هەر بەلینەکە جیبەجێ نەکراوە بەلکو بە پیچەوانەوە ژیانی خۆمان و ژن و منداڵو باوکمانمان لەژیر هەرەشەی ئاگری تۆپ و فرۆکە بۆمبهاویژەکان و ڕەشاشەدایە، بەو تاوانەی ئامادەنین ببین بە عەرەب و چاو لەرێی جیبەجیکردنی ئەو بەلینانەین کە پیمان دراوە.

دەولەتی عیراقی هیچ دوو دڵ نەبووە لەوەیشاری سلیمانی - پایتەختی کوردستانی باشور - بۆمباران بکات و کوردەکانی ئەم شارەی کوشتووە بە تاوانی ئەوەی ئامادە نەبوون بەشداری لە هەلبژاردنیکدا بکەن کە ئەو دەیەویت بۆ بەدەستهینانی ڕەزامەندی سەبارەت بە بریاریك ئەنجامی بدات کە هەموو مافە ڕەواکانی کوردان پیشیل دەکا و کۆشکی ئومید و ئارەزویان بۆ ئایندە. دەرمینێ.

ئیمە بروامان وایە ئەم تۆپ و گوللانەی بەسەر قوربانیانی کوردی دانیشتوی کوردستانی باشوردا دەبارێ، لە بنەرەتدا هیرشیکیشە دەکریتە سەر حەیاو ئابرووی (( کۆمەلی گەلان )). چونکە کوردەکان لە ژیر ئینتدابی ئەو (( کۆمەلە ))یەدان، واتە لەژیر پاریزگاری ئەودان .

ئەگەر هیزەکانی دەولەتی عەرەبی عیراقی پشتیان بە فرۆکەو سوپاکانی دەولەتی ئینگلیز نەدەبەست کە (( کۆمەلی گەلان )) ئینتدابیئەم سەرزەمینەی بەوان سپاردووە تا بە ناوی (( کۆمەلەی گەلانەوە ) بەریوەی بەرن، ئەوا میژوو دوبارە دەبۆوەو هیرشکردن بۆ بەغدا و داگیرکردنی بۆ کوردەکان وەك کاری ڕۆژانە ئاسان دەبوو. ئیمە ئامادەین و هەمیشەش ئامادە دەبین لەبەرامبەر عەرەبەکاندا، بەرگری لە وڵاتەکەمان بکەین. بەڵام لەبەرئەوەی نامانەویت توشی روبەروبونەوەیەکی چەکداری بین لەگەڵ دەولەتی ئینگلیزدا کە بەناوی ئەو (( کۆمەلە )) بەریزەوە وهەنگاو

دەنێ،ئەوا وامان بەباش زانی بۆ شکاتکردن روبکەینە (( کۆمەلی گەلان )) و داوای جیبەجیکردنی ماف و داد پەروەری بین.

بیگومان بە داواکاری ئەوەی ولاتی ئیمە بە عیراقەوە بلکینرێ و هەولدان بۆ رازیکردنمان بۆ قبولکردنی ئەم لکاندنە بە زۆری چەك، بەهیچ شیوەیەك ئەو ئاشتی و ئاسایشەی کە (( کۆمەلی گەلان )) دەیەویت لەم بەشەی دنیادا بەرپای بکات، دابین ناکریت. تا ئەو کاتەی چارەنوسی ولاتی کورد بە دەستی رۆلەکانی خۆی نەسپیرێ و تا ئەو دەمەی دەولەتیکی کوردی بەریوەبەرایەتی بەشی کوردنشینی ئەم ناوچەیە نەگریتە دەست، ئومیدیك بە ئاشتی و ئاسایش لەم ناوچەیەدا نیە. کورد کە خاوەن میژویەکی هەزار سالەن و هەمیشە لە قۆناغە جیاوازەکانی میژودا زانیویانە و توانیویانە بەرگری لە ژیان و ولات و میژوو و دەزگانەتەوەییەکانی خۆیان بکەن، ئیستا بریاریانداوە بۆ بەرگریکردنی چەکدارانە لە خۆیان تا دواکەس بمرن، بەلام مل بۆ کۆیلەیەتی عەرەبەکانی عیراق ، کە چ نەکەن. ئیمەی کورد دەمانەویت لەگەل هەموو گەل و نەتەوەکاندا دۆست بین و بەرامبەر بەهیچ گەلیکیش رقمان لە دلدا نیە. بەلام لە کاتیکدا کەسەربەخۆی تەنانەت بە هەندێ گەلی سەرەتایی ئەفەریقا وەك لیبریا دەردریت و لە گەلی وەك ئیمە زەوت دەکریت کە توانویتی بە شەرەف و ئازایەتیو قارەمانیتی و غەریزەی پالەوانی و هۆش و زیرەکی خۆی پایەیەکی مەزن لەمیژووی گەلاندا بە دەست بهینی، ئیدی ئەمە ستەمیکە کە ناتوانین لی بیدەنگ بین. بە تایبەتی کە پیش ماوەیەك دەولەتی عیراق کە تووشی نەخۆشی دەمارگیری توند رەوی نەژادی بووە، هەولێ دەدا بە پشتیوانی دەولەتی ئینگلیز و بە هۆی خویناویترین هەنگاوی جەنگیەوە، بەرگریکردنمان تیك بشکینێ .

خوین و ئاگر هەرگیز نەیتوانیووە و ناتوانن راستیە میژوەیەکان بگۆرن و سەدان هەزار کوردی وەك سەلاحەدین و کەریم خانی زەند بکەن بە عەرەب. نەتەوەی من و خودی خۆشم بە هیچ شیوەیەك دەمارگیری ئاینزایی ( مزهبی ) مان نیەو تینوی

**خویـنریژی نـین و ئەگـەر چەکیشـمان هـەلگرتووە تەنـها لەبەرئەوەیـە کـە ناچاریـان کردوین و بەسەریاندا سەپاندوین .**

**ئیمـە خواسـتی دەسـەڵاتگرتن بەسـەر هیـچ نەتـەوەو هیـچ وڵاتیکمـاندا نیـە و نامانەویت ئاغاو سەرداری هیچ کەسیك بین. بەڵام ئەوەش قبوڵ ناکەین کە خەلکانی دی بەسـەرماندا زاڵ بـن یـان جگـە لـە خۆمـان سـەردار و ئاغایـەکمان هـەبیت. ئەمـەش خۆی ئامانج و ئایدالیکە کە چەندان هـەزار کـەس لـە کـاتی ئـەم جـەنگی دوایـدا، لـە پیناویدا گیانی خۆیان فیدا کرد. ئەمە جگە لەوەی ئەمە مافیکە کە خودی (( کۆمـەلی گەلان )) هەر لەم رۆژانەی دوایدا، بۆی سەلماندوین.**

**ریگەم بدەن بە دلنیاییەوە پیتان رابگەیەنم ئەم دۆخـی شۆرشـگیریەی کە هۆکارەکەی دەگەریتەوە بۆ بەدنیەتی دەسەڵاتدارانی عیراق، کۆتایی پێ نایەت ئەو کاتە نەبیت کە هەموو مافە رەواکانی کورد بە رەسمی بناسرێ و لەبەرچاو بگیری .**

**ئەوەی ئیمە دەمانەویت داننانە بە سـەربەخۆی وڵاتەکەماندا... واتـە (( دەولـەتی سـەربەخۆی کوردسـتانی باشـور )) دا و بریـن و لـەناوچونی هـەموو پەیوەندیـەك بەدەولەتی عەرەبی عیراقەوە. جگە لەمەش پەیمانی تازەی نیوان ئینگلیز و عیراق کـە کۆتایی بە ئینتیدابی ئینگلیزی بەسەر عیراقدا دینێ، ئەو راستیە دەردەخـات کـە ئـەو ریگە چارەیەی پیشنیارمان کردووە بەتـەواوی لوژیکیـەو هیـچ ریگەیـەکی دەربـازبونی لێ نیە.**

**کۆمەلی گەلان دەبێ گەر بەسەرنجدان لە کرۆکی روداوەکانیش بووە، بگەریتـەوە بۆ بریارەکەی خۆی کە ١٩٢٥دا داویتی .**

**لەگەڵ ئەوپەری ریزمدا**
**شیخ مەحمود بە نوینەرایەتی**
**دانیشتوانی کوردستانی باشور**

# ٣- تیهەلچونەوەی شیخ مەحمود

## ٣-١ هەولدانی ئینگلیزی - عیراقی بۆ بیلایەن کردنی

تا ئەو کاتە شیخ مەحمود لە سەر سنوری ئیران لە گوندی پیران بە گۆشەگیری دانیشت بو. شیخ مەحمود دەستی لە روداوەکەی بەر دەرکی سەرای سلیمانی‌دا نەبو، هەروەها لە چالاکیەکانی هەیئەتی وەطەنییەو، جموجۆلی ئەو رۆژانەدا بیدەنگ‌و تەماشاکەر بو. مەیدانی بۆ ئەوان چۆڵ کرد بو بە شیوەی خۆیان کار بکەن‌و دەستی نەئەخستە کارەکانیانەوە. دوای کوشتاری ٦ی ئەیلول، کەسوکاری هەندیَ لە کوژراوەکان، جلی خویناوی کوژراوەکانیان برد بو بۆ شیخ مەحمودو داوای لی ئەکەن تۆڵەی خوینی بە ناهەق رژاوی کورەکانیان بسینیتەوە. دیارە حکومەت بەم هاندانەی زانیوە، بۆیە وەزیری کاروباری ناوخۆی عیراق ٤ رۆژ دوای روداوەکە نوسراویکی ئاراستەی شیخ مەحمود کردوە، داوای لی ئەکا کە بە دۆرو دەلەسەی ئەوانە فریو نەخواو کاریَ نەکا پیچەوانەی ئەو بەلینانە بیَ کە لە ١٩٢٧دا بە حکومەتی داوە.

مەندوبی سامی‌و کاربەدەستانی عیراق داوایان لە شیخ مەحمود کرد دەسبەجیَ ئەرزی عیراق بەجیَ بهیلیَ‌و بگەریتەوە ئەو گوندەی لە ئیران لیی دانیشت بو، لە هەمان کاتدا هەرەشەیان لی کردبو کە ئەگەر کویرایەلی فەرمانەکانی حکومەت نەبیَ، (ئیجرائات)ی بەرامبەر وەر ئەگیریَ. هەروەها هەرەشەیان لە دیهاتەکان کرد هەر دییەك یارمەتی یا دالدەی بدا، بۆردومان ئەکریَ.

شیخ مەحمود گویَی نەدایە ئەم هەرەشانە، دریژەی‌دا بە جولآنەوەکەی. پیرانی بەرەو شاربازیر بەجیَ هیشت‌و، کەوتە خۆپیشاندانی چەکدارو چالاکی سیاسی. دەستی کردەوە بە پەیوەندیەکی فراوان لەگەڵ سەرانی ئیلەکانی کوردو داوای لی

کردن بۆ سەندنی ماڤ کورد  هاوکاری بکەن، بەوەی پاڵ بدەن پاڵ جوڵانەوەکەیەوە، یان بەوە مەزبەتە بنوسن بۆ کۆمەڵەی گەلان.

سێ ئەفسەری کورد: مەحمود جەودەت، حامید جەودەت، کامیل حەسەن، ریزی جەیشی عیراقیو، هەندێ لە قوتابیو گەنجەکانی سلیمانی شاریان بەجێ هیشتو دایانە پاڵ جوڵانەوەکەی شیخ مەحمود.

## ٣-٢ چالاکیەکانی

شیخ مەحمود کەوتە خۆپیشاندانی چەکدارو کۆکردنەوەی هیز، لە هەمان کاتدا زنجیرەیەك نامەی نوسی بۆ موفەتیشی ئیداری سلیمانی، بۆ مەندوبی سامی بریتانی لە بەغدادو، بۆ کۆمەڵەی گەلان. لە نامەکانیدا باسی کوشتارەکەی سلیمانیو، گرتنی رۆشنبیرو ئەشراف کوردو رەفتاری خراپی حکومەتی عەرەبی ئەکا. داوا ئەکا داوودەزگای مەدەنیو سپایی عەرەب لە زاخۆوە هەتا خانەقین بکیشریتەوەو کاروباری ناوچەکە بدریتە دەس حکومەتیکی کوردی لەژیر چاودیری بریتانیا یان هەر ئەندامیکی تری کۆمەلی گەلان. گرنگترینیان ئەو نامەیەیە کە بۆ کۆمەڵەی گەلانی ناردوە.

## ٣-٣ لەشکرکیشیی عیراق

### ٣-٣-١ هەڵویستی بریتانی

ئەنجومەنی وەزیران بریاریدا بۆ سەرکوتکردنی شیخ مەحمود لەشکرکیشی بکات. داوایشی لە بریتانیا کرد یارمەتی بدا. جەیشی عیراقیو پۆلیس لیڤی لە شارباژیرەوە دەستیان کرد بە پەلاماردانیو هیزی ئاسمانی بریتانیاش کەوتە هیرشی ئاسمانی بۆ سەر ئەو دیبانەی کە هیزەکانی شیخی لی بو. تا ئارامی ناوچەکانی پینجوین، چوارتا، هەلەبجە، شارەزور، دۆلی سورداش، دەبەرندیخان، قەرەداخ...گرتەوە. بەم لەشکرکیشییانە نەیانتوانی شیخ مەحمود بگرن یا شکستی پێ بدەن. چالاکیەکانی دریژەیان کیشا.

لە ١٢ی کانونی دوەمی ١٩٣١دا لە بارەگای مەندوبی سامی بریتانی لە بەغداد، لە ئامادەبونی نوری سەعید، کۆنفرەنسیك بەستر کە مەندوبی سامی، میجەر یۆنگ، کۆرنوالیسو هەندێ ئەفسەری بریتانیو، بەشداری بون. ئەگەرچی بیروڕای نوری

سەعیدو مەندوبی سامی سەبارەت لە سەرکوتکردنی شیخ مەحمود یەك بو، بەلأم لەسەر جۆری رەفتار لەگەڵ کیشەکەدا جیاواز بو.

ئەندامیتی عیراق لە کۆمەلەی گەلاندا بو بو بە گرییەکی دەرونی سیاسیەکانی عەرەب لە عیراقدا. پییان وابو بەمە دەرگای بەهشتیان بۆ ئەکریتەوە، لەبەر ئەوە لە هەمو گفتوگۆکانیاندا لەگەڵ ئینگلیز، هەمیشە ئەم باسەیان وەکو یەکێ لە باسە سەرەکیەکانی خۆیان ئەهینایە کایەوە. ئینگلیز خەریك بو ریگەی بۆ عیراق تەخت ئەکرد ببیتە ئەندامی کۆمەلەی گەلان، بۆ ئەمەیش ئەبو ئەو گەرەنتییانەی بە کورد درا بون جیبەجێ بکرین. کاربەدەستانی ئینگلیز بۆ ئەوەی ناوبانگی عیراق لای ئەندامانی کۆمەلەی گەلان نەشیوێو، پەلامار دانی شیخ مەحمود نەبیتە هۆی تاوانبار کردنی حکومەتی عیراق بە ((سەرکوتکردنی هەستی نەتەوەیی کورد))و تەگەر لیدانی ئەندامیتیەکەی، ئەیانویست حکومەتی عیراق لە پاڵ لەشکرکیشیدا بۆ سەر شیخ مەحمود، هەندێ هەنگاویش لە بواری سەلماندنی مافەکانی کوردا بنێ، بەتایبەتی ناسینی رەسمیی زمانی کوردی. نوری سەعیدو هاوبیرەکانی پییان وابو ئەمە هاندانی کوردە!

## ٣-٣-٢ راستکردنەوەی رەئیەکی چەوت

(عبدالرزاق احمد النصيري: ل٢٣٩) لە نامەی ماجستیرەکەیدا نوسیویتی: نوری سەعید داوای لە بریتانیا کرد هیزی ئاسمانی بەکار بهینێ دژی شیخ مەحمود، بەلأم بریتانیا خۆی گنخاند تا لە ٢٤ی ئازاردا عیراق ریکەوتنی ئیمتیازی نەوتی مۆر کرد، ئینجا هیزی ئاسمانی بریتانیا لە ٢٨ی ئازاردا کەوتە پەلامار دانی شیخ مەحمود. ئەم بۆچونەی نوسەر راست نیە. چونکە:

١- هەر لەو کاتەوە کە شیخ مەحمود پیرانی بەجێ هیشت کاربەدەستانی بریتانی چ موفەتیشی ئیداری سلیمانیو، چ مەندوبی سامی لە بەغداد گەفیان لێ کردو، داوایان لێ کرد پێ نەنیتە ئەرزی عیراقەوەو دەس نەخاتە کاروباری حکومەتەوە. هەر لەسەر ئەوەیش ئامادە نەبوون هیچ نامەکارییەکی لەگەڵ بکەن.

٢- لەشکرکیشیی عیراق بەپێی راگەیاندنە رەسمییەکانی (ملاحظیە المطبوعات) لە ٨ی تشرینی دوەمی ١٩٣٠ەوە دەستی پی کردوە، ئەگەرچی بەپێی راگەیاندنەکانی دواتر راونان بەردەوام بوە بەلأم بەهۆی خراپی هەوای زستانو سەختی ناوچەکەوە پیشکەوتنیکی ئەوتۆیان بەدەس نەهیناوە، رەنگە فرۆکەیش هەر لە بەر ئەو هۆیە، یاخود لەبەر نەگونجاوی پلانە جەنگییەکانی جەیشی عیراق، بەشداری نەکردبێ.

ئەگینا لە مانگی یەکەمی سالی ١٩٣١ەوە هێزی ئاسمانی بریتانی چالاکانە بەشداری شەرەکانی کردوە. راگەیاندنێکی رەسمیی (ملاحظیە المطبوعات) لە ١٧ی شوباتدا ئەلی:

((هێزی ئاسمانی بریتانی ٩ جار بۆ پەلامارو نۆرین دەرچوەو، لەسەر داوای وەزارەتی دیفاع رەفیك لە فرۆکەکانی بریتانیا بەستراوە بە رەتلی جەیشی ناسراو بە رەتلی روشدی. ئەم رەتلە بە هۆی خراپی ئاووهەواوە لە ٣١/١/١٧ تا ٣١/١/٢١ لەسەراو مایەوە. هەواڵ هات شێخ مەحمود ئەیەوێ هەلەبجە بگرێ لە ٣١/١/٢١دا رەتلەکە بەرەو هەلەبجە جولاو چەند پیکادانێ لەگەڵ چەتەکان رویدا، هێزی ئاسمانی لە چەتەکانیدا یەکیکی لی کوشتن و یەکیکیشی لی بریندار کردن.

لە رۆژانی ١/٢٤ تا ١/١٦ لەناوچەی سلیمانی و پینجویندا بەفریکی زۆر باری و لە رۆژی ١/٢٦دا رەتلەکە بەرەو خورماڵ جولاو دەستی بەسەردا گرتەوەو هەوا خۆش بو و، هەل لەبار بو بۆ لەناوبردنی شێخ مەحمودو چەتەکانی و، ریوشوینی تۆ دانراو هێزی جەیش و پۆلیس زیاد کراو رەفیکی تری فرۆکەی بریتانی خرایە سەر ئەم رەتلەو سەربازەکان لە خورماڵ مانەوەو ئەوی تری گەرایەوە سەراو و شاملو. ئینجا لە ٣١/٢/١ جەیش چو بۆ گوندەکانی هەورامان، هێزی ئاسمانی بریتانی کەلکیکی گەورەی هەبو بۆ پاراستنی ریگەی هاتوچۆ لە نیوان هەر پینج رەتلەکەدا. چەتەکان بە شەو توانیان رو بکەنە پینجوین. جەیشی ئیران لە خواروی مەریوانەوە بەرەو ناوچەی هەورامان جولا بۆ گەمارۆدانی شێخ مەحمود لە ١٩٣١/٢/٢دا)).

٣- نوری سەعید لەکاتی گفتوگۆکانیدا لە تورکیا لە ئەیلولی ١٩٣٠دا کە گلەیی دواکەوتنی ئەو ریگەوتنە نەوتییەی لی ئەکەن ئەلی ١٠ قاتی ئیوە ئیمە پەلەی بەستنیمانە، لەو کاتەدا شێخ مەحمود بە گۆشەگیری دانیشت بو.

## ٣-٣-٣ دەنگدانەوەی لە کابینەو پارلەماندا

کیشەی شێخ مەحمود بو بە گرنگترین پەژارەی حکومەتی عیراق. بەشی چاپەمەنی راگەیاندنی لەسەر جولانەوەکانی جەیش بلاو ئەکردەوەو، رۆژنامەکانی بەغداد لی ئەدوان. ئەم باس لە ئەنجومەنی وەزیران و لە مەجلیسی نواب و ئەعیاندا باس ئەکرا. هەردوکیان لەوە نائومید بون کە کیشەی شێخ مەحمود بە شەر کۆتایی بێ. ئەنجومەنی وەزیران لە کۆبونەوەی ١٩٣١/٣/٢٤دا یەکێ لە بریارەکانی، کە بۆ چارەسەرکردنی ئەم کیشەیە دابوی، ئەوە بو: ئەو ناوچانە چۆڵ بکەن. مەلیك

قەیصەل ئەم بڕیارەی قوبوڵ نەکر، چونکە لای وابو بە نیشانەی لاوازی حکومەت لیك ئەدریتەوە.

لە مەجلیسی ئەعیانیشدا کە داوای زیادکردنی بودجەی ئاسایش‌و سازدانی چەند سەد پۆلیسیکی ئیسترسوار کرا، ئەگەرچی هەندێ لە عەینەکان لە هەلویستدا توندوتیژ بون بۆ دامرکاندنەوەی هەرچی خیراتری شۆڕشەکەی شیخ مەحمود، بەڵام هەندیکیان لایەنگری پیشاندانی نەرمی‌و چارەسەری کیشەکە بون بە ریگای لە یەك گەیشتن، لەم بارەیەوە یەکێ لە عەینەکان وتویەتی: ((... یاخیبونەکەی شیخ مەحمود لە ناوچەکانی سلیمانی‌د لەم پینج شەش مانگەدا روداپك نیە ئەمرۆ قەوما بێ، بەلکو روداویکی کۆنەو نەمانتوانیوە لەم کابرایە بسرەوینین... من راستیی چۆنیەتی کیشەی ئەم کابرایە نازانم ئاخۆ کیشەیەکی شەخسیە یان سیاسیە. ئەگەر کیشەکە سیاسیە تکا لە حکومەتی بەریز ئەکەم لەگەڵ ئەم پیاوەو لەگەڵ ئەوانەی لەگەلین لە یەك بگەن. ئەگەر کیشەی حقوقیە وەڵامی بدریتەوە تا کەی دەستەوسان رابوەستین‌و ئەم پارەیە بە خۆرایی سەرف بکرێ. تکای خۆی لە حکومەتدا دوبارە ئەکەمەوە ئەم کیشەیە تاووتوێ بکا، ئەگەر لە توانای حکومەتدا نیە بیکوژینیتەوە با رای بگەیەنێ کە ناتوانێ)).

(عەین)یکی تریش ئەلی: ((... ناتوانم لە کیشەی شیخ مەحمود تێ بگەم. لە هەمو هەلیکدا بەرگری ئەکاو هیم ئەبیتەوە. پەیمانێ یا ریککەوتنی نەوت دیتە کایەوە، شیخ مەحمود رائەپەرێ. بۆیە ئەبێ لە پیش هەمو شتیکدا شیخ مەحمود لە کۆڵ بکەینەوە، یا سەربەخۆیی بدەینێ یان راستەوخۆ یا ناراستەوخۆ لە گەلی تیك بگەین)).

بەم پییە ئەگەر شیخ مەحمود بیتوانیایە دریژە بە جوڵانەوەکەی بدا، لەوانە بو حکومەتی عیراق ناچار بێ نەرمی لەگەڵ بنوینێ‌و، گفتوگۆی لەگەڵ دابمەزرینێ.

## ٣-٤ گەلەکۆمەکێی ٣ قۆڵی

ئیران لە ١٩٢٩دا بە رەسمی دانی بە دەولەتی عیراقدا ناو، پیوەندی دیپلۆماسییان دامەزراند. بریتانیا نفوزی خۆی لەلای ئیران بەکار هینا بۆ ئەوەی هاوئاهەنگی لەگەڵ جەیشی عیراقی‌دا بکا بۆ سەرکوتکردنی جوڵانەوەکەی شیخ مەحمود. ئیران قایل بو. بۆ ئەو مەبەستە موفەتیشی ئیداری هەیئەتی ئەرکانی عیراق،

کە ئەفسەریکی ئینگلیز بو، وە سەرکردەی ناچەی رۆژهەلاتی جەیشی عیراقی چون بۆ مەریوان. لەگەڵ فەرماندەکانی ئەرتەشی ئیران پیك هاتن کە رۆژی ١٤ی مایسی ١٩٣١ لەشکرکیشی هاوبەشی دژی شیخ مەحمود دەس پێ بکەن.

ئەمە یەکەمین جار بو جەیشی عیراق و ئەرتەشی ئیران هاوئاهەنگی جەنگیی بکەن و، ئەمەیش بو بە سەرەتایەك بۆ کاری لەوە دوایان. سالی دواتر کە ئەرتەشی ئیران چوە سەر جەعفەر سولتان، جەیشی عیراق لەسەر داوای ئیران بۆ هاوئاهەنگی هیزی ناردە سەر سنور بۆ ئەوەی ریگەی پەرینەوەی لی بگرێ.

## ٣-٥ خۆبەدەستەوەدانی شیخ مەحمود: کۆتایی قۆناغیك

هەروەکو عیراق تەنگاو بو بو، شیخ مەحمودیش گیروگرفتی جیددی هەبو. حیزب یا ریکخراویکی سیاسی نەبو پشتیوانی لی بکا. دەولەتیکی دۆستی نەبو یارمەتی بدا یان لەسەر هەلبداتێ. ئەوەی هەیبو هەر ناووناوبانگی خۆی و ئەو دەرامەتە دارایییە کەمە بو، کە هی مولکەکانی خۆی بو. هیرشی بەردەوامی فرۆکەکانی هیزی ئاسمانی بریتانی تەنگیان پێ هەلچنی بو، ئەچو بۆ هەر کۆییەك لە کۆلی نەئەبونەوە. جولانەوەکەیشی لە ناوچەیەکی تەسکی سلیمانیدا قەتیس مابو، نەتەنیەوە بۆ کەرکوك، هەولیر، بادینان. تەنانەت شیخ ئەحمەدی بارزانی، کە لەو کاتەدا حکومەتی عیراق بە یاخی دائەناو، خەریك بو ریوشوینی سەرکوتکردنی دائەنا، نە هیچ هاوکاری یان هاوئاهەنگییەکی لەگەڵ هەبو، نە ئامانجی سیاسی شۆرشەکەیشی وەکو ئەو بو. ئەمانە سەرەرای گیروگرفتی لۆجستیکی نەبونی سەرچاوەی چەك و پارەو خواردن.

شیخ مەحمود هیزەکانی گویزایەوە گەرمیان. لەوەیش مەبەستی ئەوە بو گوشار بخاتە سەر کەرکوك و، ئەگەر بتوانێ کەرکوك بگرێ. هیزی ئاسمانی بریتانی بێ پسانەوەو، هیزی زەمینی جەیش و هیزی پۆلیسی سوارەو هیزی لیڤی بە دوایەوە

بون. له گوندی ئاوباریك قرسەتیان لی هیناو پەلاماریاندا. شیخ مەحمود لەم شەڕەدا نەك هەر شاکا، بەلکو لە مەسەلەی کاری چەکدار نائومید بو. هیزەکانی شیخ مەحمود لەگەڵ هیزەکانی عیراق و بریتانیا زۆر نابەرامبەر بون، جگە لەوەیش عەشایەری هاودەنگی شیخ وەکو بەلینیان پێ دابو بە دەنگیەوە نەئەهاتن، عەشایەری لایەنگری حکومەت کەوتنە چەك هەلگرتن دژی جوڵانەوەکە. شیخ مەحمود گەرایەوە ناوچەی سنور، بەڵام ئەمجارە حکومەتی ئیرانی‌یش هیزەکانی خۆی لە مەریوانەوە هینا بوە سەر سنورو، خۆیان ئامادە کرد بو بۆ لەشکرکیشیی هاوبەش. شیخ مەحمود کەوت بوە نیوان دو بەرداشەوە، بەرنگاریی بە بیهودە ئەزانی، بەتایبەتی دوای ئەوە لای وابو ئەو ئیتر ئەرکی نەتەوەیی خۆی بەجێ هیناوەو، پەیامی گەلەکەی بە گەلانی جیهان گەیاندوە، بریاری خۆ بەدەستەوەدانی‌دا.

شیخ مەحمود، کە لە مانگی ئەیلولەوە دەستی کرد بوەوە بە شۆڕی چەکدار، لە ١٣ی مایسی ١٩٣١دا لە پینجوین خۆی بە دەستەوە داو، هەر لەویوە بە فرۆکە کویزایانەوە بۆ خواروی عیراق و لەسەماوە دایان نیشاند. بە خۆبەدەستەوەدانی شیخ مەحمود ئیتر تۆماری خەباتی سیاسی - چەکداری کورد لەو قۆناغەدا پیچرایەوەو، بانگی سەربەخۆیی کوردستان و داوای دامەزراندنی حکومەتی سەربەخۆی کوردی، بە یەکجاری خنکا.

# بەلگەکانی:
# ٣- تیهەلچونەوەی شیخ مەحمود

{} **بەشی نامەنوسی نهینی**

**س/ ٢٩٨٠**

**رۆژی ١٠ی ئەیلولی ١٩٣٠**

**بەریز جەنابی شیخ مەحمود**

**سلاوو ریز**

**ئەبێ هەوالی ئەوەتان پێ گەیشتبێ کە هەندێ نەزان لە شاری سلیمانی لە ٦ی ئەم مانگەدا بە بۆنەی هەلبژاردنی هەیئەی تەفتیشیەوە ئەو دەستدریژییەی لەلایەن ئەوانەوە کراوەتە سەر هیزەکانی پۆلیسو جەیش کە حکومەتی ناچار کردوە ریوشوینی تەمێ کردنی ئەو ئاژاوەگیرانە دابنێ کە بەرپرسی ئەم کارە داخدارەنو، هیشتا لیکۆلینەوە لەگەڵ ئەوانی تریان بەردەوامە. ئاسایش لەپاش چەند دەقیقەیەك گەراوەتەوە شارو شتێ نەقاوماوە بیشیوینێ.**

**پییان راگەیاندین هەندێ ئاژاوەگیری کە پیشەیان دروستکردنی گیروگرفتە هەوڵ ئەدەن هەواڵ هەڵ ببەستنو هانتان بدەن بۆ کردنی کاری پیچەوانەی ئارەزوی حکومەتو پیچەوانەی مەرجەکانی ئەو ریککەوتنەی لە ١٩٢٧/١/١٩دا لەگەلتان کراوە. ئیمە باوەرمان بە لیزانیو هەلویستی دروستتان هەیەو، باوەر ناکەین شوین هەولی هەندێ پیاوخراپ بکەون، بۆیە ئەم نامەیەمان بۆ ناردن داوای خۆ لادانتام لێ بکەین لە هەر شتێ کە هیمنییو ئاسایشی گشتی تیك ئەداو مەرجەکانی ریککەوتنی**

گۆریـــن هەلئەوەشـــینێ، بەمـــەش دلســـۆزی خۆتـــان بـــۆ حکومـــەت ئەســـەلمینن‌و بەلینەکانتان بەجێ ئەهینن، لەگەڵ ئەوپەری ریزدا.

وەزیری ناوخۆ جەمیل مەدفعی (عبدالرزاق الحسنی: تاریخ الوزارات العراقیە، ص٧٤)

{} **وەزارەتی داخلیە**

ژمارە: س/٢٥١٣

رۆژ: ١٩٣٠/١٠/٢

بۆ شیخ مەحمود ئەفەندی

بەپێی ئەو موقاوەلەیەی کە لە ١٩٢٧دا ئیمضاتان کردوە بۆ مەوادی خوارەوە تەعەهودتان کردوە:

١- کە خۆت‌و کورەکانت‌و ژنەکانت‌و فاطمە خانی خوشکت لە دێیەکدا دانیشن کە خاریجی حدودی عیراق بیت.

٢- کە خۆت‌و ئەو کەسانەی لە فەقەرەی یەکەمدا ذیکر کراوە بە ئیذن‌و موساعەدەی حکومەت داخلی مەملەکەتی عیراق نەبن

٣- کە نە خۆت‌و نە هیچ کەس لەو شەخصانەی لەسەرەوە ذیکر کراون بە هیچ نەوعێ نە لە لیوای سلیمانی‌و نە لە جیگایەکی تردا لە عیراقدا موداخەلەی ئیدارەی حکومەتی عیراق نەکەن‌و بۆ ئەم مەقصەدە خەلقی تر تەشویق نەکەن‌و چە خۆت‌و چە ئەوان لە هەمو مەسئیلیکی سیاسیە کە عەلاقەی بە عیراقەوە ببێ لە موداخەلە کردنی ئیجتیناب بکەن.

کەذالیکە موافەقەت کرا کە ئەگەر خۆت وە یا هەر کام لەو شەخصانەی کە بەحثیان کرا لە هەر وەقتیکدا یەکێ لەم شەرطانەیان بەجێ نەهینا حکومەتی عیراق هیچ مەسئولییەتیکی بەسەرەوە نەمینێ‌و هەر ئیجرائاتێ بە لازمی بزانێ بۆ ئیتیخاذ کردنی سەربەست بێ.

ئەگەرچی لە ١٠ی ئەیلولدا لە طەرەف فەخامەتمەئاب موعتەمیدی سامی‌و وەزیری داخلیەوە ئەو تەعوهدانەی کە داوتانە بە حکومەتی عیراق هینرایەوە بیرتان‌و ئەگەرچی تەوصیە کران لە کەملی سکونەتدا لە دێی پیراندا بمیننەوە ئیوە گویتان نەدایە ئەو ئیخطارانەو بێ ئیذن داخلی خاکی عیراق بون.

دیسانەوە وەکیلی موتەصەرریفی سلیمانی لە کاغوزی ۱۸ی ئەیلولدا ئیخباری کردن کە ئیوە موغایری ئارەزوی فەخامەتمەئابان مەندوبی سامی و وەزیری داخلیە حەرەکەت ئەکەن و شەرایطی ئەو ئیتیفاقنامایەی کە ئیمضاتان کردوە شکاندوتانەو بۆی نوسین کە بۆ ئەو دییە کە خاریجی حدودی عیراقە فەورەن عەودەت بکەنەوەو ئەو ۳ ضابطە کوردە کە لە جەیشی عیراق رایان کردوەو زانرا بو کە لەلای ئیوەن تەسلیمیان بکەنەوە.

ئەم ئەوامیرەی کە وەرتان گرت دیسانەوە خستانە گۆشەی نیسانەوەو لەو وەختەوە بەو غایەی کە شۆرش بەرپا بکەن لە مەناطیقی لیوای سلیمانی‌دا ئەسورینەوە.

لە ۲ی تشرینی ئەوەڵدا تەکلیفی موفەتیشی ئیداری سلیمانیتان کردوە کە لە شارباژیردا مولاقاتتان بکا و موفەتیشی موما ئیلەیهی جوابی دانەوە کە لەبەر ئەوەی بەبێ ئیذنی حکومەت داخلی خاکی عیراق بون و لەبەر ئەوەی ئیطاعەتی ئەو ئیخطارات و ئەوامیرەیان نەکردوە کە تەوجیهتان کراوە مومکین نابێ کە مولاقاتتان بکات و دیسانەوە تەبلیغتان کرا کە بیلا تەئخیر بۆ پیران بگەرینەوە.

وا ئیستا عەینی ئەوامیرتان بۆ تیکرار ئەکەمەوە کە بۆ پیران عەودەت بکەنەوەو ئیخطارتان ئەکەم بە گەیشتنی ئەم کاغەزە ئەگەر دەستبەجێ ئیطاعەتی ئەوامیری سالیفولذیکر نەکەن لە حەق خۆتان و ئەتباعتان ئیجرائات ئیتیخاذ ئەکرێ و هەر ئەملاکیکتان لەم مەملەکەتەدا ببێ موستەحەقی موصادەرە ئەبێ. وەزیری داخلیە.[73]

## {} ئیدارەی موعتەمیدی سامی لە عیراق

تاریخ ۲۰ تشرینی ئەوەڵی ۱۹۳۰

بۆ شیخ مەحمود ئەفەندی

سەلەفی من چەند کاغەزیکی لە ئیوەوە وەرگرتوە بەڵام هەتا لە خاکی عیراق نەچنە دەرەوەو ئەو تەعوهدانەی کە کردوتانەو لە ئیتیفاقنامەی سالی ۱۹۲۷دا ئیمضاتان کردوە بە جێ نەهینن پیم ناکرێ موخابەرەتان لەگەڵ بکەم.

دیارە دەر خاطری ئەکەن کە یەکێ لە شەرایطی ئیتیفاقنامەی مەذکور ئەوە بو کە بێ ئیذنی حکومەت داخلی عیراق نەبن و بە هیچ کلۆجێ دەخلتان بەسەر ئیدارەوە نەبێ کە حکومەتی عیراق لە لیوای سلیمانی وە یا لە جیگایەکی تری عیراق تەعقیبی

[73] ژیان، ۲٦۲، ٦ی تشرینی دوەمی ۱۹۳۰

ئەكاتو بۆ مەقصەدیكی وەها كەسی تر تەشویق نەكەنو لە مەسائیلی سیاسیەی عیراق خۆتان دور بگرن.

ئیوە بەو ئیخطاراتە كە تەوجیهتان كراوە ئیطاعەتتان نەكردوەو گویتان نەداوەتە ئەو نەصیحەتانە كە لە طەرەف فەخامەتمەئابانو وەكیلی مەندوبی سامیو وەزیری داخلیەوە لە كاغەزی رۆژی ١٠ی ئەیلولی ١٩٣٠ بۆتان نوسراوەو دیسان موخالەفەتی ئەوامیری وەكیلی موتەصەرریفی سلیمانیشتان كردوە كە بە تاریخی ١٨ی ئەیلولی ١٩٣٠ بۆی ناردونو لەو كاغەزەدا ئەمری پێ كردبون كە ئەبێ دەرحاڵ لە ئەراضی عیراق بچنە دەرەوە وا ئیستا منیش ئەمەوێ ئیشراكی ئەو ئەمرانە بكەم كە لە طەرەف وەزیری داخلیەوە بە ئیوە دراوە بۆ ئەوەی كە فەورەن لە خاكی عیراق بچنە دەرەوەو ئیتر واز لە موداخەلە كردنی ئوموری حكومەتی عیراق بهینن‌و بەم واسیطەیەوە ئیخطارتان ئەكەم كە عەدەم ئیطاعەت بەم ئەمرانە ئەبیتە موجیبی عاقیبەتیكی وەخیمە بۆ خۆتانو طەرەفدارانتان. مەندوبی سامی عیراق.[٧٤]

## {} بەیاننامە بۆ كوردەكانی لیوای سلیمانی

بەپێی ئیتیفاقنامەیەك كە لە سالی ١٩٢٧دا ئیمضای كردوە شیخ مەحمود تەعەهودی كرد بو كە لە دێیەكدا لە خاریجی حدودی عیراقدا ئیقامەت بكاو بەبێ ئیذنی حكومەتی داخلی عیراق نەبیتەوەو بە هیچ وەسیلەیەك نە لە لیوای سلیمانیو نە لە هیچ جیگایەكی تری عیراقدا موداخەلەی ئیدارەی حكومەتی عیراق نەكا.

شیخ مەحمود ئەم شەرطانەی هەمو شكاندەوەو هەرچەند ئەمری پێ كراوە كە خاكی عیراق بەجێ بهیلێ ئیطاعەتی ئەو ئەمرانەی نەكردوە كە دراویتێو لەم چەند هەفتەی رابوردوەدا لە مەناطیقی لیوای سلیمانیدا دەستی كردوە كە لە ضیدی حكومەت شۆرش بەرپا بكا.

لەبەر ئەوە ئەمری پێ كراوە فەورەن خاكی عیراق بەجێ بهیلێو ئەگەر ئیطاعەتی ئەم ئەمرە نەكا لە حەقی خۆیو ئەتباعی ئیجرائاتی لازمە ئیتیخاذ ئەكرێ.

بینائەن عەلەیهی وا ئیخطارتان ئەكەین كە هەر كەس پەنا بدا بە شیخ مەحمودو ئەتباعی وە یا موعاوەنەتیان بكا خۆی توشی جەزای شەدید ئەكا. ١٩٣٠/١٠/٢٠.[٧٥]

---

[٧٤] ژیان، ٢٦٢، ٦ی تشرینی دوەمی ١٩٣٠

[٧٥] ژیان، ٢٦٢، ٦ی تشرینی دوەمی ١٩٣٠

## {} بەیان لە ( ملاحظیە المطبوعات )ەوە ١٩٣٠/١١/١٢

حکومەتی عیراقی هیزیکی جەیشی لە سلیمانی سازدا، ئەم دو رەتلەی لێ رەوانە کردون: رەتلی ئەلف بۆ پینجوین و رەتلی ب بۆ چوارتا.

چەتەکان پیش گەیشتنی رەتلی ئەلف پەلاماری مەخفەری پینجوینیاندا، بەڵام کوردە موالیەکانی حکومەتی عیراق دەریان کردن. پاش ئەوەی رەتلی ئەلف چەند رۆژێ لە نزیك چوارتا راوەستا بەرەو شوینیکی نزیکی بەیانان لەسەر روباری سیوەیل کشا.

شەوی ٨ - ١٩٣٠/١١/٩ چەتەکان هیرشیان کردە سەر رەبیەیەکی معەسکەریکی چەپەك، ئەو رەبیەی بەرگرییەکی ئازایانەیان کرد لە ٦ کەس ٥یان بریندار بون بەڵام لە چەتەکان ٢ کەس کوژراو ٢ کەس بیندار بو.

هەردو رەتڵ رۆژانە لە ئاواییەکانی دەوروپشتی بنکەکانیاندا خۆیان پیشان ئەدەن و کارەکانیان باش ئەرواو لەو پەری هیمەت و چالاکی دان. بنکەی هیزی ئاسمانی هاوکاری لەگەڵ هەردو رەتڵ کردوە.[٧٦]

## {} راگەیاندنی رەسمیی لە ( ملاحظیە المطبوعات )ەوە

لە ١٩٣٠/١٢/١٨دا رەتلیکی جەیش شیخ مەحمودی لە کانیەکی نزیك گوندی حاجی ئاوا دەرکرد، لە کاتیکدا جەیش فریای مەخفەری پۆلیسی سورداش لە ٣٦ میل لە سەروی رۆژئاوای سلیمانی کەوت.

چەتەکان لە ١٩٣١/١/٣دا لە دەوری گوندی سەراوی نزیك هەلەبجە بە ماوەی ٣٧ کم و، لە ١٩٣١/١/٩دا دەستیان بەسەر مەخفەری پۆلیسی خورماڵدا گرت و، لە ١٩٣١/١/١٠دا هەلیانکوتایە سەر مەخفەری شانەدەری لە ٥ کم سەروی رۆژهەڵاتی سەراو لەسەر ریگەی پینجوین و، لە ١٩٣١/١/١٢دا رەتلیکی جەیش چوە سەریان.

شەوی ١٣ - ١٩٣١/١/١٤ تاقمێ لە چەتەکان کە پیکهاتبو لە ٥٠ کەس پەلاماری ٣ رەبیەی معەسکەری رەتلەکەی سەراویاندا رەبیەکان راویان نان. شەوی ١٥ - ١٦و

---

[٧٦] ندا الشعب، ژ٣٢٨، ١٩٣٠/١١/١٤

١٦ – ٩٣١!/١/١٧ تەقەیان لە معەسکەرەکە کرد یەك سەباز شەهید بو، یەکیکیش لە شۆرشگیرەکان کوژراو چەند کەسیکیشیان بریندار بو.[٧٧]

## {} راگەیاندنی رەسمیی ١٩٣١/٢/١٧

هیزی ئاسمانی بەریتانی ٩ جار بۆ پەلامارو نۆرین دەرچوەو، لەسەر داوای وەزارەتی دیفاع رەفیك لە فرۆکەکانیی بەریتانیا بەستراوە بە رەتلی جەیشی ناسراو بە رەتلی روشدی. ئەم رەتلە بە هۆی خراپی ئاووهەواوە لە ١٩٣١/١/١٧ تا ١٩٣١/١/٢١ لەسەراو مایەوە. هەواڵ هات شیخ مەحمود ئەیەوێ هەلەبجە بگرێ لە ١٩٣١/١/٢١دا رەتلەکە بەرەو هەلەبجە جولاّ و چەند پیکادانێ لەگەڵ چەتەکاندا رویدا، هیزی ئاسمانی لە چەتەکانیدا یەکیکی لی کوشتن و یەکیکیشی لی بریندار کردن.

لە رۆژانی ١/٢٤ تا ١/١٦ ١ لە ناوچەی سلیمانی و پینجویندا بەفریکی زۆر باری و لە رۆژی ١/٢٦دا رەتلەکە بەوە خورماڵ جولاّو دەستی گرتەوەو هەوا خۆش بو و، هەل لەبار بو بۆ لەناوبردنی شیخ مەحمودو چەتەکانی و، ریوشوینی تر دانراو هیزی جەیش و پۆلیس زیادکراو رەفیکی تری فرۆکەی بەریتانی خرایە سەر ئەم رەتلەو سەربازەکان لە خورماڵ مانەوەو ئەوی تری گەرایەوە سەراوو شاملو. ئینجا لە ١٩٣١/٢/١ جەیش چو بۆ گوندەکانی هەورامان، هیزی ئاسمانی بەریتانی کەلکیکی گەورەی هەبو بۆ پاراستنی ریگەی هاتوچو لە نیوان هەر پینج رەتلەکەدا. چەتەکان بە شەو توانیان رو بکەنە پینجوین. جەیشی ئیران لە خواروی مەریوانەوە بەرەو ناوچەی هەورامان جولاّ بۆ گەمارۆدانی شیخ مەحمود لە ١٩٣١/٢/٢دا.[٧٨]

## {} بەیان لە ( ملاحظیە المطبوعات )ەوە ١٩٣١/٣/١٨

پلانیك دانرا بۆ پاریزگاری مەخفەرەکانی پۆلیسی هەلەبجەو خورماڵ. لە ١٩٣١/٣/٤دا ئەندازیاری ئەشغال کەلوپەلی پاریزگاری لەگەڵ خۆی لە سلیمانی هەلگرت و بەرەو خورمال و هەلەبجە چو ٤ سیارەی سریەی رشاشات ئەیانپاراست.

---

[٧٧] مجلە لغە العرب، ج٢، سالی٢، شوباتی ١٩٣١، ل١٥٨

[٧٨] الاستقلال، ع١٣٥٩، ١٩٣١/٢/١٨

قافلەکە چو بـۆ رۆژهـەڵاتی هوانـە چەتـەکانی شـیخ پـەلاماریاندا. شـەر ٧ سـەعاتی خایاند ١ زابت سەف شەهیدو ١ سەرباز زامار بو. قوەی سیارە بەرگریـەکی توندیـان کرد ئینجا قافلەکە لە ١٩٣١/٣/٥دا گەرایـەوە بۆ سـلیمانیو، لـە رۆژی ٣/٧دا رەتلەکە روی کردە هەڵەبجـە لـە لای خـواروی رۆژئـاوای گونـدی ویلەکـەوە، دیسـان قافلەکـە گەرایـەوە بـۆ سـلیمانیو، لـە ١٩٣١/٣/١٠دا هـیزی ئاسمـانی بریتـانی لـە ناوچەکـەو ریگەی سلیمانی هەڵەبجەی ئەنۆری لەو ریکەیەدا لە چەتـەکانیداو، لـە نزیـك موانـەوە شـەریك بـو. فرۆکـەکان چەتـەکانیان لـە ١٩٣١/٣/٩دا لـە نـەوتی لـە دۆڵـی قـەرەداخدا بینییو لییان دان.[٧٩]

{} راگەیاندنێ لە (ملاحظیه المطبوعات)ەوە ١٩٣١/٤/٢٢

چەند کەسێ لـە تیرەی شـەرەفبەیانی کـە عوسمـان بـەگ سـەرۆکیانە تەقـەیان لـە حەسحەسی پۆلیس کردوە لە ناحیەی هۆرینو شیخان لە خواروی چەمی سیروانو ١ پۆلیسیان کوشتوە. عوسمان بەگ هاواری بۆ شیخ مـەحمود بردوە. تاقمێ لایـەنگری شیخ مـەحمود بـە یارمـەتی ئـەوانو هـەندێ کەسـی ئیلـی جاف چونەتـە نـاو ناحیـەی هۆرینو شیخانەوەو مەخفـەری پۆلیسـی بیلولـەیان ئابلۆقـەداو، کەوتنـە کۆکردنـەوەی باج لە خەلك. هیزی ئاسمانی لە بەغدادەوە نیردرایە سەر یاخیەکان، بەڵام توانییـان خۆیان لە فرۆکەکان رزگار بکەن بەوەی پەنایان بردە بەر دیهاتەکانی دەوروپشت.

لـە ١٩٣١/٣/٢٤دا بـەیانیك بەسـەر دیهاتـەکاندا بـەر درایـەوە کـە فرۆکـەکان بۆردومانی ئەو دییانە ئەکەن کە داڵدەی یاخیەکان بدەن. لە ١٩٣١/٣/٢٨دا فرۆکـەکان یاخیەکانیان لە گوندەکـانی شـاوازی، کـانی مـارانو نـارین بـەدی کـردو، راپۆرتـەکانی مەخفەری پۆلیسیش بونی لەو دییانەدا تەئیید کردو، بۆ وریاکردنەوەیان بەیانیان بۆ بەردرایـەوە. خـەلك گوندەکانیـان چۆڵ کـردو داوا لـە عوسمـان بـەگ کـرا خـۆی بـدا بـە دەست حکومەتەوە بەڵام رەفزی کردو، فرۆکـەکان کاریـان کـردە سـەر ورەی یاخیـەکان کـە لـە ئەشـکەوتەکاندا خۆیـان شـاردبوەوە، گـەمارۆی مەخفـەری بیلولـە شـکینراو، یاخییـەکان، لــە ئـەنجامی بـەکارهینانی هـیزی ئاسمـانیدا، نـەیانتوانی نـاوەندی قورسایی خۆیان بگویزنەوە خواروی چەمی سیروان.[٨٠]

---

[٧٩] الاستقلال، ع١٥٦٥، ١٩٣١/٣/١٨

[٨٠] الاستقلال، ع١٥٧٨، ١٩٣١/٤/٢

## راگەیاندنی رەسمیی لە ( ملاحظیه المطبوعات )ەوە

١- راگەیاندنی رەسمیی رۆژی ١٩٣١/٣/١١ کە شیخ مەحمود پەلاماری ئەفسەری ئەشغالی گشتیدا لە نزیك موان لە سەر ریگەی سلیمانی بۆ خورماڵو هەلەبجە، لەبەر ئەوە لە تواناداا نەما لەشکرکیشیی دوا بخرێ.

٢- لە ناوچەی سلیمانیدا جەیش لەگەڵ پۆلیسی سوارە کۆبوەوە.

٣- لە بەیانی ١٩٣١/٣/٢٨دا لەشکرکیشی دەستی پێ کرد. رەتلیکی گەرۆکی پۆلیس لە قەرەداخەوە شۆر بوەوە بۆ دۆلەکەی رۆژهەلاتی شاخی قەرەداخ کە شیخی لێ بو، مەفرەزەکانی پیادە لای خوارویان ئەپاراست. شیخ لە پەیکولی شەری کردو بە شەو لە ریگەی شاخی قەرەداخەوە توانی هەلی. لە ١٩٣١/٣/٣٠دا هیزی ئاسمانی بریتانی شوینەکەیان لە بانی قەرت دۆزیەوەو زۆر بە توندی پەلاماریاندا بەلام لە دەس دەرچو چونکە رەتلی گەرۆك بەشاخەکەدا نەیتوانی بگاتە پەیکولی بەرەو بانی قەرتو، شیخ مەحمود لەگەڵ سەید محەممەدە پچکۆل کشایەوە بۆ ناو زەنگنە لە دەوری خان زورو ئیبراهیم خانچی.

٤- قۆناغی دوەمی لەشکرکیشی سەعات ٤٢٠ی رۆژی ١٩٣١/٤/٥ دەستی پی کرد. ئەم رەتلچە گۆپتەپەی بەجێ هیشت بەرەو ناو زەنگنە کە شیخ مەحمودی تیدا بینرا بو. هیزی ئاسمانی بریتانی دیسان توانی شوینەکەی بدۆزیتەوەو گەمارۆی بدا. رەتلی گەرۆك پیشرەوی کرد بەر لە ١٥٠٠ لە چەتەکاندا لە کەریم باسام لیکیاندا و سەعات ١٧٠٠ پیادەو سوارە هیرشیکی پیرۆزیان کردە سەر شیخ مەحمودو چەتەکان لە گوندی ئاوباریك. سیەیەکی سوارە توانی لە خواروی گوندا جیگیر ببێ و فرۆکەکانی هیزی ئاسمانی بریتانیش بە دریژایی هیرشەکە لە ئاسمانەوە بە ئاگرباران پشتیوانی سوارەو پۆلیسی ئەکرد. کە تاریك داهات رەتلەکە گەرۆکەکانی قەلای گوندیان بۆ نەگیرا بو کشانەوە دۆلیکی سەروی دیەکە، رۆژی دوایی رەتلەکە توانی گوندەکەو قەلاکەی بگرێ. تا ئیستا زیانی چەتەکان نەزانراوە کە ئەلین زۆر بوە. زیانەکانی ئیمە لەم هیرشەدا ١ کوژراوو ١٨ بریندار کە دوانیان ئەفسەرن.

٥- لە ١٩٣١/٤/٦دا رەتلەکەمان گوندی ئاوباریکی گرتو کەوتە راونانی چەتەکان کە لە تاریکایی شەودا بەرەو لای رۆژ هەلات هەلاتون.[81]

---

[81] الاستقلال، ع١٥٩٠، ١٩٣١/٤/١٦

{} **بڕیاری ئەنجومەنی وەزیران لە ڕۆژی ٢٤ی ٣ی ١٩٣١دا لەسەر کێشەی شێخ مەحمود**

١- لەبەر ئەوەی ئەو سیاسەتەی تا ئیستا جیبەجێ کراوە نەبۆتە هۆی چەسپاندنی ئاسایش لە لیوای سلیمانیو، دابینکردنی ئارەزوەکانیان لە هیمنیو ئارامیدا کە ئەبێ ئەوانیش وەکو لیواکانی تر کەلکی لێ وەربگرنو، لەبەر ئەوەی درێژەدان بەم سیاسەتە ئەبێ بە هۆی زیاد بونی پشێویو، لە سۆنگەی تەماعی هەندێ کەسەوە ئەبێ بە هۆی باری قەرسی ماددیو مەعنەوی بە پیویستا زانرا لەو لیوایەدا بەریوەبەرایەتی عورفی لەو لیوایەدا رابگەیەنرێو، بەریوەبەرایەتی شارستانیو سپایی بدریتە دەس سەرکردەیەکی کارامەی سپایی تا بە تەواوی کاری جەردەیی نامینێو ئارامو ئاسایش ئەگەریتەوە جیگەی خۆی.

٢- ئەگەر بەریوەبەرایەتی عورفی رانەگەیەنرا، سەرکردەی سپایی باسکراو هەمو ئەو دەسەلاتە جەزائیو مەدەنییانەی بدریتێ کە لە نیزامی دەعوی عەشائیریدا هەیە، بە هەمو ئەو هۆیانەوە کە یارمەتی ئەدەن ئەرکەکانی بەجێ بهینێ.

٣- ئەگەر هیچ کام لەم دو ریوشوینە پەسەند نەکرا، لەباتی ئەوەی سامانو سەر بێ هودە بە فیرۆ بدرێ، ئەنجومەن بە باشی ئەزانێ ناوچەی سلیمانی چۆڵ بکرێو، بە شیوەیەکی کاتی هیزەکانی حکومەتی لێ بکیشریتەوە، تا ئەو کاتەی ریوشوین دائەنرێ بۆ گیرانەوەی ئاسایشو ئارامی بۆ لیوای ناوبراو.[٨٢]

{} **دانیشتنی ٥٤٨م، ڕۆژی ٢٩ی ٣ی ١٩٣١**

عیزەدین ئەلنەقیب (دیالە): پیش چەند رۆژێ مەجلیس خەرجی ٢ لەکو ٧٥ هزار روپیەی پەسەند کرد بۆ خەرجی ئاسایش لە سنورەکانی سەرودا.

سەرۆك: روی دەمی لە عیزەدینە، باسی (فەصلی ٥٧ أ) ئاسایشی سنورەکانی خوارو.

حاجی سەلیم (بەریوەبەری گشتی پۆلیس): بیگومان بارودۆخی سنورەکانی خوارو باش بوە، بەڵام ئەکرێ دەس لە بادیە هەلبگرین دیسان عەشایەر پەلاماری یەکتری بدەنەوە.

سەرۆك: (فەصلی ٧٥ ب) ئەخوینریتەوە، ئەلی: بۆ خەرجی سنورەکانی سەرو ٢٧٥ هوار روپیە.

تاقمێ لە نائیبەکان داوای قسە ئەکەن.

---

[٨٢] عبدالرزاق الحسنی: تاريخ الوزارات العراقيه، ط٥٩ص١٣٣-١٣٤

عـيزەدين ئەلنـەقيب (ديالـە): وتم مـەجليس خـەرجی سـنورەكانی لای سـەروی پەسند كرد (كە ٢ لەكو ٧٠ هـەزار روپيە بو). ئـەم خەرجانـەيش وەكـو زانيمـان بـۆ كوژاندنـەوەی شـۆرش يـان يـاخيبون يـان شـەقاوەت، چۆنتـان ئـەوێ نـاوی بنيـن، ياخيبونەكەی شيخ مەحمود لـە ناوچـەكانی سليمانیدا لـەم پينـج شـەش مانگـەدا روداويك نيە ئەمرۆ قـەوما بـێ، بـەلكو روداويكـی كۆنـەو نـەمانتوانيوە لـەم كابرايـە بسرەوينين... من راستيی چۆنيەتی كيشـەی ئـەم كابرايـە نـازانم ئـاخۆ كيشـەيەكی شەخسيە يان سياسيە. ئەگەر كيشەكە سياسيە تكا لە حكومەتی بەريز ئەكەم لەگەڵ ئەم پياوەو لەگەڵ ئەوانـەی لەگـەلين لەيـەك بگـەن. ئەگـەر كيشـەی حقوقيـە وەلامـی بدريتەوە تا كەی دەستەوسان رابوەستينو ئەم پارەيە بە خۆرايی سەرف بكرێ. تكای خۆم لـە حكومـەت دوبارە ئەكەمـەوە ئـەم كيشـەيە تـاووتوێ بكـا، ئەگـەر لـە توانـای حكومەتدا نيو بيكوژينيتەوە با رای بگەيەنێ كە ناتوانێ.

صالح جەبر (مونتەفيك): گـەورەكانم! چەند رۆژێ لەمەوبەر وتمان سەرفكردنی پـارەيكی زۆر لـە جـەيشدا بـە خۆرايـی ئـەروا. پييـان وتـين نـەخير ئـەو پارەيـە لـە جـەيشدا سـەرف ئـەكرێ زەرورييـەو وتيـان جـەيش خزمەتـەكانی بـە باشـی ئـەكا. حكومـەت ئيستا بـەم فەصلـەدا داوا ئەكا هـيزيكی تازە دروست بكـا لـە ٥٠٠ ئيسـتر سوار داوای لی ئـەكرێ ئاسايش لە سنورەكانی سەرودا دابين بكـا. لـە ژمـارەی ئـەو ياخييانەمان پرسی كە ئاسايشی سنورەكانی سەرويان تيك داوە، وتيـان ژمارەيـان لـە نيـوان ٤٠٠ تـا ٥٠٠ كـەس دايە. مەبەست لە دروستكردنی هـيزی ٥٠٠ ئيستر سوار لەناوبردنی ئەم عەسابەيەيە. منيش ئەليم ئەگەر جەيش كە ژمارەی ١٠ هـەزار كـەسو پۆليس كە ژمارەی ٨ هەار كەسە نەتوانن ئـەم تاقمـە لانـو ببـەن چۆن ئـەتوانين خۆمـان قانيع بكـەين كـە هـيزيكی وا بچـوك ئـەتوانێ ئـەم عصابەيـە لـەناو بـەرێ؟ جەيشـيك چەردەيـەكی زۆر پـارەی تيدا سـەرف ئـەكرێ نـەتوانێ ئاسايشـی سـەرو دابـين بكـاو ئيستا بيگۆرين بە هيزيك پێی ئەلين ئيستر سوار.

سەعد صالح (ديوانيە): نامەوێ ئەو قسانەی دوبارە بكەمەوە كە لەسەر بودجەی وەزارەتی ديفاع كردم، بەلام ئەمەوێ لە كيشەی شيخ مەحمود تێ بگەم كە ئاسايشی عيراق تيك ئەدا. لەهـەر فرسـەتيكدا عيراق هـەنگاوێ ئـەنێو بـۆ پيشـەوەو، لـە هـەمو چورتميكی سياسـیدا كـە چـاوەرێ ئـەكرێ عـيراقی تـێ بكـەوێ، اسـتغفرالله، شـيخ مـەحمود بـەم شـەرزەمەيەوە ديتـە پيشـەوە تەگـەرە لـە تەقـەللاكانی حكومـەت ئـەدا. لـە ليژنەی دارايیدا لەسەر شۆرشگير ناويان ببەين وتی ئەوانە ئەشقيان. باشە با پييان

بلیین ئەشقیا، ژمارەیان چەندە وەلامی دایەوە ٤٠٠ یا ٥٠٠. ئاخۆ ئەوانە هێزیکی نهێنیان هەیە یان ئەمە هێزە نهێنیە روالەتیەکەیانە.

ئەگەر ناتوانرێ ئەم هێزە روالەتیە لەناو ببرێ، هەمویش لایان وایە شیخ مەحمود پشت ئەستورە بەهێزیکی کە، جگە لە هێزی ئەمانە، کەواتە بەر لە وەی ٢ لەك و ٧٥ هەزار روپیە تەرخان بکەین بۆ دروستکردنی هێزی ئیستر سوار بۆ لەناوبردنی شیخ مەحمود، ئەبێ بیر لەوە بکەینەوە بە ریگەی سیاسی هێزە نهێنیەکەی لەناو بەرین. یان وەزیری دیفاع ئەبێ پێ لەوە بنێ کە ئەم جەیشە کارامە نیەو، بلین هێزەکەی شیخ مەحمود لە ٤٠٠ – ٥٠٠ کەس زۆرترەو دەرەقەتی نایەین و پیویستیمان بە چەندین ئەستول و لەشکری زل هەیە.

ناتوانم لە کیشەی شیخ مەحمود تێ بگەم. لە هەمو هەلیکدا بەرگر ئەکاو هیمن ئەبیتەوە. پەیمانێ یا ریککەوتنی نەوت دیتە کایەوە، شیخ مەحمود رائەپەرێ. بۆیە ئەبێ لە پیش هەمو شتیدا شیخ مەحمود لە کۆل بکەینەوە، یا سەربەخۆیی بدەینێ یان راستەوخۆ یا ناراستەوخۆ لەگەلی تیك بگەین. ئایا شیخ مەحمود تا هەتایە ئاسایش تیك بداو هەر رۆژێ عیراق ئەچیتە پیشەوە شیخ مەحمود بە دو دەستی ئاسنین ئەیهێنیتەوە دواوە. ئەمە کیشەی ٤٠٠ ئیستر سوار نیە، بەلکو کیشەی ژیانی ولاتیکە. ئەگەر ئەتوانین لە نوی بەرین یان مافەکانی خۆی بدەینێ.

سەلمان ئەلبەرراك (حیللە): من چی لە دلم دایە دەری ئەبرم و ئەلیم هەمو سالی حکومەت دیت و داوای خەرجی تازە ئەکا بۆ سنورەکانی سەرو بۆ تەمێ کردنی ئەشقیا، نازانم شیخ مەحمود جەردەیەو رێ ئەگرێ، شیخ مەحمود پێی ئەوترێ شۆرشکار دژی حکومەتی عیراق. دوینێ گەمارۆی زریپۆشەکانی داین، ئەوەی کرد کە کردی. هەروەکو وەزیری دیفاع وتی هێزەکەی لە ٤٠٠ – ٥٠٠ کەس تێ ناپەرێ. ئەی ئیمە جەیشیکمان نیە ١٠ هەزار سەربازو ٨ هەزار پۆلیس بە ئەفسەرو بەریوەبەرەکانیەوە ئاخۆ ٥٠٠ پۆلیسی مەشق پێ نەکراو. لە باتی ئەو هەزارانە ٥٠٠ پۆلیس مەشق پێ نەکراو ئەهێنن و ئەلین وەرن ببن بە سەرباز بۆ شەری شیخ مەحمود.. فەوجێ لە جەیشەکەمان بە ٤ بە ئۆتۆمۆبیل و شەمەندەفەر بنیرین بۆ کەرکوك. لەبەر ئەوە پیویست بە پیکهێنانی پۆلیسی ئیستر سوار ناکا چونکە چەکەکانیان تەسلیمی شیخ مەحمود ئەکەن.

حکومەت ئەبێ جەیشی بنیریتە سەرو من خۆم ئەکەم بە قوربانی ئەم جەیشە بۆ ئەوەی... هەمو سالی بە میزانیەیەکەوە بین. بەر لە دو رۆژ ١٠٢ لەك رۆپیەمان بۆ

وەزارەتی ناوخۆ تەرخان کرد. جەیش چی کردوە ئەگەر مەسەلەکە پێوەندی بە شێخ مەحمودو ئەو ٣٠٠ کەسەوە هەیە ئەوا من بە فویەك ئەتوانم دەریان بکەم.

ئەحمەد ئەلجەلیل (موسڵ): ئەمە دە ساڵە ڕوداوەکان دوبارە ئەبنەوەو دوبارە ئەبنەوە. کە لە حکومەت ئەپرسین ئەوانە ئەشقیای یاخین ئەیانەوێ خەڵك لە پارەو کەلوپەل ڕوت بکەنەوە. باوەڕم وایە ڕوداوەکانی سلێمانی ڕوداوی شێخ مەحمود نین...... دەسکەلایەکی ڕوخێنەرە کە بێ شەرەف بۆ لێدانی عیراق بەکار ئەهێنرێ. شێخ مەحمود کێشەی شۆڕشێکی سادە نیە، بەڵکو مەسەلەیەکە لەسەر ڕەفە دانراوە، هەر کات پیویست بو پێی ئەلین هەلسە حکومەت دریخی کردوە......

ئیمە لەبەر دەرگای چونە ناو کۆمەلەی گەلاندا‌ین شیخ مەحمود بەکار ئەهینرێ یان بەکاری ئەهینن بۆ ئەوەی بلین: عیراق هیمن نیەو پریتی لە شۆڕش. ئەگەر حکومەت بیەوێ لەناوی بەرێ، ئەبێ بە تەجنیدی ئیجباری بیفلیقینیتەوە. هەر یەکە لە ئیمە دەس بداتە چەکەکەیو دە ساڵ شەری ئەم شۆڕشگیرە چارەرەشە بکات. حکومەت گرتیو هینای بۆ بەغداد کەچی پێی وت بە سەلامەت برۆ، رۆیشتو شۆرشی بەرپا کرد.

مەجلیس چوی لە ٣ لەك روپیە یا بە ملیۆنی نیە بۆ سەلامەتی عیراق. حکومەت چۆن لەگەڵ ئەم شۆڕشگیرەی کە ٤٠٠ کەس زیاتر هیزی نیە گفتوگۆ ئەکا. من داوا لە حکومەت ئەکەم ئەو ئەندامە ببرێ کە کلۆر بوە یان سیل رزاندویەتی.

موزاحیم پاچەچی (وەکیلی وەزیری ناوخۆ): حکومەت سیاسی مەجلیس ئەکا سەبارەت بە بایەخ دانی بەم کیشەیە. لە هەمو دەولەتیکدا، چەند پیشکەوتویش بێ، ئەم جۆرە جولانەوانەی تیدا ئەقەومێ، لەلای حکومەتی عیراق گرنگی نیە. لام وایە برا کوردەکانمان لە سیاسەتی شیخ مەحمود رازی نینو لی موورتاح نین. جەیشو پۆلیس خەریکی کارەکانیانن، ئەبێ ئەوە بزانن شیخ مەحمود شۆرشەکەی لە وەرزی زستاندا جەس پێ کرد. ئەم وەرزە بۆ جەیش سەختەو ریگەو بانی ولاتەکەیش سەختەو، شەری عەصابات لەم جۆرە ناوچانەد ئاسان نیە. ئەوەی نائیبی موسڵ وتی کە شیخ دەسکەلایە بە دەس هەندێ لایەنەوە هەر کاتێ بیەوێ بەکاری ئەهینێ، من باوەر بەمە ناکەم. شیخ لە رابوردودا دژی عوسمانیەکانو بریتانیەکانو دژی عیراق هەستاوە. حکومەت هەندێ ریوشوینی کاریگەری داناوەو، ئەوەی ویستم بیلیم لە کاتیکدا حکومەت لە ناوچەی سلیمانیدا لەباری سیاسیەوە مەبەستیکی تایبەتی بۆ

ئەوەی تیکەڵو پیکەلی سیاسی ناو دەولەتان، پاش سێ چوار رۆژی تر ئەنجامەکانی لەم بارەیەوە ئەبیستن. شیخ مەحمود خۆی بە شۆرشو یاخیبونەوە گرتوە.[٨٣]

{} **تەبلیغی رەسمی:**

ئەو ئالآی سواری لەگەڵ قوەتی پۆلیس کە لەژیر قوماندەی عەقید (قائممقام) ئیسماعیل نامیق بەگدا بو لە تاریخی ٥ی نیسانی ١٩٣١ رویان کرد بوە ئیستیقامەتی دێی ئاو باریك کە ئیستخبار کرا بۆ شیخ مەحمود خۆیو ئەتباعی لەوینو قوەتی مەذکورە دێی ئاوباریك ئیحاطە ئەکەنو لە طەرەف طەییارەشەوە موتەمادیەن ئەشقیاکانو دەوروپشتی جێی مەذکور بۆمباردومان ئەکەن. وە لە پاش نیوەرۆوە هەتا تاریکە شەو بە شیدەت موصادەمە دەوام ئەکات. قوەتی جەیش بە دەرەجەیەکی کە شایانی ئیفتیخار بیت ئیبرازی شەجاعەتو بەسالەت ئەکەنو لەم موصادەمەیەدا ٤ عەسکەرو ١ ضابط شەهیدو ١٤ عەسکەرو ١ ضابط بریندار ئەبیت.

تەلەفیاتو خەسارەتی شیخ مەحمود جیددەن زۆرو بە دەرەجەیەك ئەبیت کە تەنها دێی ئاوباریك لە ئەششقیاکان ١٠ کوژراوو مەیتی دو کەس لە روئەسا کە یەکیکیان شیخ عەلی کوری رەحیم کە خزمی شیخ مەحمودە لە بەینی ئەم کوژراوانەدا دینراوە.

وە لە ریگای کە ئەشقیاکان فیراریان لی کردوە خوینیکی زۆر دیار بوە کە دەلالەت لەسەر ئەمە ئەکات کە شیخ مەحمود تەلفیاتیکی زۆری داوەو برینداریکی زۆی لەگەڵ خۆی نەقڵ کردوە.

ئەو عەشائیرەی کە موعاوەنەتی شیخ مەحمودیان ئەکرد هەمو بلاوبونەوە. ئیستا شیخ مەحمود تەنها لە نەجات دانی رۆحی خۆی زیاتر شتیکی تر تەفەککور ناکات.

ئەمرۆ مەوثوقەن زانیومانە کە شیخ مەحمود تەنها لەگەڵ ٥ و ١٠ سواریدا لە شاخی قەرەطاغ تێ پەریوە.

قوەتی جەیشو پۆلیس بۆ مەحوکردنی شیخ مەحمودو ئەتباعی بە شیددەت لە تەعقیب دایەو مەحوکردنیان قەوییەن مەئمولە.[٨٤]

---

[٨٣] جلسه مجلس النواب فی ١٩٣١/٣/٢٩، ص٦٧١ – ٦٧٧

## {} شەشەمین کۆبونەوەی ئاسایی مەجلیسی ئەعیان

مەحضەری ٣٨ەمین دانیشتن، رۆژی پینجشەمە، ١٩٣١/٥/١٤ بەرامبەر ٢٦ی زیحەجەی ١٣٤٩ه.

سەرۆکی وەزیران: ئەگەر مەجلیسی بەریز ریگە بدا وتارەکەم بدەم دەربارەی روداویٰ کە پەیوەندی بە یاخی شیخ مەحمودو سەرئەنجامی کارەوە هەیە.

دەنگەکان: باشە!

سەرۆکی وەزیران: گەورەکانم! ئەو کارانەی جەیشی عیراقی بە هاوکاری پۆلیسو هیزی ئاسمانی ئەنجامیدا سەرکەوتنی تەواوی بەدەس هینا. دوینیٰ شەو شیخ مەحمود خۆی تەسلیمی سەرکردەی حامیەکەی پینجوین کرد بە چەند مەرجیٰ کە حکومەت بەسەریدا سەپاند بو. ئەو مەرجانەیش ئەوەیانی ژیانی پاریزراو بیٰ و هیچی تر، حکومەت نیاوی وایە شیخ لەگەلٚ خیزانو منالەکانی بکویزیتەوە بۆ شوینیٰ دور بیٰ لە دیجلە. بە زۆری شوینی دانیشتنی لەسەر فورات دیاری ئەکریٰ. حکومەت لە هەمان کاتدا بیری لەوە کردۆتەوە، بۆ ئەوەی جاریکی تر نەگەریتەوە ناوچەکەی خۆی، قانونیٰ دابنیٰ ئەم کابرایە تا هەتایە لەویٰ دابنیشینیٰ، بە شیوەیەکی قانونی بهیلریتەوە لەو شوینەدا. ئیستا حکومەت هیچ قانونیکی لەبەر دەس دا نیە جگە لە قانونی عەشائیر کە ئەتوانریٰ بۆ ئەم مەبەستە بەکاربهینریٰ، بەلاٚم ئەم قانونە لەوانەیە ئەگەر ئەمساڵیش هەلنەوەشینریتەوە لە دوا رۆژدا هەلبوەشینریتەوە. ئەوسا حکومەت هیچ دەسەلاٚتیچکی قانونی بە دەستەوە نامینیٰ شیخ مەحمود ناچار یا وا لیٰ بکا لەویٰ بمینیتەوە، لەبەر ئەوە بیر لە ریگەیەکی قانونی ئەکاتەوە تا ئەم پیاوە لە ژیاندایە لەو جییە بهیلیتەوە کە بۆی دیاری ئەکا.

لە هەمان کاتدا ئەم هەلە بە دەرفەت ئەزانم سوپاسی حکومەتی عیراق بە مەجلیسی بەرزتان رابگەیەنمو، ئەتوانم لەوەیش تیبپەرم لەباتی حکومەتی عیراق سوپاسی گەلی عیراق پیشکەش بە حکومەتی ئیرانی بکەم کە ئەرکی خۆی بەجیٰ هیناو بە بەشداری ئەوان لەگەلٚ هیزەکانی ئیمەدا هەولەکانی ئەم دواییە سەرکەوتو، ئەگەر ئەو شەوە شیخ مەحمود تەسلیم نەبوایە بە دو هیز پەلامار ئەدرا: هیزی عیراق لە لایەکەوەو هیزی ئیرانی لە لایەکی کەوە. ئەمەیش گرنگترین هۆ بو پالی بە شیخ مەحمودەوە نا پەنا بینیٰ و خۆی بەدەست هیزەکانی عیراقەوە بداو، مەرجەکانی حکومەتی عیراق قوبولٚ بکا، کە گویتان لیٰ بو.

---

[٨٤] ژیان، ژ٢٧٩، ١٦ی نیسانی ١٩٣١

ئاصەف ئەفەندی: لام وایە مەجلیسی بەرز ئەم کارە سوپاسکراوە ئەنرخینیّ و لە خوا ئەپاریتەوە شتیّ دوبارە نەبیتەوە ئاسایش تیك بداو وڵات بۆ هەمیشە بحەسیتەوە.

مەولود پاشا: بە بۆنەی درکاندنەکانی فەخامەتی سەرۆکی وەزیران حەز ئەکەم داوا لە حکومەت بکەم، کە بەتەنیا هەر شیخ مەحمود نەگریّ، بەلکو هەمو ئەوانەیش کە یارمەتی شیخ مەحمودیان داوەو هانیان داوە. هەندیّ کەس هەن حکومەت لەوان باشتریان ئەناسیّ. بەناوی مەجلیس و گەلی عیراقەوە کە بەم جولاّنەوانە ئیشاوە پیویستە بدرینە دەس قانون بۆ ئەوەی ئەم روداوانە دوبارە نەبنەوە، بە تایبەتی بۆ ئەوەی ناحەزیی و خوینرژان و ئەم جۆرە روداوە دلتەزینانە زۆر بن یا کەم. لە کاتیکدا ئیمە ئەزانین چەندین پشتە لە نیوان ئیمەو برا کوردەکانمان‌دا جگە لە دۆستایەتی و تەبایی شتیکی تر نەبوە، هیچ کاتیّ شتیّ روی نەداوە ببیتە هۆی حزازات بۆیە داوا لە حکومەت ئەکەم تەعقیبی ئەو خائینانە بکا کە خۆیان بە جۆریکی جیاواز لە روالەتی راستەقینەی خۆیان پیشان ئەدەن.

سەرۆکی وەزیران: مەجلیسی بەرز دلنیا ئەکەم کە حکومەت ئەم پیویستە جیبەجیّ ئەکا لەو کاتەدا فەرمان دەرچوە، تەنانەت ئەم بەیانیە دوا فەرمان دەرچوە من هەیئەتیکم ناردوە بۆ لیکۆلینەوە، هەمان مەبەست جیبەجیّ ئەکا کە عەینی بەریز فەرمویان ئەویش ئەوەیە هەر کەس لەم روداوانەدا بەشداری شیخ مەحمود بوبیّ یا هانی دابیّ بداتە دەس عەدالەت و دادگا. مەجلیس ریگەم بدا کە رونی بکەمەوە مەبەستی حکومەت ئەوەی سزادان عادل بیّ، لە هەمان کات‌دا سەخت بیّ.

حاجی حسین چەلەبی شەبوط: (ولکم فی القصاص حیاە یا اولی الالباب). لە راستی‌دا شیخ مەحمود تاوانیکی گەورەی کردوە، بەلاّم لەباری سەرنجی من و فەلسەفەوە، ئەوانەی هانیان داوە تاوانەکەیان لە هی ئەو گەورەترە. پشتیوانی قسەکەی هاوکارم مەلود پاشا ئەکەم کە ئەو نۆکەرانە بدرین بە دادگا بۆ ئەوەی بیانکا بە پەند بۆ خەلکی تر بۆ ئەوەی ئەم بیرە پیسە بمریّ و کەس هەلی نەگریّ و، بەکیتی عەرەب و کوردو ئەوانی تر لە هەمو جۆرە پەلەیەك پاك بیّ. دادگا بۆ سەندنی ماف ئەبیّ بەزەیی نەزانیّ. داوا لە حکومەت ئەکەم ئەم ریوشوینانە بگریّ بۆ ئەوەی رزگارمان بکا لە رژانی خوین و بەختکردنی پارەو خەریککردنی بیر.[85]

[85] ملحقی وقائع، ژ٩٩٢، ٨/٦/١٩٣١، ل٤٧٣

### {} خۆبەدەستەوەدانی شیخ مەحمود

**( ملاحظیه المطبوعات ) ١٩٣١/٥/١٦**

شیخ مەحمود بەو مەرجانەی حکومەت بەسەریدا سەپاند خۆی بە دەستەوەدا. ئیستایش بە ریگاوەیە بۆ شوینی دانیشتنی کە حکومەت بۆی دائەنێ و ئەم شوینەش بە زۆری لەسەر کەناری فورات ئەبێ.[٨٦]

### {} لە هال ( J. H. Hall )ەوە

بۆ کادۆگان (Cadogan)

داونینگ ستریت

٢٠ی مارتی ١٩٣١

زۆر سپاس بۆ نامەی ١٨ی مارتت لە بابەت پیشنیارەکانی بەفدادەوە بۆ لەشکرکیشی چاوەروانکراو لە کوردستانی عیراقدا لەم بەهارەدا.

ئەتوان باش تێ بگەم لەو پەژارەیەی لە ترسی ئەوەی لەشکرکیشییەکە کە لە سەرەتادا مەبەستی سەرکوتکردنی شیخ مەحمودە، لەوانەیە ببێ بە اجائاتی عسکری و بتەنیتەوە بۆ سنوریکی فراوان، انطباعیکی وا بدا کە ئەمە محاولەیەکە بۆ سەپاندنی سیاسەتیکی ناشەعبی نەویستراو بە زۆر، بەسەر کوردا.

هەروەکو ئەبینی لە ئەنجامگیریەکانی کۆنفرەنسی ١٣ی جەنیوەریدا کە لە بارەگادا بەسترا، بە تحدید دانراوە کە نابێ هیچ لەشکرکیشییەك بکرێ دژی شیخ مەحمود، یان لە ناوچەکانی بارزان و پشدەردا، بەبێ موافەقەتی تەواوی حکومەتی خاوەن شکۆ، پیرەوی کردنی ئامۆژگاریەکانی مەندوبی سامی سەبارەت بە رەفتاری سیاسی لەگەڵ کورد لەلایەن حکومەتی عیراقەوە. ئەم مەرجانە ئەبێ زەماناتی کافی بن دژی کاری سپایی گەوجانەی حکومەتی عیراق.

لەبابەت ناوچەکانی بارزان و پشدەرەوە، من رونی ئەکەمەوە کە شیخی بارزان و خەلکەکەی لە چەند سالی رابوردودا لە دۆخی یاخیبونیکی پچرپچردا بون و، ناوچەی پشدەریش هەرگیز نەهینراوەتە ژیر کۆنترۆلی بەریوەبەرایەتییەوە، بەلکو وەکو پەناگا

---

[٨٦] عبدالرزاق الحسنی: تاریخ الوزارات العراقیه، ط٥٩، ص٣٤٠

لەلایـەن بـاندی عـیراقی و ئـیرانی و تورکیـەوە بـەکار هیـنراوە، ئەمـەیش بۆتــە هــۆی احراجیکی ئاشکرا بۆ حکومەتی عیراق. هیچ گومـانی تیـدا نیـە کـاتی ئـەوە هـاتوە کـە هەردو ناوچە بهینرینە ژێر بەڕێوەبەرایەتییـەکی کاریگـەرەوە. ئیمـەیش مـایلین بـە لای موافەقەتدا لەگەڵ تۆ کە مەترسی ئەوە هەیە کە هەر کـاریکی لـەو بابەتـەی حکومـەتی عیراق، لەم کاتەدا، لەوانەیە لـە جنیـڤ بـە خـراپ پیشـان بدرێ وەکو اجرائـاتی قمعـی دژی هەستی نەتەوەیی کورد. لەبەر ئەوە ئەبێ ئامادە بین کە مـەندوبی سـامی ئاگـادار کرا کـە ئیمـە پشـتیوانی لـە ئەنجامگیریـەکانی کۆنفرەنسـی بارەگـا ئەکـەین، بـۆ ئـەو پیشـنیارەی کـە لـە پیـش پەسـەند کردنـی هیـچ فراوانکردنیکـی اجرائـات دژی شـیخ مـەحمود بۆ ئەوەی کاری عسکری دژی عەشایەری بارزان و پشدەر بگریتـەوە، ئـەبێ ئـەم مەترسـیەی لـەبیر بـێ و، تـەنیا کاتـێ بچیتـە نـاو کـاریکی وەهـاوەو، هیزەکـانی ئیمپراتۆری هاوبەش بکا، ئەگەر لەو باوەرەدا بێ کە زۆر زەروریە.

بەشـکو وابکـەی کـە مـن بـزانم ئـاخۆ ئەمانـە لەگـەڵ پیویسـتیەکانی حالەتەکـە ئەگونجین؟(FO371/15311).

### {} لە وەزارەتی دەرەوە بۆ هال ( J. H. Hall )

٢٤ی مارتی ١٩٣١

کادۆگان لە پاریسە، لەبـەر ئـەوە نامـەی ژمـارە ٣١/٨٨٠٦٩ی ٢٠ی مـارت کـە بـۆ ئەوت نوسی بو، لەبابەت لەشکرکیشی چاوەروانکراوەوە دژی کوردەکان، مـن وەڵامـی ئەدەمەوە.

ئەو بە چاکی پـەی بـەوە ئـەبا کـە ((پاککردنـەوە))ی ناوچـەکانی بـارزان و پشـدەر زەروریـەو، موافیقـە رینماییـەکانی کـە تـۆ پیشـنیارت کـردوە بنـیردرێ بـۆ هـەمفریس (Humphrys) بـــە شـــیوەیەکی کـــافی لەگـــەڵ پیویســـتیەکانی حالەتەکـــەدا ئەگونجێ.(FO371/15311).

### {} تەلەگرام لە مەندوبی سامی عیراقەوە بۆ سکرتێری دەوڵەت بۆ کاروباری کۆلۆنیەکان

ڕۆژی ٩ی مایسی ١٩٣١. لە سەعات ١،٥٢ی دوای نیوەڕۆی ٩ی مایسدا گەیشتوە.

ژمارە ٢١٨ بە ناونیشانی سکرتێری دەوڵەت بۆ کاروباری کۆلۆنیەکان، دوبارە بۆ تاران ژمارە ٢٩. تەلەگرامی ژمارە ١٩٥ی من:

حکومەتی ئێران موافیقە لەسەر هاوئاهەنگی سپایی کە لەلایەن حکومەتی عیراقەوە پێشنیاری کرا بو. لە ٥ی مایسدا ئەفسەری عیراقی فەرماندەی ناوچەی ڕۆژهەڵات هاوڕێ لەگەڵ موفەتیشی بەریتانی هەیئەتی ئەرکانی جەیشی عیراقی، پێکەوە فەرماندەی ئێرانییان لە مەریوان بینی و گەیشتنە ڕێککەوتنێک بۆ هاوئاهەنگی داهاتوی هێزەکانی ئێران و عیراق. یەکەمین لەشکرکێشی هاوبەش ئەبێ لە ١٤ی مایسدا جێبەجێ بکرێ. لەهەمان کاتدا حکومەتی عیراق کە لە پەیوەندی دایە لەگەڵ شێخ مەحمود دوا فرسەتیان داوەتێ بۆ خۆبەدەستەوەدان پێش ئەو کاتە.(FO317/15311).

### {} ڕێکەوتن لەگەڵ حکومەتی عیراقیدا

لە پەیامنێرمانەوە

بەغداد، ٢٠ی مایس

ئەم وردەکاریانەی خوارەوە سەبارەت بە دەستگیرکردنی شێخ مەحمود، سەرکردەی یاخی کورد، لە چەند سەرچاوەیەکی نارەسمییەوە کۆکراوەتەوە:

هێزە سەربازییەکانی ئێران لە نزیک گوندی پیرانی سەر سنوری ئێران جێگیر بوو بوون کە شێخ مەحمود وەك پەناگە هەڵیبژارد بو، ڕۆژی ١٤ی مایس ئێرانییەکان ڕایانگەیاند بە نیازن شێخ مەحمود لە خاکی ئێران دەرپەڕینن. هێزەکانی عیراق پلان و نەخشەیان دانا بوو هاوزەمان هێرش بکەنە سەر دیوی سنووری عیراق ئەگەر شێخ هەوڵی پەڕینەوەیدا.

رۆژی ١٢ی مایس شیخ مەحمود، کە داوای کردبوو لە خاکی عیراقدا کۆنفرانسیك ساز بکریت، ریگەی پەرینەوەی پیدراو بە سواری لە پیرانەوە گەیشتە پینجوینو لەوێ لەلایەن موتەصەرریف،کاپتن هۆلتو سکرتیری مەندووبی سامی لە خۆرهەلات پیشوازی لیکرا. پیّی راگەیانرا کە دەبیت بەبێ هیچ مەرجیك خۆی بەدەستەوە بدات بەلام گرەنتی سەلامەتی خۆیی و خیزانەکەی دەدریتێ. شیخ وتی لەوانەیە پیشنیازەکە قبوولّ بکات بەلام داوای کرد ریگەی بدریت لەسنوری ئیرانەوە بگەریتەوە بۆ ئەوەی لەگەلّ لایەنگرانو خیزانەکەیدا هەمو شتیك ریکبخات.

رۆژی ١٣ی مایس هیچ شتیکی نوێ لەبارەی شیخەوە نەبیسترا، هیزەکانی عیراقو ئیران بەردەوام بوون لە خۆ ئامادەکردن بۆ هیرشیکی هاوبەش لە رۆژی داهاتوودا ئەنجامی بدەن. بەیانی رۆژی ١٤ی مایس هیزەکان لە هەردوو دیوی سنورەوە ئامادەبوون بۆ جولان کاتیك پەیامیکی بە پەلە گەیشتە ئەو ئەفسەرەی فەرماندەیی هیزەکانی عیراقی دەکرد، کەوا لە نیوە شەوی رابردوەوە شیخ بە سواری بەرەو پینجوین ریکەوتوەو لە مالیکی بچوکی قورینەدا نوستوە. پاش کۆنفرانسیك بێ هیچ مەرجیك تیکرای بە مەرجەکانی حکومەتی عیراقی قایل لوو، بەلام داوای کرد کە نابیت هیچ پاسەوانیکی سوپای عیراقی یاوەری بکات بۆ شاری سلیمانی. لەبەر تۆماری شیخ، هەر چۆنیك بوایە پاسەوان شتیکی زۆر پیویست بوو. لە بەرامبەر شوین خستنی سوارەی عیراقی، کە لە بەشیکی ریگادا بەرەو سلیمانی پاسەوانی کرد، شیخ مەحمود دەستی کرد بە گریانیکی قوولّو لە پاسەوانەکە پارایەوە بیکوژیت، ئاشکرایە ئەوەی رەچاوکردوە رۆیشتن بەناو چیاکانداو لەژیر پاسەوانی سوپای عیراقدا سووکایەتی کردنیکە بە کەرامەتی کە ناسریتەوە.

بە دریژایی ریگا بەرەو سلیمانی دیلەکە (شیخ مەحمود) لە هەمو شوینیك گەورەترین دلنەوایی و شیوەنی لەلایەن هەموانەوە بۆ کرا، دانیشتوانی سلیمانیش هاتنە دەرەوە بۆ سلاو لیکردنو ماچکردنی دەستەکانی. دەستبەجێ گویزرایەوە بۆ ناو فرۆکەکە، کاپتن گۆوانو موفەتیشی ئیداری سلیمانی یاوەرییان کردو فرکەکە بەرەو بەغدادی بردو لەوێ پاش وەستانیکی زۆر کورت، فرین بەرەو ئوری گالدمیل. هەمو گەشتە ٦٠٠ میلییەکە لە پینجوینەوە بە یەك رۆژ ئەنجامدرا.

لەوانەیـە خـۆ بـە دەسـتـەوەدانی شـیخ مـەحمود ئـەنجامی گرنـگ‌و سـەرەکی لێ بکەویتەوە سەبارەت بە هیمن کردنەوەی کوردستانی باشور. خۆبەدەستەوەدانی شیخ کۆتایی هاتنی، لەوانەیە بۆ ماوەی چەند سالیك، بەرەنگاری ریکخراو دژ بە حکومەتی عیراق دەگەیەنیت. گومانی تیدا نییە، بە هەمو شیوەیەك بەدریژایی تەمەنی ئەم نەوەو ئیدارەی ئیستا، هەرگیز حکومەتی عیراق لەناو کوردستاندا پشتگیری خەلك بەدەست ناهینیت، بەلام ئەندامە وریاکانی ناو دانیشتوانی کورد درك بەوە دەکەن کە ناعەدالەتی بۆ عامەی خەلك لەژیر دەسەلاتی بەغدا کەمتر دەبیت لەوەی دەکرا چاوەروان بکریت ئەگەر یاخی بوونکەی شیخ مەحمود سەربکەوتایە.

رۆژنامەی تایمز، ٢١ی مایسی ١٩٣١

## -کوردو مەلیك فەیصەل

### ٤-١ فەیصەل و کیشەی کورد

فەیصەل (١٨٨٣ – ١٩٣٣) پیاویکی ژیرو دنیادیدەی خاوەن تەجروبە بوە. لە سەردەمی عوسمانی‌دا چەند سالێ لە ئەستەمولّ بو. زولم و زۆری نەتەوەپەرستە ئیتیحادیەکانی تورکی دی بو. لەکاتی یەکەمین جەنگی جیهانی‌دا، ئەم یەکێ بو لەوانەی شەریف حسەینی باوکی هان‌دا، بۆ راگەیاندنی شۆرش و هاوکاری لەگەلّ ئینگلیز دژی دەولەتی عوسمانی، بە هیوای بەدەسهینانی سەربەخۆیی ولاتانی مەشریقی عەرەبی. شۆرشەکەیان جەزرەبەیەکی کوشندەی لە بناغەی دەولەتی عوسمانی‌دا.

دوای تەواو بونی یەکەمین جەنگی جیهانی حکومەتیکی عەرەبی لە سوریا دامەزراندو خۆی بە مەلیکی، بەلاّم هیزی فەرەنسی چوە سەری و حکومەتەکەیان تیك‌داو خۆیان بە شکاوی راونا. بریتانیا بۆ ئەوەی پاداشتی ئەم بنەمالەیە بداتەوە، سەبارەت بە هاوکارییان لە سەردەمی جەنگدا، لە حیجازەوە فەیصەلیان هینا، بێ ئەوەی خۆی خەلکی عیراق بێ، یا ئاشنا بێ بە دانیشتوانی عیراق، عەرشی عیراقیان پێ بەخشی و کردیان بە مەلیك.

رەنگە فەیصەل، لەچاو زۆری سیاسیەکانی ئەوسای عەرەبدا، لە هەمویان زیاتر گیانی لیبوردنی نەتەوەیی، دینیی و مەزهەبی تێدا بوبێ و، هەولیکی زۆری داوە کە میللەتیکی یەکگرتو لە دانیشتوانی عیراق پیك بهینێ، بەلاّم عیراق کە ولاّتیکی

تیکەڵاو بو لە ئیل، نەتەوە، دینو مەزەبی جیاواز، بەم یەك نەخراو، لە دوا سالی تەمەنیدا، بە نائومیدیەکی قولەوە بەم جۆرە وەسفی میللەتی عیراق ئەکا:

عەرەبیەکەی: ((في اعتقادي لا يوجد شعب عراقي بعد، بل توجد كتلات بشرية خالية من فكرة الوطنية، مشبعة بتقاليد واباطيل مذهبية لا تجمع بينهم جامعة، سماعون للسوء، ميالون للفوضى، مستعدون دائما للانقضاض على اية حكومة كانت)).

کوردیەکەی: ((بە باوەری من هیشتا شتیك نیە پێی بوترێ گەلی عیراق، بەلکو چەند تۆپەلیکی مرۆیی هەیە کە بیری نیشتمانپەروەرییان تێدا نیە، پرە لە نەریتو پروپوچی مەزەبی، شتیك نیە کۆیان بکاتەوە. بۆ خراپە گوێ قوڵاخن، حەزیان لە ئاژاوەیە، هەمیشە لەسەر پین بۆ پەلاماردانی حکومەت، ئیتر هەر حکومەتێ بێ)).

فەیصەل، تەجروبەی ئیتیحادیەکانی لەبەر چاو بو، کە چۆن بو بە هۆی رەنجاندنی گەلانی نەتورکی ناو دەولەتی عوسمانی، لەم بارەیەوە لەو میواندارییەدا کە بۆ مەندوبی سامی کرد لە وتارەکەیدا وتی: ((ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هەلوەشا چونکە سیاسەتیکی نەتەوەیی توندرەوی گرت بو، لەبەر ئەوە عیراق بەرامبەر بە کورد سیاسەتیکی وەکو ئەو ناگرێ)) هەروەها وتی: ((باوەرم وایە کە یەکێ لە گەورەترین فرمانەکانی عەرەبیکی عیراقی ئەوەیە، هانی برای کوردی عیراقی بدا سور بێ لەسەر نەتەوەکەی خۆیو، بیتە ژیر ئالای عیراقەوە)).[87]

لیکۆلەرەوەیەکی عیراقی نوسیویتی: ((هەلویستی مەلیك فەیصەل لە کیشەی کورد لەوەدا کورت ئەکریتەوە پێ داگرتن لەسەر مانەوەی ناوچەی کورد بە بەشیکی لە جیابونەوە نەهاتوی عیراق لە چوارچیوەی (الحكم الذاتي)داو قەناعەتی تەواوی هەبو کە کورد ئەبێ هەمو مافە نیشتمانیو نەتەوەییەکانی خۆی هەبێ)).[88] وە لە سەرچاوەیەکی ئینگلیزییشەوە ئەگیریتەوە کە مەلیك فەیصەل لە ئابی ١٩٢٣دا بە شیخ مەحمودی وتوە لەگەڵ ئەوەیە کورد لە چوارچیوەی دەولەتی عیراقدا حوکمی زاتییان بدریتێ. لەو کاتەدا، کە ئەم باسی ئەکا، شیخ مەحمود لە شۆرشدا بوەو، هیچ سەرچاوەیەکی تری بەردەست پشتیوانی ئەم ئاگاداریە ناکا. یان ئەگەر ئەو کاتەیش فەیصەل بیرورایەکی وەهای هەبوبێ دوایی گۆریویتی. فەیصەل لە ماڧ

---

[87] علاء جاسم محمد، الملك فيصل الاول حياته ودوره السياسي في الثورة العربية وسورية والعراق ١٨٨٣ – ١٩٣٣، بغداد ١٩٩٠، ل٢٤٠

[88] علاء جاسم، ل٢٣٩

یەکسانی هاوولاتیتی و، بەکارهینانی زمانی کوردی زیاتر تێ نەپەریوە بۆ سەلماندنی مافی سیاسی و بەریوەبەرایەتی، چ جای ئۆتۆنۆمی. ئەمەیش لەو گفتوگۆیەدا باشتر رون ئەبیتەوە کە لەگەڵ مەندوبی سامیدا کردویەتی و، بە راشکاوی مەترسیی خۆی لەوە پیشان ئەدا کە مەسەلەی کورد لە عیراقدا، ببیتە هۆی تیکدانی نیوانی عیراق لەگەڵ دراوسیکانی: تورکیا و ئیران و، سەرەنجام عیراق لە شەرەوە بگلینێ و، لە پەراویزی ناسینی رەسمیی زمانی کوردیدا لای وابوە کە دانی هەر ئیمتیازیك بە کورد، ئەبێ بەهۆی ئەوەی داوای ئیمتیازی زۆرتر بکەن، تا ئەگا بە داوای سەربەخۆیی.

## ٤-٢ قانون اللغات المحليه

یەکێ لەو کارانەی کە نوری سەعید بە رەزامەندی مەلیك فەیصەل، لەسەر داوای کاربەدەستانی ئینگلیز، ئەنجامیدا، دانانی قانونێ بو بۆ ناسینی زمانی کوردی بە رەسمی، کە بە ناوی (قانون اللغات المحليه)وە لە ٢٣ی مایسی ١٩٣١دا دەری کرد. پیش ئەویش سەروەزیرانی پیشو عەبدولموحسین سەعدون لەبەردەم مەجلیسی نوابدا ئەم مافانەی بۆ کورد سەلماند بو و، رینمونی جیبەجیکردنی نارد بو بۆ وەزارەتەکانی.

مەبەست لە دەرکردنی قانونەکە دەمکوتکردنی داواکارانی مافی نەتەوەی کوردو، خۆشکردنی زەمینەی لەشکرکیشی بو بۆ دامرکاندنەوەی شۆرشەکەی شیخ مەحمودو هەر جولانەوەیەکی چەکداری تری کورد. حکومەتی بریتانی ئەیویست مافی سیاسی کورد بۆ دامەزراندنی حکومەتی تایبەتی خۆی، بگۆرێ بۆ کاروباری دامەزراندنی فەرمانبەرانی کوردو بەکارهینانی زمانی کوردی لە قوتابخانە، دادگا و دائیرەکانی هەندێ ناوچەی کوردستاندا، بەتایبەتی لەو شوینانەدا کە جولانەوەی نەتەوەیی کوردی تێدا بەهیز بون. بیگومان ئەم کارانە بەشێ بون لە مافەکانی کورد، بەلام نەیئەتوانی نیشتماپەروەرانی کورد تیر بکا و نەئەتوانی کیشەی نەتەوەیی کورد چارەسەر بکا.

لەگەڵ هەمو ئەوانەیشدا (قانون اللغات المحليه) کە لەسەر پیشنیاری ئینگلیزو بەپرس و رای ئەو دەرچو، چەندین کەموکوری تێدا بو:

١- قانونەکە لەباتی ئەوەی دان بە زمانی کوردیدا بنێ وەکو زمانیکی نەتەوەیی (لغه قوميه)، بە زمانیکی ناوچەیی (لغه محليه) لە قەلەمیداوە. هەر بۆ ئەم مەبەستەیش

ئازادی داوە بە کوردەکانی بادینـان، لـەباتی زمـانی بـاوی نوسـینی کـوردی عـیراق، لەهجەی تایبەتی خۆیان بەکار بهینن.

٢- ناوچەی بەکارهینانی تەسك کردۆتەوە.

لە گەرمیان، هیچ کام لەو ناوچانەی نەگرتۆتەوە کە ئەو زەمانە چالاکەکانی کورد داوایـان کـردوە بـە نـاوی لیـوای باجەلانـەوە دروسـت بکـریّ لـە قـەزاو ناحیـە کوردنشینەکانی لیواکانی دیالەو کوت: خانەقین، کفری، مەندەلی، بەدرە...

لە بادینان، قەزای سنجارو...

٣- هیچ کۆریکی زمانەوانی بۆ گەشەپیدانی زمانی کوردی دروست نەکرد، وەکو بۆ زمانی عەرەبی دامەزراند.

تۆفیق وەهبی کە زمانەوانیکی شارەزا بو، لە یادداشتەکەیدا بۆ کۆمەلەی گەلان ئەلی ئەم قانونە ئاژاوەی زمان دروست ئەکا

دواتر، ئەم قانونـە بـە کردەوە تـەنیا لـە لیـوای سلیمانیو چەند جییـەکی کـەمی هـەولیردا جیبـەجیّ کرا، ناوچە کوردنشینەکانی لیواکانی کـەرکوك، موسـلّ، دیالـەو کوت، بیّ بەش کران، بەلکو لەوساوە ئیتر حکومەتی عیراق کەوتـە دانـانی ریوشـوینی دەرکردنی کوردو نیشتەجیّ کردنی عەرەب لە هەندیّ شوینی گرنگی کوردستاندا.

رەوتی سەلماندنی زمانی کوردی، لەلایەن حکومـەتی عیراقیـەوە، وەکـو زمـانیکی رەسمـیو، هەولـەکانی کـورد خـۆیو هەلویسـتی جیـاوازی کاربەدەسـتو سیاسـیو رۆژنامەوانـەکانی عـەرەبو گفتوگۆکـانی نـاو هـەردو مەجلیسـی نـوابو ئـەعیانو، لیدوانـی رۆژنامـەکانی بـەغدادو، بیروبۆچونی کاربەدەسـتانی بریتـانیو، هەلویسـتیان لـەم کیشـەیەدا، خـۆی باسـیکی تایبەتیـە ئـەهینیّ لیکۆلینەوەیـەکی سـەربەخۆی بـۆ تەرخان بکریّ.

## ٤-٣ جەیشی عیراق

لە کۆنفرەنسی قاهیرەدا بریتانیا بـۆ ئـەوەی ئـەرکی سـوكو مەسـرەف کـەم بیتـەوە بریـاریدا لـە عیراق جەیشـیك پیك بهینریّ. ئـەم هەوالـە نەتەوەپەرسـتەکانی عـەرەبی خۆشحالّ کرد. دوای دامـەزراندنی حکومـەتی عیراقو تـەتویجی فەیصـەل بـە مـەلیکی عیراق، یـەکیّ لـە هەولـەکانی نەتەوەپەرستەکانی عـەرەبو فەیصـەل بـۆ دامـەزراندنی جەیشیکی بەهیز، لـە ریگـەی تـەجنیدی ئیجباریـەوە، تـەرخان کـرا. قـانونی تـەجنیدی

ئیجباری مشتومریکی زۆری دروست کردو، عەشایەری جنوب بە توندی دژی بون، زۆری نائیبەکانی کوردیش دژی راوەستان، بە روالەت لەبەر خاتری عەشایەری کوردو، لە راستیدا لەبەر خاتری ئینگلیز، چونکە لەو کاتەدا ئینگلیز تەجنیدی ئیجباری پێ باش نەبو. بەڵام سەرەنجام کرا بە قانون و سەپینرا.

هەر لە سەرەتاوە بریتانیا ئەرکی پاراستنی عیراقی بەرامبەر هەلگەرانەوەی ناوخۆو، دەسدریژی دەرەکی گرتبوە ئەستۆ، راستیەکەیشی عیراق هیچ مەترسیەکی راستەقینەی هیرشی دەرەکی: تورکیا لەلای سەرویەوەو، وڵاتانی خەلیج لەلای خوارویەوەو، ئیران لەلای رۆژهەلاتو، سوریا لەلای رۆژئاوایەوە لەسەر نەبو.

لیکۆلەرەوەیەکی عیراقی نوسیویتی: ((مەلیك پێی باش نەبو پەنا بۆ هیزی بریتانی بەرێ تەنانەت ئەگەر عیراق بە تەنگوچەلەمەیەکی ناوخۆیشدا برۆیشتایە، لای وابو ئەگەر عیراق نەتوانێ ئاسایشی ناوخۆی بپاریزێ، شایستەی سەربەخۆیی نیە)) نوسەر لەسەر ئەرواو ئەلی: ((فەیصەل سەیری لی هات بریتانیا بە تەمابێ، حکومەتی عیراق داوای یارمەتی جەنگیی لی بکات بۆ سەرکوتکردنی عیراقییەکان)).[89]
ئەم بۆچونە، بیگومان، راست نیە چونکە:

١- فەیصەل نەك هەر پەنای بۆ بریتانیا بردوە یارمەتی جەنگیی بدا بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوخۆی عیراقو، سەرکوتکردنی هەمو پشیوییەك، بەلکو بۆ دامرکاندنەوەی شۆرشەکەی ١٩٣١ی شیخ مەحمود پەنای بردۆتە بەر ئیرانو، بۆ دامرکاندنەوەی شۆرشەکەی ١٩٣٢ی شیخ ئەحمەدی بارزانی پەنای بردۆتە بەر تورکیایش.

٢- مەلیك فەیصەل لەو یادداشتەدا کە پیش مردنی بۆ هەندێ لە سیاسیەکانی عیراقی نوسیوە، بە داخەوە باسی لاوازی جەیش ئەکاو، ئەلی ئەبێ جەیشیکمان هەبێ ئەگەر لەیەك کاتدا لە دو شوینی دور لە یەکتری عیراقدا ئاژاوە هەلگیرسا بتوانێ هەردوکیان بەیەکەوە بکوژینیتەوە.

ئەرکی سەرەکی ئەم جەیشە هەر لە سەرەتاوە، وەکو مەلیك فەیصەل ویستی، پاراستنی دەولەتی عیراق بو لە مەترسی ناوەکی، کە یەکێ لە هەرە گرنگەکانیان مەترسی کورد بو. لە دوای داگیرکردنی سلیمانی جەیشی عیراق خۆشترین دەشتی

---

[89] علا جاسم محمد: ل٣٠٤

سلیمانی، کانی ئاسکانی، کرد بە سەربازگەیەکی هەمیشەیی. هیزیکی گەورەی تێدا کۆ کردەوەو، فەرماندەیی ناوچەی رۆژهەلات (امریە المنطقە الشرقیە)ی لی دانا. بەلام ئەو جەیشەی کە فەیصەل بە یارمەتی ئینگلیز بۆ پاریزگاری رژیمی پاشایەتی و سەرکوتکردنی هەلگەرانەوەی ناوخۆ، بە تایبەتی هی کورد، دروستی کرد، ئەگەرچی لە دامرکاندنەوەی درندانەی شۆرشەکانی کوردا، لەو رۆژەوە (فەوجی ئیمام موسای کاظم)یان دامەزراند تا سەر، هیچ دریخیەکی نەکرد، بەلام هەمان جەیش لە ١٩٥٨دا تۆوی مەلیك و نەوەو وەچەکانی بریەوە. ئەو درندەیەی ئەو بەخیوی کرد پیش هەرکەس سەری منالەکانی خۆی خوارد!.

## ٤-٤ فەیصەل مەلیکی سلیمانی

سلیمانی گرییەکی خر بو لەسەر دلی فەیصەلدا. لەو پرسە گورگانەیەدا کە ئینگلیز لە سلیمانی کردیان بۆ ئەوەی بخریتە سەر عیراق بە (لام باش نیە) وەلامیان دایەوە. لە ٢٠ی جولای ١٩٢١دا کە حاکمی بریتانی ئەشرافی سلیمانی بانگ کرد لییان بپرسێ: ((...ئاپاکو لیوای سلیمانی بۆ مەلەکیەتی ئەمیر فەیصەل رەئی ئەدەن یان نا؟ لەلایەنی کۆمەلەکەوە جواب درایەوە: چونکە لیوای سلیمانی جیاوازە لە حکومەتی عیراق پیویست نیە رەئی بدەن بۆ دانانی مەلیك. لەبەر دوری لە ئیمەوە کردەوەو چۆنیتی (حەضرەتی ئەمیر فەیصەل)یش نەناسراوە، جا لەبەر ئەوە بۆمان نیە لەو روەوە بدویین!)).[٩٠]

سالی ١٩٢٤ فەیصەل کە هاتە کەرکوك بۆ یەکەم جار ئالای عیراقی لی هەلکرد، بەلام لەبەر بونی شیخ مەحمود لەناوچەکەدا نەیتوانی سەردانی سلیمانی بکا. ئەمجارە ئیتر ریگەی بۆ تەخت بو بو، بە (خەیالی رەحەت) هاتە سلیمانی و پیشوازی شاهانەی لی کراو، بەم بۆنەیەوە شیعرو سرود خویندرایەوە. ئەویش یەکێ لە بەناوبانگترین وتارەکانی لەم بۆنەیەدا دا، وتی: ((دین بۆ خوایەو نیشتمان بۆ هەموانە)) ئەم سەفەرەی فەیصەل بۆ ئەوەبو کە نیشانی بدا ئیتر سلیمانیش وەکو هەمو لیواکانی تر بەشیکی لە جیابونەوە نەهاتوی مەملەکەتی عیراقە. لە وتارەکەیدا بەم بۆنەیەوە وتی: ((هیچ شوبهەی نیە کە هەر یەك لە ئیوە ئەیزانیت کە حکومەتی عیراق قبولی تەجزیئەو تەفریق ناکات، وە بە ئیعتیباری عوموم حکومەتی عیراق بۆتە

[٩٠] پیشکەوتن، ژ٦٦، ٢٨ی جولای ١٩٢١

جوزئیکی لایەتەجەزەئیو لەبەر ئەمە مەحالە کە سەکەنەی ئەلویەی جنوبیە بتوانن، بێ ئەوەی ئەم لیوایە جوزئیك لە وەطەنەکەیانو بەدەستیانەوە بیت لە ئەمنیەتا بژینو کەذا موستەحیلە بۆ ئەهالی ئەم لیوایە کە یەك رۆژ بتوانن، بە هەر شکڵو وەضعیەتیك بیت، بە جیا لە وەطەنی عیراقیو لە برا عیراقیەکانیان بژین. ئەمە حەقیقەتیکی ئەوەندە ئاشکرایە کە هەمو عیراقیەك ئەیزانیتو ئەقوامی سائیرەش ئیشتیراکیان ئەکات. لەسەر ئەم ئەساسە حکومەتی عیراقیە تەئەسوسی کردوەو لە ئیستیقبالیکی نزیکا لەناو ئومەمی سائیرەدا بە ئیستیقلالو وەحدەتەوە ئەخذی مەوقیع ئەکات)).

هەر لەم سەفەرەیدا سەردانی هەلەبجەیشی کرد، ئینجا گەرایەوە بۆ پایتەخت.

## ٤-٥ نە ئەو بەهارەو نە ئەو هەوارە

دوای خۆبەدەستەوەدانی شیخ مەحمود، موزاحیم پاچەچی، وەزیری ناوخۆی عیراق، لە مایسی ١٩٣١دا، چۆ بۆ سەردانی سلیمانی. لە وتارەکەیدا بۆ خەلکی سلیمانی وتی:

((لە بەعضیکم بیست - و طەرەفداری باوەر پێ کردن نیم - کە بەعضێ لە برا کوردەکانمان مەظبەطەیان بۆ بەعضێ جیگا تەقدیم کردوە لەو مەضبەطانەدا بەیانیان کردوە کە حکومەتی عیراقیە لە خصوص کوردەکانەوە موخالەفەتی تەوصیاتی عیصبەتول ئومەمی کردوەو لەبەر ئەوە طەلەبی تەئلیفی حکومەتیکی کوردیەیان کردوە لە ژیر حیمایەو ئینتیدابی بەریطانیادا)).

((رجا ئەکەم ئەوەی کە بیستومە راست نەبێ چونکە بە راست دەرچونی زۆر موتەئەثیرم ئەکات بە صیفەتی ئەوەی کە دۆستو برایەکی ئوممەتی کوردم بەوەی کە شوهرەتو شەرەفی لەکەدار بکات)).

((تەوصیاتی عیصبەتول ئومەم مەعلومو زانراوە ئەگەر موقارەنەی بکەن لەگەڵ ئەوەی کە لەم وڵاتەدا جاریەو تەطبیق کراوە بۆتان مەعلوم ئەبێ کە حکومەتی عیراقیە هەرچی لەسەری بە فەرض گیراوە هەموی ئیجرا کردوەو لە حوسنی نیەتو ئیخلاصیدا لیی زیاد کردوە)).

پاش پاچەچی مەلیك فەیصەل چوە سلیمانی. بەراوردی ئەم سەردانەی پاچەچیو مەلیك لەگەڵ سەردانی ئەمیر غازی لە تەموزی ١٩٣٠داو، دوای ئەو

سەردانی وەفدی وەزاری لە ئابی ١٩٣٠دا، دەری ئەخەن کە چ گۆرانیکی بنەرەتی بەسەر کەشی سیاسی ئەم ناوچەیەدا هاتوەو، جولاّنەوەی کورد لە چ قۆناغیکی تیشکانو نائومیدیدا بو.

سەرانی کورد لە سلیمانی، بۆ پیشوازی لە غازیو دوای ئەو لە وەکیلی سەرۆکی وەزیرانی عیراقو وەکیلی مەندوبی سامی، پیشتر بەیانی سیاسییان دەرکرد بو، خواستە نەتەوەییەکانی کوردیان تیّدا رون کردبوەوە، بە خۆپیشاندانی سیاسی پیشوازییان کردنو، لە گفتوگۆکاندا داوای سەلماندنی ماق کوردیان ئەکرد بۆ دروستکردنی حکومەتیکی کوردی لەژیر چاودیری کۆمەلەی گەلاندا.

بەلاّم ئەمجارەیان منالاّنی مەکتەبەکانو، موچەخۆرەکانی حکومەت بۆ پیشوازی رۆتینیو گۆرانی وتن بە بالاّی مەلیکدا برا بونو، خواستەکانیش بریتی بون لە: تکای لیبوردنی گیراوەکانو، کردنەوەی هەندیّ ریگا لە نیوان سلیمانیو قەزاکانیدا...

ئەم قۆناغەی ژیانی سیاسی کورد لە عیراقدا قۆناغیکی سەختە.

کاری پارلەمانتارانی کورد لە مەجلیسی نوابی عیراقیدا بە هەرەشە بیدەنگ کرا بو، خەباتی سیاسی ناوشاری خەلك لە ٦ ئەیلولدا لە خوینو زینداندا نقوم کرا، خەباتی چەکداری شیخ مەحمودو هاوکارەکانی بە تیشکانو خۆ بەدەستەوەدان تەواو بو، عەریزەی گەورەکانی کورد بۆ کۆمەلەی گەلان بە رەت کردنەوە وەلاّمی درا بوەوە... ئەمانە نائومیدییەکی قولیان لە دەرونی چالاکەکانی کوردا رواند بو. زۆری ئەوانەی بەشداری جولاّنەوەی سیاسی کورد بون تەکینەوە. هەندیکیان لە دەزگای بەریوەبەرایەتی عیراقدا بە فەرمانبەر دامەزرانو، هەندیکیان خەریکی بازرگانیو کارو کاسبی بون، بە کورتی لە ژیانی گشتی کشانەوەو، خەریکی دابینکردنی ژیانی تایبەتی خۆیان بون.

## بەڵگەکانی:

### ٤- کوردو مەلیک فەیصەل

### {} تیبینی لەسەر چاوپیکەوتنی مەندوبی سامی لە عیراق لەگەڵ مەلیک فەیصەل لە ٢٠ی مەی ١٩٣٠دا.

کوردەکانی عیراق

مەندوبی سامی بە بیر خاوەن شکۆی هینایەوە ماوەیەك لەمەوبەر موافەقەتی کرد دواتر پرسی کوردەکانی عیراق باس بکەن. لەو کاتەوە، هەلی بۆ رەخسا لیکۆلینەوە لە پرسەکە بکاو، وەکو پیشنیاری کرد بو بە زویی بچێ بۆ گەشتێ لە ناوچە کوردیەکاندا. لای وایە باش ئەبێ، ئەگەر خاوەن شکۆ موافیق بێ، مەسەلەکە باس بکەن. دریژەی بە قسەکانیدا حکومەت کاریکی باشی کردوە بەیانی دەرکردوە نیازی هەیە قانونیك دەربکا کوردی بکا بە زمانی رەسمی لە ناوچە کوردیەکاندا، بەلام لای وایە درکاندنەکانی تری سەرۆکی وەزیران دەربارەی دامەزراندنی فەرمانبەران لە ناوچە کوردیەکاندا... کە مەرج بێ بە رەگەز کورد بن بەلکو تەنیا کوردی بزانن، بۆ نمونە پیویست ناکا، ئەبوایە دوابخرێ بۆ دوای جیبەجیکردنی قانونی پەیماندراو.

مەلیك وتی بە تەواوی موافیقە کە حکومەتی عیراق ریگە بدا بە بەکارهینانی زمانی کوردی وەکو زمانیکی رەسمی بەلام ترساوە لە چالاکیەکانی ژمارەیەك لە

کۆمەلە سیاسی کوردیەکان، کە بونیان لە عیراقدا ئەترسێ زەرەر بدا لە پیوەندیەکانی عیراق لەگەڵ ئیران و تورکیا. گەورەترین جیاوازی لە بۆچونەکانی حکومەتی عیراق و بارەگادا ئەوە بو حکومەتی عیراق قەناعەتی وایە ئەو (مسکن)انەی ئیستا پیشنیار کراون بۆ ماوەیەکی دریژ کورد رازی ناکا، دوای هەمو (تنازل)یك داواکانی ئەوان زیاد ئەکا، تا لە دوایی‌دا دەس ئەکەن بە تیکۆشان بۆ یەکگرتنەوەو سەربەخۆیی، کە لەوانەیە عیراق لە شەرەوە بگلینێ لەگەڵ ئیران و تورکیا. لەلایەکی ترەوە بارەگا لای وایە کە ئەشێ کورد وەکو سکۆت لە بریتانیای گەورەدا رەفتاری لەگەڵ بکرێ، بەلام جیاوازی لە پایەی ئەم دو گەلەدا ئەوەندە گەورەیە کە بەراودر کردنیکی نەشیاو بێ بۆ ئەوەی ببیتە رێ پیشاندەری سیاسی.

مەندوبی سامی رونی کردەوە کە بە تەواوی لە سنورداریی هەر بەراوردیك ئەگا لە نیوان هەلویستی سکۆت لە مەملەکەتی یەکگرتو و کورد لە عیراقدا. بەلام مۆرالی پیوەندی بریتانی لەگەڵ سکۆت ئەو رەفتارە هەلسەنگیراوە بوە تیکەلاو لەگەڵ سەلماندنی ماف پاراستنی کەسایەتی نەتەوەیی و نەریتەکانی خۆیان هەمویانی یەك خستوە بە نزیکی لەگەڵ ئینگلیز، ئەو لای وایە کە سیاسەتیکی وەها بەرامبەر بە کورد هەمان ئەنجامی ئەبێ بۆ عیراق.

ئەگەرچی خالی سەرەکی ئەو ئەوە بو کە شتیکی بنچینەییە حکومەتی عیراق ئەو بەلینانە بە جێ بهینێ کە بە کوردی داون. ئەو سیاسەتەی کە راگەیەنراو بو سیاسەتیکی دروست بو بەلام ماوەتەوە سەر ئەوەی ببینرێ کە جیبەجێ ئەکرێ.

خاوەن شکۆ وتی بە تەواوی موافیقە لەگەڵ مەندوبی سامی بەلام هیشتا وا هەست ئەکا کە چالاکیەکانی کۆمەلە سیاسیە کوردیەکان سەرکوت بکرین چونکە زەرەر لە عیراق و زەرەر لە کورد خۆیشیان ئەدەن.

مەندوبی سامی بیری خاوەن شکۆی خستەوە کە کاریکی خیرا بکرێ لەلایەن بارەگا و حکومەتی عیراقەوە بۆ ئەوەی رێ بگرن لەوەی عیراق کە بەکار بهینرێ وەکو پەنجەی پیلانی پان – کوردی دژی دۆستە دراوسیکانی، بەلام رونی کردەوە لە کاتیك‌دا کە موافیقە لەسەر ئەوەی هاندانی دوژمنانە دژی دراوسیکانی سەرکوت بکرین، لای وایە پیویستە جیاوازی بکرێ لە نیوان ئەو کۆمەلە سیاسیانەدا ئەوجۆرە چالاکییانە ئەکەن لەگەڵ ئەوانەی کە ئامانجەکەیان داکۆکی رەوایە لە بەرژەوەندی

کورد لەناو عیراقدا. لەهەمان کاتدا خالی گرنگی راستەقینە بە کردەوە ئەوەیە کورد نائومید نەبن لەو بەلینانەی عیراق پێی داون. ئەو بەلینانە ئەبێ، ئەوەندەی بکرێ بە زویی، بەجێ بهینرین: لە روی سەرەتاییەوە قانونی زمان و دروستکردنی ناوچەی پەروەردەیی کوردی.

مەلیك موافیق بو و وتی هیواداره کە مەندوبی سامی ئاگاداری بکا ئەگەر لای وا بو حکومەتی عیراق دوا کەوتوە لە بەجیهینانی پەیمانەکانیدا بەرامبەر بە کورد.(FO371/14521).

## {} بەیانی رەسمی:

زمانی کوردی زمانیکی رەسمییە: وەزارەت پاش ئەوەی کاروباری گرتە دەست دی بایەخ بدا بەو شتانەی گرنگ و دلنیاکەری ئارەزوو ئاواتەکانی گەلن، لەوانە هەندێ مەسەلە کە پیوەندییان بە بەشێ لە دانیشتوانی لیواکانی سەرەوە هەیە لەبەر ئەوە بریاریدا کە لائیحەیەکی قانونی حازر بکات و بیخاتە بەردەم کۆبونەوەی هاتوی مەجلیسی ئوممە زمانی کوردی بکا بە زمانیکی رەسمیی لە شوینە کوردییەکاندا بەپێی ماددەی ١٧ی قانونی ئەساسی. حکومەت گەرەکیتی پیرەوی بەرنامەیەك بکا لەگەڵ گیانی ئەو بەلینانەدا بگونجێ، کە پیشتر دابوی بە کوردەکان لە عیراقدا.[٩١]

## {} هەنگاویکی ئومیدبەخش و مژدەیەکی خۆش بۆ کوردەکان

لەناکاودا غەزەتەکانی بەغداد مژدەیەکی بەهەمو مەناطیقی کوردەواریدا بلاو کردەوەو هەمو میللەتی کورد لە خۆشی ئەم خەبەرەو ئەم مژدەیە وەکو گوڵ گەشانەوەو عومومی کەوتنە شایی و کەیفخۆشیەوە.

ئەم مژدەیە ئەمەندە موهیم و خۆش بو کە ئەوەلەمین ئارەزویەك کە کوردەکان مودەتیکی زۆر ئینتیظاری ئەکەن هینایە جێ.

وا ئاشکرا حکومەت رەسمەن ئیعتیراف کرد بە رەسمیەتی زمانی کوردی و بۆ ئەو قیسمە کوردەواریەی کە لەگەڵ عیراقا ئەژین. وە ئەم ئیعتیرافەوو ئەم قەرارە صفەتیکی مەشروعیەتی پێ ئەدرێ، ئەکرێ بە قانون و لە ئەوەلەمین ئیجتیماعی مەجلیسی ئوممەتدا تەصدیق ئەکرێ و بەم سەبەبەوە کوردەواری نائیلی حەقیکی مەشروعی خۆی ئەبێ.

---

[٩١] البلاد، ع١٢٨، ١٩٣٠/٤/١٠

عومومی کوردەواری بەرامبەر بەم قەرارەو بەم خەبەرە بە جانو دڵ تەشەکوری حکومەت وە بیلخاصە قابینەی عالیو عادلەی نوری پاشا ئەلسەعید ئەکات. حەقیقەتەن لە هەمو کوردیکەوە مەعلوم بو کە ئەم قابینەیە فکریکی عالی هەیەو ئەیەوێ بۆ بەرزو بلندی عیراق ئەو ئەسبابانە مەحو بکاتەوە کە هەتاکو ئیستا ئەم دو میللەتەی لەیەك دلگیر کرد بو، وە لی مەعلوم بو کە ئیتیحادو یەك فکریو یەك وجودی ئەم دو میللەتە بەوەوە ئەبێ کە محافەظەی حقوقی میللیو عەنعەناتی کوردەکان بکرێ. وا شوکر ئەم قابینە تازەیەمان بۆ ئەم غایەیە ئەوەلەمین خەطوەی هاویشتو بەرامبەر بە حکومەتی عیراق مەحببەتیکی تەواوی خستە دلی کوردەکانەوە.

هەرچەند لەپیشەوە پیویست بو موافیقی قەراری عیصبەتول ئومەمو ئیعترافاتی عیراق ئەم حقوقە بە کوردەکان بدرێ، بەڵام هەتاکو ئیستا فیعلەن لە بەعضێ مەناطیقی کوردیەدا موهمەل مابوەوەو عەمەلی پێ نەئەکراو ئارەزوی کوردەکان نەهینرا بوە جێو، عەلاوەتەن ئەم مەسئەلەیە کەسبی قانونیەتی نەکرد بو و، بەم سەبەبەوە ئیتیحادیکی تەواو لە بەینی ئەم دو میللەتەدا پەیدا نەبو بو.

ئیستا کە قابینەی عالیو عادلەی نوری پاشا ئەلسەعید لە پیش هەمو شتیکا دەرکی بەمە کردو، ئەسبابی ئەم عەدەمی مەحببەتەی بەینەی دۆزیەوە. حەقیقەتەن وەکو بۆ عیراق بە خەطوەیەکی گەورە عەد ئەکریت، ئیلەل ئەبەد کوردەکانیشی مەمنون کردو بەم سەبەبەوە ئیتیحادیکی تەواوی خستە بەینی ئەم دو میللەتەوە.

کوردەواری هەمو وەقتیك بەدڵو بەگیان ویستویانە کە لەگەڵ عەرەبا ئیتیحادو تەوحیدی مەساعی بکەنو بەم سایەیەوە حکومەتیکی چاكو مونتەظەم بە ناوی (عیراق)ەوە بیننە وجودو دائیمەن هەمو فەردیکی کورد ئەهمیەتو لزومی ئیتیحادی کوردو عەرەبی دەرك کردوە.

لەم عەصری میللیەتەدا کوردیش هەمو وەقتیك شعوریکی پاكو بلندی میللی تیا مەوجودە، هەروەکو ئارەزومەندن بۆ ئیدامەی یەکیتی لەگەڵ عیراقا – عەرەبدا لە عەینی زەماندا بە ئیشتیاقو پەرۆشیکەوە ئەیشیانەوێ محافەظەی هەمو عەنعەناتی میللیەو شەرافەتی قەومیەی خۆیان بکەن.

بینائەن عەلەیهی وەکو ئەم قابینە تازەیە ئەم نوقطەی ئیتیصالو ئیتیحادەی دۆزیەوە لازمیشە ئیتر لەمەودوا بە دائیمی سەعی بکرێ بۆ ئیتیحادی ئەم دو جەرەیانەو بە دانی حقوقیکی مەشروعەی میللەتی کورد ئیتیحادیکی تەواو لە بەینی

ئەم دو میللەتەدا تەئمین بکرێ کە نەتیجە لەم ئیتیحادو مەزجی ئەم دو میللەتەدا کیتلەیەکی موتەفیقەو یەك غایە بهینریتە وجودو، ئەمەیش هەر بەم جوزئی ئیهتیمامەوە دیتە وجود، فائیدەو مەنفەعەتی ئەم ئیتیحادە بۆ طەرەفەینە، بۆ هەردولا ئەبێ بە موجیبی بەرز بونەوە، باخصوص بۆ تەرەقیو تەعالی ئەم حکومەتە گەنجەی عیراقە ئەهمیەتیکی حەیاتیەی هەیە.

چونکە بە واسیطەی دۆستایەتی قەومیکی جەسورو جەنگاوەری وەکو کوردەوە دائیمەن حدودی شەرقیو شیمالی عیراق بەرامبەر بە هەمو خەطەریك مەحفوظو موئتمەن ئەبێ جگە لەمەیش لە جامیعەی عیراقدا لە جیاتی بونی عونصوریکی نامەمنون برایەکی پر مەحەببەتو پر جددیەت دیتە وجود.

ذاتەن ئەهمیەتی ئەم مەسئەلەیە وەنەبێ هەر لە ئیستاوە دەرك کرابێ بەلکو لە زەمانی ئیحتیلالەوە حکومەتی فەخیمەی بەریطانیاو هەمو ریجالی سیاسیەی ئەم حکومەتە دەرکی چاکی ئەم مەسئەلەیەیان کردوەو بۆ ئەم غایەیە تێ کۆشاون، هەمو وەقتیك ویستویانە: بە تەوحیدی ئیدارەی ئەم دو میللەتە حکومەتیکی بەرزو بلندو مونتەظەمی وەکو عیراق بهیننە مەیدانەوە.

بەڵام بۆ ئەوەی ئەم دو میللەتە لە یەك دلگیر نەبن، هەراو هوریا نەکەویتە بەینیانەوەو، ئیتیحادەکەیان زیاتر دەوام بکاتو، بە ئەبەدیو بە جددی بژین محافەظەی حقوقی میللیەی کوردەکانیان بە شەرط گرتوەو، لەم ئیتیحادەدا دانی هەمو حقوقیکی مەشروعەی کوردەوارییان بە پیویست زانیوە، لەگەڵ ئەمەیشا کە هەتاکو ئیستا ئەم حقوقە لە حکومەتی عیراقا نەکراوە بە قانونو کەسبی قەطعیەتی نەکردوە، بەڵام صاحیب مەنصبەکانی حکومەتی فەخیمەی بەریطانیا دائیمەن لە کوردستانا ریعایەتی ئەم مەسئەلەو لە هەمو خصوصیکەوە محافەظەی حەیثیەتی میللی کوردەکانیان کە لە مەکاتیبدا تەدریساتو لەمەخابەراتی رەسمیەدا نوسین بە زبانی مادەرزادی خۆیان بێو، بەم سەبەبەوە هەمو کوردەکانیان مەدیونی شوکرانی خۆیان کردوە.

غەیری ئەمیش وەقتیك کە کۆمەلی عالی عیصبەتول ئومەم بۆ حەلی ولایەتی موصڵ تەشریفیان هینایە ئەم موحیطانە، دیسانەوە حکومەتی فەخیمەی بەریطانیا ئەم قەرارەی کە لە پیشا دابویو کە بۆ محافەظەی حقوقی میللی کوردەکان بو لەوانیشی حالی کردو، بە هەمو نەوعیك بەوانیشی سەلمان کە ئەم میللەتە بەم شەرائیطانە قایلە لەگەڵ عیراقا بژیو حەقیقەتەن ئەوانیش لە دوای تەحقیقات بۆیان مەعلوم بو کە لەم ئیتیحادەدا نابێ عەنعەناتی میللی کوردەکان مەحو بکریتەوەو

نەتیجە لە عەلاوەی ولایەتی موصلیدا بە عیراق ئەم شەرائیطانەیان بۆ کوردەکان هینایە وجودو ئەم حقوقەیان پێ بەخشین و حکومەتی عیراقیش ئیعتیرافی پێ کردو، بۆ تەطبیقی وەعدیدا.

ئەم هەنگاوەی کە قابینەی سەعیدیە هاویشتی و کە لە سینەی کوردەواریدا بە شوکران و مەمنونیەتەوە تەقدیر کراو، کە ئەم خەطوە موبارەکە بو بە حەلقەی ئەولای سیلسیلەی سیاسەتیکی موتەفیقانەو برایانە بەرامبەر بە عونصوری کورد. هەروا ئەم حقوقانەی کە بە کوردەکان ئەدرێو کە ئەم قابینەیە بە هەمو عەزمیەوە کردویەتی بە غایەو بە پرۆغرامیك بۆ خۆی کە ئیفاو تەثبیتی بکات ئەبێ بە سەبەبی شوکران و مەسروریەت و مەمنونیەتیکی ئەبەدی ئەم میللەتەو لە نەتیجەیشدا ئەم ئیتیحادە حکومەتیکی عالی گەورەو صاحیب حقوق بە ناوی (عیراق)ەوە ئەهینیتە وجودو ئیلەل ئەبەد مەحفوظو بێ غایلە ئەمینیتەوە.

ئیتر دیسانەوە بەرامبەر بەم لوطفە کەورەیە تەشەکوری حکومەتی عەلیەی عیراق و قابینەی سەعیدیە ئەکەین و ئومیدمان وایە بە مودەتیکی کەم هەمو حقوقیکی تریشمان پێ ئیعطا و لە قەوانینی عیراقا بۆ تەثبیت بکرێ.[٩٢]

### {} صورەتی ئەو تەلغورافانەیە کە بە موناسەبەتی ئەم خەبەرە خۆشەوە لە طەرەف ئەشراف و رەئیسی بەلەی سلیمانیەوە بۆ بەیانی تەشەکورو منەتداری بۆ مەقاماتی عالیە نوسراوە:

تەلغورافی ئەشرافی سلیمانی

فەخامەتی رەئیسەل وزەرای قەهرەمانی عیراق نوری سەعید پاشا

صورەتی بۆ فەخامەتی مەندوبی سامی

صورەتی بۆ مەعالی موستەشاری داخلیە

موقابیل بە قەراری حکومەت بۆ ئیصداری زمانی کوردی لە مەناطیقی کوردیەداو ئیعطای حقوقی سائیرەی کوردان تەشەکوراتی خالیصانەمان تەقدیم و ئینتیظاری لوطفی زیاتر ئەکەین.

---

[٩٢] ژیان، ژ٢٣٥، ١٧ی نیسانی ١٩٣٠

عەبدولرەحمان ئاغا زادە، محەممەد. حەفید زاە، عەبدولقادر. بابان زادە، عەزمی. ئەحمەد پاشا زادە، عەبدولرەحمان. عوثمان پاشا زادە، عیززەت. حاجی رەسوڵ ئاغا زادە، مەجید. مەعروف ئاغا زادە، حاجی مەلا محیدین. خەفاف زادە، حاجی ئیبراهیم. حەفید زادە، سەید عەبدوللا. شیخ مەعروف زادە، شیخ محەممەد غەریب. حسین ئاغا زادە، حاجی حەمە ئاغا. قەزاز زادە، تۆفیق.[٩٣]

## {} تەلغورافی رەئیسی بەلەدیەی سلیمانی:

بۆ فەخامەتی رەئیسەل وزەرا، زەعیمی عیراق نوری سەعید پاشا

صورەت بۆ فەخامەتی مەندوبی سامی

صورەت بۆ مەعالی موستەشاری داخلیە

بەرامبەر بە لوطفکاری حکومەت بۆ ئیصداری قانونی زمانی کوردی لە مەناطیقی کوردیەداو بەخشینی حقوقی سائیرەی کوردان بە ناوی ئەهالی بەلەوە تەشەکوراتی خالیصانە تەقدیمو تەمەنای مۆفەقیتان ئەکەین. رەئیسی بەلەدیە.[٩٤]

## {} تەلغورافی رەئیسی بەلەدیەی سلیمانی بۆ رەئیسی بەلەدیەی کەرکوك:

بۆ رەئیسی موحتەرەمی بەلەدیەی کەرکوك

موقابیل بە لوطفی حکومەت بۆ ئیصداری قانونی زمانی کوردی لە مەناطیقی کوردیەدا بە ناوی سلیمانیەوە تەبریكو ئیشتیراکی سرورتان ئەکەین. رەئیسی بەلەدیەی سلیمانی.[٩٥]

[٩٣] ژیان، ژ٢٣٥، ١٧ی نیسانی ١٩٣٠

[٩٤] ژیان، ژ٢٣٥، ١٧ی نیسانی ١٩٣٠

[٩٥] ژیان، ژ٢٣٥، ١٧ی نیسانی ١٩٣٠

### {} تەلغورافی رەئیسی بەلەدیەی سلیمانی بۆ رەئیسی بەلەدیەی هەولیر:

بۆ رەئیسی موحتەرەمی بەلەدیەی هەولیر

موقابیل بە لوطفی حکومەت بۆ ئیصداری قانونی زمانی کوردی لە مەناطیقی کوردیەدا بە ناوی سلیمانیەوە تەبریكو ئیشتیراکی سرورتان ئەکەین. رەئیسی بەلەدیەی سلیمانی.[96]

### {} جوابی رەئیسی بەلەدیەی کەرکوك:

بۆ موحتەرەم رەئیسی بەلەدیەی سلیمانی

بۆ محافەظەی حقوقی کوردان ئیمەش تەشەکوری لوطفی حکومەتو ئیشتیراکی سروری هەمو کوردان ئەکەین. رەئیسی بەلەدیەی کەرکوك.[97]

### {} جوابی رەئیسی بەلەدیەی هەولیر:

بۆ موحتەرەم رەئیسی بەلەدیەی سلیمانی

بەناوی هەولیرەوە تەبریکاتی بەرامبەریمان تەقدیم، زیاتر بلندی ولاتمان دوعا ئەکەین. رەئیسی بەلەدیەی هەولیر.[98]

### {} وەکو مەوثوقەن

بیستومانە جگە لەم تەلەغرافانەیش روئەسای موحتەرەمەی عەشائیرەکانیشمان بەرامبەر بەم قەرارە خۆشە بە تەلغوراف عەرضی منەتداریو تەشەکوراتیان تەقدیمی مەقامات کردوە.[99]

---

[96] ژیان، ژ٢٣٥، ١٧ی نیسانی ١٩٣٠

[97] ژیان، ژ٢٣٥، ١٧ی نیسانی ١٩٣٠

[98] ژیان، ژ٢٣٥، ١٧ی نیسانی ١٩٣٠

[99] ژیان، ژ٢٥٠، ١٠ی تەموزی ١٩٣٠

## {} (ژیان) برایەکی خۆشەویستو پشتیوانیکی بەقوەتی چنگ کەوت

چەند رۆژێك لەمەوپیش بە سرورەوە بیستمان غەزەتەی کەرکوك کە رەفیقیکی خۆشەویستی ژیانە بە سەبەبی ئەوەوە لە کوردستانو لەناو میللەتی کوردا ئینتیشار ئەکات بۆ ئەوەی ببێ بە ئاوینەی حاڵو تەرجومانی حەقیقەتی میللەتەکە ئیتر لەمەودوا قیسمیکی زۆری بە کوردی ئەنوسرێو ئینتیشار ئەکات. ئەم خەبەرە بە جددی سرورو خۆشیەکی تەواوی خستە دلی میللەتەکەمانەوەو هەمو کوردیك بە پەرۆشەوە چاوەروانی راستی ئەم خەبەرە خۆشەو بە عەجەلە ئینتیظاری چاوپیکەوتنی ئەو غەزەتە کوردیەی ئەکرد. شوکر دوینێ لەناکاودا خەبەرەکە تەحەقوقی کردو غەزەتەکە کە دو صەحیفەی بە کوردی نوسرا بو هاتە سلیمانیو بە داخڵ بونی حەیاتیکی تازەی خستە وجودی میللەتەکەمانەوەو بەم سەبەبەوە (ژیان)یش برایەکی عەزیزو پشتیوانیکی بە قوەتی بۆ پەیدا بو.

خویندەوارەکانمان طاقم طاقم بۆ چاوپیکەوتنو خویندنەوەی ئەم غەزەتە بە قیمەتە موحتەرەمەیە شەتابیان ئەکردو، حەقیقەتەن ئەم مەسئەلەیە ئەمەندە خۆش بو کە لە موقابیلیا ناتوانین بە تەواوی دەرەجەی سروری میللەتەکەمان بەیانو تەعریف بکەین چونکە ئەم دو لیوایە کە دراوسێی یەکترینو ئەهالیەکەی هاوخوین، هەم جنس، هاوزبانو هەمو غایەیەکیان یەکە بە سەبەبی ئەوەوە غەزەتەی کەرکوك هەتا ئیستا بە لیسانی محەلیو مادەرزادی خۆی ئینتیشاری نەئەکرد لە هاواری یەکتری نە ئەگەیشتنو بە فریادی یەکتری نەئەکەوتن بەلام وا شوکور بە سەبەبی لوطفی حکومەتو مەئمورینە ئیداریە بە قیمەتەکانمانەوە ئەم مانعەیە هەلگیراو ئەم پەردەیەی بەسەرمانا راکیشرا بو لابراو لە یەکتری ئاشکراو مەعلوم بوین.

بەرامبەر بەم حەرەکەتە مەعقولە، ئەم مژدە خۆشەو ئەم لوطفە گەورەیە عەلەنەن بە ناوی میللەتەکەمانەوە تەشەکوری حکومەتی موشفیقەو حەقپەرستمان ئەکەین. ئومید ئەکەین ئیتر ئەم ٣ برا عەزیزە کە: زاری کرمانجی، کەرکوكو ژیانە دەست بدەنە دەستو پشتیوانی یەکتری بنو بە هەمو قوەتیانەوە بۆ تەرەقیو تەعالی مولكو میللەتەکە هەوڵ بدەنو تێ کۆشن.[١٠٠]

---

[١٠٠] ژیان، ژ٢٣٨، ٨ی مایسی ١٩٣٠

### {} غەزەتەی کوردی کەرکوك:

دیسانەوە بە خۆشیەوە خویندمانەوە غەزەتەی کەرکوك کە هەتا ئیستا دو سەحیفەی بە کوردی دەرئەچو قەرار دراوە هەمو رۆژیکی دوشەمە دەرچێ و چوار سەحیفەی بە کوردی بێ. بەرامبەر بەم مژدە خۆشە میللەتەکەمان پیخۆشحاڵ بو ئومید ئەکەین ئەم برا خۆشەویستەمان هەتا سەر بە موەفەقی خدمەتی وەتەن و میللەتەکە بکات.[101]

### {} پەیوەندیمان بە برا کوردەکانمانەوە:

ویستی ئەزەلی لە چارەی نوسیون – مەبەستی عەرەب و کوردە – کە هاوکارو یەکگرتو بن بەرامبەر مەترسییەك کە ئەکەویتە سەر یەکیتی عیراق. ئیمەو کورد یەك ئوممەین، میژو و تیکەڵاوی خوین و دین و قازانجی هاوبەش یەکی خستوین. ئەم پیوەندییانە کاریگەرن لە ژیانماندا. نکولی لەوە ناکرێ کە ئیستیعمار هەولی لاواز کردنی ئەم پیوەندییانەی داوە، بەڵام باوەری کوردو عەرەب بە یەکتری تیاری ئیستیعماری راگرت.

صیربەکان بیری جیابونەوەیان لە تورکیا لەلای ئەلبانیەکان خۆش کرد چارەنوسیان چی بو؟ بون بە دەسکەلا سیاسەتی نەمسایی و یۆگۆسلاڤی گەمەیان پێ ئەکەن. ئەرمەنیش، بە یارمەتی هاوپەیمانەکان دژی دەولەتەکەیان، شوین پێی ئەلبانییەکان کەوتن، وا ئەمرۆ توشی دەربەدەری بون وڵاتیك پەنای بۆ بەرن و دەسەڵاتیکیان نیە.

ئیمەش ئەمرۆ، بە داخەوە، هەست بەو تیکدانە ئەکەین کە بە رۆژی روناك روبەروی ئەو مەترسییە ئەبینەوە، ئەوەی داخەکەش زیاد ئەکا، ئەو بەیانەی سەرۆکی وەزیرانە کە ئەیەوێ زمانی کوردی بکا بە زمانیکی رەسمیی لە وڵاتدا بەپێی ماددەی ١٧ی قانونی ئەساسیی عیراق.

[101] ژیان، ژ٢٤٠، ٢٢ی مایسی ١٩٣٠

ئیمە لەلایەنی برا کوردەکانمانەوە لەمە ئەدویین. سەرەرای ئەو ئاژاوەیەی لە وڵاتدا دروست ئەبێ بەوەی دو زمان بکرێ بە رەسمیی. ئەبێ زمانی رەسمیی هەر یەکیك بێ بۆ رایی کردنی قازانجی وڵات. برا کوردەکانمان لەوە تێ ئەگەن کە ئەگەر کوردیان بە زمانی رەسمیی قوبوڵ کرد... چۆن ئەتوانن لەگەڵ عەرەبی عیراق بەشدار بن لە بەریوەبردنی دەولەتداو لە راییکردنی کارەکانیاندا لە قوتابخانە بەرزەکانو جەیشو دیوانی وەزارەتەکانداو، نائیبەکانی کورد چۆن ئەتوانن داکۆکی لە ئاواتەکانی هەلبژیردەرەکانیان بکەن؟.

ئیمە ئەو بەیان وەزارییەی باسمان کرد بە سەرتایەکی خراپ ئەزانین هیواداریـن وڵات لە ئەنجامەکانی رزگاری بێو بیر لە هیچ نەکەینەوە جگە لە رزگاری نیشتمانی هاوبەش لە شەری دەسەڵاتی بیگانە. محامی علی محمود معتمدی حیزبی وطنی.[١٠٢]

## {} قسەی سەرۆکی وەزیران بۆ رۆژنامەکان:

قسەی من دەربارەی مەسەلەی کورد کە لەو کۆبونەوەیەدا باس کراوە ئەوەیە: ئیمە ئەوەمان لەبیر نەچۆتەوە کە لە سەردەمی عوسمانیدا چیمان هەست پێ ئەکرد کە داوامان ئەکرد زمانی عەرەبی بکریتە زمانی رەسمیی لە وڵاتانی عەرەبیدا. جەنابی خەطیب... پاش نابوت بونی سیاسەتی تورکاندن لە مەملەکەتی عوسمانیدا، ئەو سیاسەتەی ئەو وڵاتەی ویران کردو، گەلەکانی هەلوەشاند. ئیمە ئەمانەوێ برا کوردەکانمان عیراقی راستگۆ بن وەکو عەرەب بە دڵ داکۆکی لە وڵات بکەن نەك بە قسەو روپامایی.[١٠٣]

---

[١٠٢] البلاد، ع١٣٠، ١٩٣٠/٤/١٣

[١٠٣] البلاد، ع١٣٢، ١٩٣٠/٤/١٥

{} لاوانی کەرکوك سەرنجی وەزارەت رائەکیشن بۆ مەسەلەی فیرکردن بە زمانی کوردی.[104]

{} زمانی کوردی لە کەرکوك زمانیکی رەسمیی نیە :

لە سکرتیری وەزارەتی مەعاریفەوە بۆمان هاتوە، کە وەزارەتی مەعاریف هەرگیز بیری لەوە نەکردۆتەوە کە زمانی کوردی بکاتە زمانی رەسمیی خویندن لە قوتابخانەکانی ناو کەرکوکداو، هەرچیەك لەم روەوە بلاوکراوەتەوە دورە لە راستییەوە.[105]

{} بۆ جەنابی مودیری موحتەرەمی ژیان :

تکا ئەکەم ئەم چەند قسەیەم لە غەزەتەی موحتەرەمتانا دەرج بفەرمون بۆ بەیانی حەقیقەت:

لە ژمارە ١٩٦و ٣ی تەمموزی ١٩٣٠ غەزەتەی (البلاد)دا لە ژیر ئیمزای نەزیل بغداددا چەند قسەیەك گوترا بو کە تەئییدی قسەی موخبیری غەزەتەی مەزکوری ئەکرد کە لە کەرکوکەوە بۆی نوسیوە.

ئەویش ئەفەرمویت تکا لە وەزارەتی مەعاریف ئەکەم ئەو سوئی تەفاهومە کە لە بەینی تەلەبەکانی کەرکوکدا واقیع بوە هەلی گرن بە سەبەب بونی لیسانی کوردی بە لیسانیکی رەسمی لەو مەنتیقەیەدا چونکی لە مەنتیقەی کەرکوك چەند کەسیك نەبێ هیچیان کوردی نازانن.

ئینجا من کە کەرکوکیم لەم قسەیە سەرم سورماو بە موناسیبم زانی لەم خسوسەوە بۆ بەیانی حەقیقەت چەند کەلیمەیەك عەرزی خویندەواران بکەم.

ئیمە نامانەوێ موناقەشەی ئەم زاتە موحتەرەمە بکەین لە خسوس کوردی زانینی ئەهالی کەرکوکەوە یا نەزانینیانەوە، چونکی ئەمە شتیکی ئاشکرایەو وەکو رۆژ مەعلومە کە نەفسی مەرکەزی لیواکە بە ئەکسەرییەت کورد تەشکیل ئەکاتو بۆ خاریجی لیوا هیچ حاجەت بە نوسین نیە چونکی هەمو کەس ئەیزانێ کە هەمو کوردنو لەژیر هەواو لەبەر کانیو بەفراوی کوردستانا ئەژینو زۆر لە کۆنەوە بە کوردایەتی خۆیان ئیفتیخاریان کردوە. بەلام لام وایە جەنابی موحەریر غەریبەو تازە

[104] البلاد، ع١٩٩، ١٩٣٠/٧/٧

[105] البلاد، ع٢٠١، ١٩٣٠/٧/٩

هاتۆتە کەرکوك لەبەر ئەوە شارەزای ئەحوالی ئیجتیماعیەو لیسانی مەملەکەتەکە نەبوە. ئەگەر ئاشنا بوایە هیچ وەختیك لەم جۆرە خیلافی حەقیقەتانەی نەدەنوسی. فەقەت موخبیرو نەزیلی بەغداد لییان مەعلوم بیت بە ئیجاد کردنی ئەم نەوعە قسە ناحەقانەی ئەوان هیچ وەختێ قەراری عەسەبەتول ئومەم ناگۆڕێ لە خسوس بەخشینی ئەو حەقە کە بە کوردەکانی شیمالی عیراق دراوەو ئەم قەرارە لە تەرەف حکومەتی بەریتانیای گەورەو حکومەتی عیراقەوە فیعلەن تەسدیق و قوبوڵ کراوەو غەیری ئەمەیش فەخامەتی رئیسی وزەرای عیراقیش نوری پاشا سەعید تەئییدی ئەم قەرارەی کردو ئەمریدا لە مەناتیقی شیمالیەدا تەتبیق بکرێ بەڵام مەعەل ئەسەف جەنابی موخبیر تازە لە کلکەوە دەستی پێ ئەکات. زۆر چاك لایان مەعلوم بیت تەنها بۆ چەند تورکمانیك ئیستیقبالی کوردەکانی کەرکوك و ئەتراف مەحوو حقوقیان زەوت ناکرێ. کەرکوکی: عەبدولوەهاب.[١٠٦]

## {} قانونی زمانە ناوچەییەکان ژمارە ٧٤ی سالی ١٩٣١

ئیمە مەلیکی عیراق

بە موافەقەتی ئەعیان و نواب فەرمانماندا بە دانانی قانونی لای خوارو:

ماددەی ١. ئەحکامی ئەم قانونە لەو قەزایانەدا جیبەجێ ئەکرێ کە لە ماددەکانی دوهەم و سیهەم ناوبراون.

ماددەی ٢. ئەلف. زمانی دادگا لەم قەزایانەدا کوردی ئەبێ: ئامیدی، زاخۆ، زیبار، ئاکرێ، کۆیە، رانیە، رەواندز، گل، چەمچەماڵ، سلیمانی، هەلەبجە، شارباژێر.

ماددەی ٣. زمانی دادگا، لەم قەزایانەدا، ئەگونجێ عەرەبی یا کوردی یا تورکی بێ: دهۆك، شیخان، هەولیر، مەخمور، کەرکوك، کفری.

دادگا لە هەر حالەتیکدا خۆی بریار ئەدا چ زمانێ بەکاربهینرێ.

ماددەی ٤. تاوان بە پاڵ دراو لە هەمو حالەتیکداو، لە هەمو ئەو قەزایانەی لە سەرەوەدا ناوبران، ماف هەیە:

ئەلف. بە زمانی عەرەبی دادگایی بکرێ و ئاگادار بکرێ، ئەگەر زمانی ناومالی بێ.

ب. هەمو مرافعاتی بە دەم بۆ تەرجومە بکرێ بۆ عەرەبی یا کوردی یا تورکی و، نسخەیەك لە حوکمەکەی بە تەرجومەکراوی بۆ یەکێ لەو زمانانە داوا بکاو، هەمو

---
[١٠٦] ژیان، ژ٢٥٠، ١٠ی تەموزی ١٩٣٠

کەسێ بۆی هەیە عەریزە بە یەکێ لە زمانەکانی عەرەبی یا کوردی یا تورکی بدا بە هەر یەکێ لە دادگای ئەو قەزایانەی نابران یا دادگەیەکی بەرزتر.

مـاددەی ٥. زمـانی کـوردی لـەو قەزایانـەدا رەسمیـی ئـەبێ، جگـە لـە دائـیرە فنیـەکانو نامـەکاری نیـوان ناوەندی لیواکانو وەزارەتـەکانو، نیـوان ناوەندی لیـوای موسڵو قەزاکانی، کە بە عەرەبی ئەبێ: ئامیدی، ئاکرێ، دهۆك، زاخۆ، زیبار، هەولیر، مەخمور، کفری، رانیە، رەواندز، چەمچەماڵ، گل، سلیمانی، هەلەبجە، شاربازێر.

بەلأم لە قەزاکانی کەرکوكو کفری کوردی یا تورکی بەکار ئەهینرێ.

مـاددەی ٦. لـە هەموقوتابخانـە سـەرەتاییەکانی قـەزاکانی نـاوبراون زمـانی فیرکردن زمانی ناومالی زۆرایەتی قوتابیەکانی ئەو قوتابخانەیە ئەبێ، ئیتر عەرەبی یا کوردی یا تورکی بێ.

ماددەی ٧. هـەمو کەسـێ بۆی هەیـە بـە زمـانی عـەرەبی موراجەعـەتی سـولتانی رەسمی بکاو، بە هەمان زمان وەلأم ئەدریتەوە، بەلأم هەر نامەکارییەکی بە زمانیك کرا کە بە پێی ماددەی پینجەمی ئەم قانونە رێ درابێ وەرئەگیرێو بەهەمان زمانی پێی نوسراوە وەلأم ئەدریتەوە.

ماددەی ٨. لە قەزاکانی لیواکانی سلیمانیو کەرکوكو هەولیردا کە لەم قانونەدا ناوبراون شیوەی زمانی کوردی ئەوە ئەبێ کە ئیستا بەکاری ئەهینن. لە قەزاکانی لیوای موسڵدا، کە لەم قانونەدا نابراون، خەلك خۆیان، لە ماوەی سالیکدا لە کاتی جیبەجێ کردنی ئەم قانونـەوە، ئـەو شیوە زمـانی کـوردی هەلئـەبژیرن کـە خۆیـان ئەیانەوێ.

ماددەی ٩. لەسەر وەزیرەکان پیویستە ئەوی پیوەندی پیيانـەوە بێ جیبەجێی بکەن.

لە بەغداد، لە ٢٣ی ئایاری ١٩٣١دا بەرامبەری ٦ی موحـەرەمی ١٣٥٠ نوسـرا.

فەیصەل

نوری سەعید سەرۆکی وەزیرانو وەکیلی وەزیری ئابوریو هاتوچۆ. موزاحیم پاچەچی، وەزیری ناوخۆ. جەمال بابان، وەزیری عەدل. عەبدوللا دەمەلوجی، وەزیری

دەرەوە. جەمیل راوی، وەزیری دیفاع. رۆستەم حەیدەر، وەزیری دارایی، عەبدولحوسەین، وەزیری مەعاریف.[١٠٧]

## {} تەشریف هینانی وەزیری داخلیە موزاحیم بەگ بۆ سلیمانی:

رۆژی شەممە موصادیفی ١٦ی مایسی ١٩٣١ فەخامەتی وەزیری داخلیە جەنابی موزاحیم بەگ تەشریفیان هینا بۆ سلیمانی لە پیش مواصەلەتیانا لە طەرەف رەئیسی بەلەدیەوە جەنابی مەحمود ئەفەندیەوە بۆ ئینتیظاری موستەقبیلین ئیحضاراتی لازمە ئیجرا کرا. هەمو ئەرکان و موستەخدیمین مەئمورینی مولکیەو ریجالی عەسکەریەو عولەماو سادات و ئەشراف و موتەحەیزانی مەملەکەت لە قەراغ شار لە ظوهرەوە ئینتیظاری تەشریفیان کرد سەعات لە پینج الیفرانغە مواصەلەتیان فەرمو موتەصەررەیفی کەرکوك سەعادەتی تەحسین بەگ لە رەفاقەتیان مەوجود بو. سریەیەك عەسکەری و میقداریك پۆلیس لە رەسمی سەلاما صەفبەستەی سەلام بون لەگەڵ مواصەلەتیان موقابیل بە تەرحیب و خۆشئامەدی موستەقبیلین وەزیری موشار ئیلەیهیش موقابەلەتەن ئیظهاری ئیلتیفاتیان فەرمو. وەزیری موشار ئیلەیهی لەگەڵ رەفیقی موحتەرەمی سەعادەتی تەحسین بەگ لە مالی سەعادەتی موتەصەرریفی لیوا جەنابی ئەحمەد بەگ میوان بون. هەر عەینی ئیوارێ رۆژو شەو لەگەڵ سادات و عولەماو ئەشراف بەلدە مولاقاتیان فەرمو.

دوەم رۆژ کە یەکشەمو بو لە طەرەف رەئیسی بەلەدیە جەنابی مەحمود ئەفەندیەوە بە شەرەفی فەخامەتی وەزیری موشار ئیلەیهیەوە دەعوەتیکی چایی و شەربەت لە باغچەی بەلەدیەدا درا بۆ ئەم دەعوەتە هەمو سادات و عولەماو ئەشراف و موتەحەیزانی مەملەکەت بە تەذکەرەی مەخصوصە دەعوەت کران و لە سەعاتی پینجی الافرانغەدا ئیجتیماع لە مەوقیعی مەذکورا کرا لە پاش قەهوەو چاو شەربەت لە طەرەف جەنابی رەئیسی بەلەدیەوە بە ناوی بەلدەوە نوطقیکی بەلیغ خۆشئامەدی فەخامەتی وەزیر ئیراد کرا. لە پاش ئەو بە ناوی عولەماکانەوەلە خصوص تەکایا و مەساجیدەوە نوطقیك لە طەرەف شیخ محەممەد ئەفەندی گولانیەوە خوینرایەوە. لە پاش ئەو قەس هورمز ئەفەندی بەناوی قیسمی مەسیحیەوە نوطقیکی خۆشئامەدی خوینرایەوەو لە عەقەب ئەوەوە حاخامی میللەتی یەهودیش بە ناوی میللەتەکەیەوە

---

[١٠٧] الوقائع العراقیە، ع٩٨٩، ١٩٣١/٦/١ هەروەها (FO371/15318)

نوطقـيكی خۆشئامەدی ئیراد كـرا. لـە دوای ئـەو رەشـيد ذەكـی ئەفـەندی موديـری مەكتەبی متەوەسيط بە ناوی مەعاريفەوە عەرضی خۆشئامەدیو تەمەنای معاوەنەتی مەعاريف نوطقيكی سەليس خوينرايەوە.

وە لە طەرەف طەلەبەكانی مەكتەب نەشيديكی خۆشئەلحان بيژراو لـە طـەرەف طەلەبەيـەكی كەششافەش نوطقـيكی موئەثير بە شـيوەيەكی مەعصومانـە وتـراو لـە طەرەف طەلەبەيەكيشەوە بەعضـێ ئەشعاری لەطيف خوينرايەوە. وە لە عەقەبی هـەر نوطقـيك زۆر بە حـەرارەت چەپلـەريزانو ئيظهاری شـادمانیو مـەمنونی كـرا لـە پـاش ئەمانە ئينجا فەخامەتی وەزير ئيرادی نوطقـيكی لـەطيفو دلنەوازانـەی فـەرمو و لـەم نوطقـە هـەمو حـاضرون موسـتەغريقی نەشـاط و مـەمنونی بـون. ئـەم نوطقانـە بـە تەسەلسولی خۆی لە ژيرەوە عەينەن دەرج ئەكرين.[108]

## {} نوطقی فەخامەتی وەزيری داخليە موزاحيم بەگ

برادەرينە !

زۆر تەشـەكورتان ئەكـەم بەرامبـەر بـەم ئيعـزازو ئيكرامـە كـە موقـابيلم ريعايـەتتان كردو تەشەكوری ئەوضاع ئەكەم كە مۆفەقی كردم بە ئيجرای مەرام كە دەميك بو ريك نەئەكـەوتو ئـەويش عيبـارەت بولـە زيـارەتی ئـەم ليـوا كەريمـەو گفتوگـۆ كـردن لەگـەل رولەسـاو صـاحيب رەئيـەكاندا. چونكـە نـازانم ئايـا ئيـوە ئـەزانن كـە مـن بەرامبـەر بـرا كوردەكانم نياتو حسياتی زۆر چاكم هەيەو دەميكە لە لای زۆر كەس ئيظهارو بـەيانم كردوە.

من هەروەكو لەمەوپيش بوم ئيستاش موعتەقيدم بە سياسەتی حوبيـەی تـەعاون لە بەينی هەردو عونصوردا چونكە يەگانە ريگا ئەوەيـە بـۆ تەكـەفولی تـەرەقیو تـەعالی عيراقو گەيشتنی بە مەوقعيكی دوەلی كە لايەق بی بە ميللـەلی موتـەرەقيە. بەسـرورەوە بەيانی ئەكەم كە لە گفتوگۆدا كە لە گەل زۆر ذەواتی ئيوەدا كردم صيحەتی ئيعتيقادم بۆ ثابيت بو وە بۆم مەعلوم بو كە منو ئيـوە لـە يـەك فكردايـنو ئيختيلافمـان لـە بـەينا نيە ئەو چەند نوقطە جوزئييانەی كـە بـەعضی كـەس ئيشـارەتيان كـرد ئەوانـە زادەی سوئی تەفاهومنو لەحەقيقەتو لە ئەصلی واقيعدا هيچ شتی نيە تەئيدی بكات.

بـۆم مـەعلوم بـو – بـە خۆشـحاليەوە – كەعومومـەن موخليصـن بـە وەحدەتـی عيراقيـەو لـەريگای بلنـد كردنـەوەو تەقويـەیدا فيداكـارن ئەمـە بـە رەغمـی ئيشـاعەی

---

[108] ژيان،٢٨٣،٢٥ی مايسی ١٩٣١

بەدخواهان و رەغمی دوشمنانی عیراق و رجا ئەکەم تەعەجوب مەکەن لەم تەعریفە چونکە مەعەل ئەسەف لە عیراقدا دوشمنی عیراق هەیە کە بە واسیطەی معامەلەیانەوە خەلەلیان داوە بەشەئن و شوهرەتی ئەو عونصورە کە ئینتیسابیان پیّی هەیە .

لە جوملەی ئەو عەوامیلە کە منی هینایە سەر هەوەس و ئارەزو کە داخلی وەزارەتی فەخامەتی نوری سەعید پاشا ببم یەکیك ئەوەیە کە ئەکیدەن ئەزانم وەزارەت موشار ئیلەیهی بەرامبەر بە کوردەکانمان بە عاطیفەتیکی زۆر لە سیاسەتیدا معامەلە ئەکات و لەوەدا مەرامی خۆم دەست کەوت و ئیّستا خۆشحالّم بەوە کە ئیعلانی بکەم بۆ ئیّوە کە سیاسەتی حکومەت کە من تەشەڕوف ئەکەم بە وەزارەتی داخلیەی لەم کەلیماتەدا خولاصە ئەکریّ .

تا حەدی مونتەهای ئیمکان – سیاسەتی عەطوفەت و ئیخلاص بۆ ئیحیای حسی تەعاون لە بەینی هەردو عونصوردا بۆ بلّند کردنەوەی شەئنی ئوممەتی عیراقیەو دەستکەوتنی ئیستیقلالی تام و گەیاندنی سەفینەکەی بە ساحیلی سەلامەت ئینشائەلّلا. وە ئیّوە چاوتان لیّیە کە ئەم سیاسەتەمان سیاسەتیّکی بابەتیە، سیاسەتی ئاغاوو خذمەتکاری نیە، جا چەند موتەئەللیم ئەبووم کە ئەمبیستەوە بەعضیّ لە کوردەکان عونصوری کوردی ئەکەن بە ئەقەلیەت چونکە ئەی برا گەورانم لەمەدا ئیهانەتیّك ئەبینم بۆ عونصوری موبارەکتان ئەو عونصورە کەلەمەوپیّش ویستومانەو ئیّستایش هەر ئەمانەویّ لەم دەولّەتە تازە پیّگەیشتوەدا شەریکی برای عەرەبی ببینین. ئەگەر دەست بدەینە تاریخی بەعضیّ فامیلیاو شەخصیاتی بارزە لەم عیراقە خۆشەویستەدا قیسمیّکی زۆریان لەوانە ئەدۆزریّنەوە کە لە میللەتی موحتەرەمەی کورد دەرکەوتوە. جا لەبەر ئەمە سیاسەتی تەعاون لەژیّر سایەی وەحدەتی عیراقیەدا لە ماضی و حاضردا ئیّمەی کردوە بە شەریك لە حوکم و لە هەمو معامەلاتی حکومەتی و ئیجتیماعیداو لام وایە موافەقەتم ئەکەن ئەگەر بلّیّم بۆ تەعالی و تەرەقی کوردەکان یەگانە ضامن وەحدەت و ئیستیقلالی عیراقەو تەماشاکردنیّکی بەسیط بە ئەحوالّیان لیّرەو لە مەمالیکی سائیرەدا موستەغنیان ناکات لە ئیرادی بەراهین و تەفصیلات. زەمان گۆڕا، ئەحوالّ زۆر تەبەدولی کردو تەطەوراتی دەولیەو عالەمیە هاتە پیّشەوە کە هەلّئەگریّ حەقائیقی بدۆزینەوەو لە سیاسەت و فکر کردنەوەدا ئوصولّ و ئوسلوبی بیّ فائیدەو کۆن تەبدیل بکەین و عەجەلە بکەین بۆ لابردنی ئەو حەسرەت و ئالامە کە لە ئیّمەدا دروستی کردوەو بۆ ئیّمە وا شیرینە سلوك بکەینە سەر ڕیّگایەکی تازە کە لەگەلّ واقیعدا ئیئتیلاف بکات و لەگەلّ

مومكینـاتـدا موعـاریض نـەبێ‌و نەفسـی خۆمـان فیـدا ئەکـەین بـە هـەواو هـەوەس‌و مەطامیع کە ئەحواڵی مەعلومە نیهایەتی پێ داوە هەروەکو نیهایەتی‌دا بە موعاهەدەی سیڤەرو نصوصە خاصەی کە موتەضەمینی بو.

جا ئەی برادەرینـە لەسـەرمان لازمـە لـە ئـەوهام دور بکەوینـەوەو تەصـەڕوفاتی سیاسیەمان لەسەر ئەساساتێکی وا دابنێین کە قابیلی پێ گەیشتن بێ. وە بـاوڕ بکـەن کە لە شەخصیەتمدا دۆستی هەیە بۆ ئێوە کە بە ئەهمیـەت معاوەنـەت‌و سـەعی ئـەکات کە دڵتـان خـۆش بکـات‌و ئامـاڵ مەشـروعەتان بـەجێ بـهێنێ لـەژێر سـایەی واسـیعی وەحدەتـی عیراقیـەدا، ئـەو ئامالـە کـە نابـێ لـە هیـچ وەقتیـکدا لـە ئـەوقات موعـاریض‌و موباین بێ لەگەڵ مەصلەحەت‌و ئیستیقلالی تەواوی دەولەتی عیراقیەدا.

سیاسـەتی بـەریطانیا بەرامبـەر بە عیراق تـەوەضوحی کردو بە شـکلێ تـەبیینی کرد کە شك‌و تـەئویل قبـوڵ ناکـات. وە وزەرای مەسئولینی بەریطانیا لەمەوپیش لـە مـەحافیلی سیاسـیەدا ئیعلانیـان کـردو ئـەم سیاسـەتە خولاصـە ئـەکرێ بـە ئیلغـای عوموی عەلاقاتی خاصە لەگەڵ بەریطانیاداو تەحقیقی ئیستیقلالی تەواو بۆ عیراق بـە تەسهیل کردنی داخڵ بونی بە عیصبەتول ئومەم.

ئیعتیقـادم وایـە کـە بـەریطانیای عوظمـا تەمامـەن موخلیصـە لـە تـەنفیذی ئـەم سیاسـەتەدا بـەوەدا ئەزانم کە خۆم بیلـذات پـار لـە لـەندەن بـوم لـە ریجـالی مەسـئولی حکومـەت تـەحقیقم کـردو لەبـەر ئـەوە لازمـە بـەریطانیا بـە بـەری ئیعتیبـار بکـرێ لـە معامەلەو تەصەروفاتێ کە موخالیفی ئەم سیاسەتەیەو صەمیمییەتی بریندار ئەکات.

لەم خصوصەوە حەظ ئەکەم فکرتان بخەمەوە کە ئەوەی لیرەو لە بەغداد ئیستیماعی ئەکەن بەعضـێ ئەفرادی بەریطانی لە وەقتی بـەیانی رەئـی شـەخصی خۆیـان وە ئـەو رەئیانـە کـە نیسـبەتی بەوانـەوە ئـەدەن نابـێ بـە موعـەبیری سیاسـەتی بـەریطانیای ئیعتیبار بکەن‌و زۆر تەحذیرتان ئەکەم لە ئیشتیراکی ئەم نەوعە خەطایانە.

عیراق: برادەرانم! ئەیـەوێ نائیلی ئیستیقلالی تـامی ببـێ بـەبێ نوقصـان‌و لـە... بەختیاریەوە کە سیاسەتی بەریطانیا سهولەتدار بوە بۆ گەیشتن بـەم ئەمەلـە گەورەیـە لەبـەر ئـەوە ئەگـەر لـە ریگـایدا موشـکیلات‌و سـەکتە بهینریتـە پیشـەوەو صعوبـەت‌و مـەوانیع خـەلق بکرێ مومکین نیـە پـێی موتەئـەللیم‌و موتەئەسـیف نـەبێ‌و موافیقـی ویجدان‌و ئینصاف نیە ئەگەر حکومەتی عیراقیە لەوم بکرێ بەرامبـەر بـە ئیسـتیهجانی ئەحواڵ‌و معامـەلاتێ کـە بۆ تـەئمینی ئـەرکانی ئینتیـداب ئیجـرا بکـرێ هـەروەکو لـە موصڵ بەیانم کردو ئەمە هیشتا رەمزیکە بۆ نفوذ‌و سەیطەرەی ئەجنەبی.

له بەعضێکم بیست – و طەرەفداری باوەڕ پێ کردنی نیم – کە بەعضێ لە برا کوردەکانمان مەضبەطەیان بۆ بەعضێ جێگا تەقدیم کردوە لەو مەضبەطانەدا بەیانیان کردوە کە حکومەتی عیراقیە لە خصوص کوردەکانەوە موخالەفەتی تەوصیاتی عیصبەتول ئومەمی کردوەو لەبەر ئەوە طەلەبی تەئلیفی حکومەتێکی کوردیەیان کردوە لەژێر حیمایەو ئینتیدابی بەریطانیادا. ڕجا ئەکەم ئەوەی کە بیستومە ڕاست نەبێ چونکە بەڕاست دەرچونی زۆر موتەئەثیرم ئەکات بە صیفەتی ئەوەی کە دۆستو برایەکی ئوممەتی کوردم بەوەی کە شوهرەتو شەرەفی لەکەدار بکات.

تەوصیاتی عیصبەتول ئومەم مەعلومو زانراوە ئەگەر موقارەنەی بکەن لەگەڵ ئەوەی کە لەم وڵاتەدا جاریەو تەطبیق کراوە بۆتان مەعلوم ئەبێ کە حکومەتی عیراقیە هەرچی لەسەری بە فەرض گیراوە هەموی ئیجرا کردوەو لە حوسنی نیەتو ئیخلاصیدا لێی زیادکردوە.

بێینەوە سەر طەلەبی دوەم، ئەوە بە تەواوی موعاریضە لەگەڵ تەوصیەکانی عیصبەتول ئومەمدا وە مەعنای وایە ئەگەر زەعمی ئەوانە ڕاست بێ کە ئەڵێن حکومەتی عیراقیە بە موجیبی ئەو تەوصیانە معامەلەی نەکردوە لیجنەی عیصبەتول ئومەم لە تەقریری ساڵی ١٩٢٥دا ئیضاحی کردوە. من لام موحەققەقە کە ئەصحابی مەضبەطەکان دەرکی (ئەکەن) ئەوەیان نەکردوە کە ئەم طەلەبەیان ئەکاتە ئەم ئیستینتاجە خەطیرە کە خۆیان ڕقیان لێیەتیو ئەزانێ بۆ کەسیان موافیق نیە. ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە نازانم چۆن مومکینە تەئلیفو تەوفیق بخاتە بەینی ئەو فکرو مەیلەوە کە بەعضێ بۆ ئیستیقلالی ئیظهار ئەکەنو وەضعیەتی بیلاد... لەژێر حیمایەی ئەجنەبیدا. من یەقینی تەواوم هەیە کە ئوممەتی کوردیەی عیراقیەی نەجیبە قبوڵی ئەوە ناکات کە مەطالیبی وا بهێننە پێشەوە کە شوهرەتو شەرەفی لەکەدار بکاتو لە موغریضان مەعذەرەتو بەهانە بگرن بەدەستەوە بۆ سەکتەدان بە مەساعی عیراقو بەریطانیا بۆ ئەوەی کە سیاسەتی تەعاونی هەردوکیان بە ئیکلیلی موەفەقیەتو فەوز بڕازێتەوە. وە بزانن و بە تەئکید حاڵی ببن کە بەریطانیا کە حوسنی نیەتی موقابیل بە عیراق بە دەلائیل ئیثبات کرد لە سەعیدا بۆ ئیسقاطی ئینتیدابێ لەسەری قبوڵی ئەوە ناکات کە ئینتیدابو حیمایەی ببێ بەسەر جوزئێکیداو ظەن ناکەم پێی خۆش بێ کە سەکتەی بخرێتە پێشو پێش حەلیفەکەی کە عیراقە لە مەساعی دەولیەدا کە هەردوکیان لە ظەرفی ئەم دە ساڵی ڕابوردودا صەرفیان کردوە.

لام وەقتی ئەوە هات کە ئیتر ئێمە هەمومان ڕابوردو ئالامی و غەڵەطەکانی و ئەو سوئی تەفاهومەی کە لە بەینماندا پەیدای کردوە لە فکرمان بچێتەوەو تەباعودی لێ بکەین و پەردەیەکی ئەستوری بەسەردا ڕابکێشین و بە ئەبەدی بەجێی بهێڵین بە دەمی بە پێکەنینەوە ڕو بکەینە عەهدێکی تازە کە سیاسەتی صاحێبی جەلالەتی مەلیکی موفەدا هێناویێتیە پێشەوە کە پڕە لە ئومێدو ئەمان بە عەزمو ئیرادەیەکی ثابیت و ئیخلاصێك کە مەملەکەت پێی خۆشحاڵ و موطمەئین بێ.

بە زیارەتی لیوا موحتەرەمەکەتان تەشەڕوفم کە دائیر بە حوسنی نیەتی حکومەت و سیاسەتی دڵسۆزانەی بەرامبەر بە ئێوە تەئمینتان بکەم و دەلیلی ئەوەش ئەوا بە ئیسمی صاحێبی جەلالەت و بە تەفویضی فەخامەتی ڕەئیسی وزەرا ئەو موتەهەمانەی کە لە حەرەکاتی ئەخیرەدا ئیشتیراکیان کرد بو عەفوم کردن و بیلفیعل مەوقوفەکانم بەرەڵلا کردو ئەو ئەموالەی کە حکومەت لێی موصادەرە کرد بون وەکو مەڕ و ماڵات بۆم ئیعادە کردنەوەو لەمانە کەسم ئیستیثنا نەکرد ئیللا عەدەدێکی کەم نەبێ کە ئەمانە ئیرتیکابی بەعضی جورمیان کردوە کە لە خۆش بونی مومکین نیەوحکومەتی محەلیە بەمنزیکانە ناوەکانیان نەشرئەکا.

ئێستا دەعوەتتان ئەکەم کە لەگەڵ من پێکەوە نیدا بکەن بۆ ژیانی صاحێبی جەلالەتی عاهیلی عێراق کە صاحێب مەرحەمەتەو بۆ دەوڵەتی موستەقیللەی سەعیدەی عیراق.[109]

ژیان، ژ٢٨٥، ١١ی حوزیرانی ٩٣١.

## بۆ فەخامەتی وەزیری داخلیەی عیراق تەقدیم

## {} تەشریف هێنانی فەخامەتی مەندوبی سامی بۆ سلێمانی:

وەکو لە نوسخەی پێشومانا عەرض کرا بو فەخامەتی مەندوبی سامی ڕۆژی ٩٣١/٥/٢٠ تەشریفیان بە طەیارە هێنا بۆ سلیمانی. ڕۆژێ لە پێش تەشریف هێنانیان خەبەر زانرابووە عەینی ڕۆژ سەر لە بەیانی هەمو ڕوئەسای دەوائیرو موفەتیشی ئیداری لەگەڵ ذەواتی ئینگلیزی و ساداتو ئەشرافو موتەحەیزانی مەملەکەت بۆ مەراسیمی ئیستیقبالیە لەمەوقیعی طەیارە ڕاوەستا بون. قیطعەیەکی عەسکەری لیوای لەحەرەس شەرەف ڕاوەستا بون. سەعات نۆونیوی الافانغە فەخامەتی موشار ئیلەیهی مواصەلەتیان فەرمو عەلەلئوصول مەراسیمی خۆشئامەدی

[109] ژیان، ژ٢٨٣، ٢٥ی مایسی ٩٣١، ژ٢٨٤، ١ی حوزیرانی ٩٣١

ئیجرا کراوموقابیل بەم شەعشەعەی ئیستیقباله دەرحەق بە موستەقبیلین فەخامەتی مەندوب ئیظهاری لوطفوئیلتیفاتی فەرمو.

لەپاش خیتامی ئەم ئیستیقباله فەخامەتی موشار ئیلەیهی لەگەڵ جەنابی موفەتیشی ئیداری سواری ئۆتۆمۆبیل بون تەشریفیان بردە ماڵی جەنابی موفەتیشی ئیداریولەوێ موسافیر بون. لە پاش چەند دەقیقەیەك ئیستراحەت فەخامەتی مەندوب تەشریفیان بردە مەقامی حکومەتی لەوێ زیارەتی ڕوئەسای مەئمورین و ساداتو عولەماو ئەشراف محەلەیان قوبوڵ فەرمو. هەر ئەو ڕۆژە بە شەرەف فەخامەتی مەندوبی سامی لەطەرەف سەعادەتی موتەصەڕیف ئەحمەدبەگەوە دەعوەتێکی پەنجا کەسی درا.جەنابی موفەتیشی ئیداریو بەعضێ ذەواتی حکومەتی فەخیمەی بەریطانیا و ڕوئەسای مەئمورینوساداتو ئەشراف محەلی مەدعو بون. زۆر بەشەوقو شەطارەت. ئەکلی طەعام کرا.

ڕۆژی دوای فەخامەتی مەندوب بە طەیارە تەشریفیان برد بۆ پێنجوینو هەڵەبجەو، بۆئێوارێ عەودەتیان فەرموەوە.

بەیانی ڕۆژی ۱۹۳۱/٥/۲۲ بەتەشییعێکی موطەنطەن سواری طەیارە بون عەودەتیان فەرموەوە بۆ بەغداد، مەملەکەت بە تەشریف هێنانو معامەلاتی نازکەی فەخامەتی موشار ئیلەیهی زۆر مەمنونو موتەهەیجی سرور بون.[۱۱۰]

## {} تەشریف هێنانی جەلالەتی مەلیك فەیصەلی ئەوەڵ بۆ سلێمانی

خەبەری تەشریف فەرمونی حەضرەتی مەلیکی موعەظەم کە هات بۆ سلێمانی وەکو ئاوازەی سەعدو سەعادەتی هەمو ئەهالی مەملەکەت موبەشیرو کەیف خۆش بون بەم لوطفو مەرحەمەتی ملوکانەیە. بەلەدیە بۆ کەمالی ئیحتیشامو ئیستیقبال دەستوبردی کرد بە ئیحضاراتو تەداروکاتی لازمە. لە سێ نوقاطی موختەلیفە طاقی ظەفەر ئیصعاد کراو ئەم طاقی ظەفەرانە لە مەضمونی تەرحیبو تەعظیمو وەحدەتی عیراقیە بە ئەلواحی گۆناگۆن دامەزراو بە وەرەقی ئەشجارو گوڵو ڕەیحان موزەیەن کرا، لەسەر هەمو طاقو مەقاماتی ڕەسمیەو خصوصیە بە هەزاران بەیداغی عیراقی ڕازایەوە، ثورە یا مەثیل هەمو طاقو گوزەرگاه تەنویر کرا.

ڕۆژی ۱۰ی مانگی جاری کە چوارشەمو بو وە موعەیەن بو بە شەرەف قدومی حەضرەتی جەلالەت، سەعادەتی موتەصەڕیفو موفەتیشی ئیداریو ئامیری مەنطیقەی شەرقیەو ضوباطو مەنسوبینی حکومەتی فەخیمەی بەریطانیا لەگەڵ

---

[۱۱۰] ژیان، ژ۲۸٤، ۱ی حوزەیرانی ۱۹۳۱

ساداتو ڕوئەسای دەوائیروعەشائیرو ئەشراف محەلیە تا دەربەند کە نیهایەتی حدودی لیوایە چون بۆ ئیستیقبال. صاحێبی جەلالەت سەعات هەشتو نیوی قەبلەل ظوهر بە حدودی لیوا مواصەلەتیان فەرمو. وفوری جەماعەتی موستەقبیلین هەمو نائیلی دامەنبوسی حەضرەتی مەلەکی بون. مەوکیبی ملوکانە لە دەربەند بۆ تەینال کە مەرکەزی ناحیەی بازیانە حەرەکەتی فەرمو. لەوێ خێوەتو بارەگا هەڵ درا بو بۆ ئیستیراحەتی جەلالەتیو حاشیەو تەوابیعی. گەلێ لە سوارەی مەشهورەی هەمەوەندو عەشائیری سائیرە هات بون کە نائیل بن بە شەرەفی ئیستیقبالی تاجداریەوە. وە ذاتی جەلالەتی کە گەیشتە تەینال لە ئۆتۆمۆبیلەکەی دابەزیو موصافەحەی لەگەڵا فەرمون. لە پاشا مەوکیبی عالی دەستی کرد بە حەرەکەت بۆ سلێمانی لەوێش جمهورێکی عەظیم لە ئەهالی هاتبونە دەرەوە ساحەی ئیستیقبال لە پێش مەوعیدی وصولی جەلالەتی بە سەعاتێ وە لیجنەی تەشریفات مەشغوڵی صفوفی موستەقبیلین بو حەسەبی تەرتیباتی موقەڕەرەو، لە پێش وصولی مەوکیبی مەلەکی سریەیەك حەرەس شەرەف حاضر بونو لە پێشیانەوە طاقمی مۆسیقا کە بۆ ئەم خصوصە ئیستیحضار کرا بون کەششافەی مەداریسو مۆسیقایان لە چەپەوە لەسەر وەضعیەتێکی شیرینو تیپێ لە سوارەی پشدەریو یەکێ لە هی جاف لە پێش مەوکیبی مەلەکیەوە لە نزیك مەوقیعی قلیاسانو لەوێشەوە بۆ سلێمانی.

لە سەعات دەو چل دەقیقە مەوکیبی مەلەکی گەیشت فیل حال ٢١ تۆپ ئەنداخت کرا. مۆزیقەی ڕەسمی سەلامی لێدا ذاتی حەضرەتی تاجداری کە گەیشتە حەرەس شەرەف لە ئۆتۆمۆبیلەکەی دابەزی. صەف صەف عەسکەری تەفتیشو تەلطیف فەرمو. کەششافەی مەداریس بە شەرقیو نەشیدەوە زەمزەمەو ئاهەنگێکی خۆش ئەلحانی تەهیجو تەسریری قلوبی عمومیەی ئەکرد. ذاتی شاهانە کە تەشریفی بردە چادرێ کە مەخصوص بۆیان حاضر کرا بو لەوێ قوبوڵی موصافەحەو خۆشئامەدی عولەماو ڕوئەسای موڵکیەو عەشائیری فەرمو. لە پاش چەند دەقیقەیەك سریەیەك پۆلیس سوارەو سوارەی عەشائیر پێشدار بون مەوکیبی هومایون لە عەقەبی ئەوانەوە ئاهیستە ئاهیستە ڕو بە شار حەرەکەتیان فەرمو. ئۆتۆمۆبیلی تاجداری ذاتی جەلالەتیو سەعادەتی موتەصەڕیفی تێدا بو لە عەقەبی ئەوانەوە حاشیەی ملوکانەو لە پاش ئەوانیشەوە چل پەنجا ئۆتۆمبیلی موستەقبیلین قافڵەو ڕیزێکی پڕ ئیحتیشامی تەشکیل کرد بو.

لە مەوقیعی ئیستیقبالەوە هەتا ماڵی موتەصەڕیف ڕاستو چەپی جادە بە صفوفی ئەهالی گیرا بو. قافڵەی موحتەشەمە لە طەرەف ئەم صفوفی ئەهالیەوە بە وصولی جەلالەتەوە بە ئاوازی تەعظیمو چەپڵە کنکرەی ئاسمانی تەهذیز ئەکرد. وەقتێ کە لە

ماڵی سەعادەتی موتەصەڕریف دابەزین لە پاش مودەتێك ذاتی پەناهی و حاشیەی موحتەرەمەی لە ماڵی سەعادەتی موتەصەڕریف تەناولی طەعامیان فەرمو. لە پاش ئیكمالی طەعام ذاتی پادشاهی لەگەڵ ٢٠ كەس لە ڕوئەسای دەوائیری موڵكیەو ئومەرای عەسكەریە تەشریفیان برد بۆ مزگەوتی گەورەو زیارەتی مەرقەدی حەضرەتی كاك ئەحمەدیان فەرموو لە پاشان دو ڕوكعەت نوێژی سونەتی لەلای مەرقەدی كاك ئەحمەد كردو ئەمری فەرمو ٢٠٠ ڕوپیە تەوزیع بكرێ بەسەر حافظەكانی مزگەوتی گەورەداو جبەیەكی فاخیری خەڵاتی شێخ عەبدوڵڵای خەطیب فەرمو.

لە دوایی‌دا موافیقی پرۆغرام كە لە ماڵی موفەتیشی ئیداری حەفلەی چایی ئیحضار كرا بو لە سەعات پێنجا حەضرەتی جەلالەتی تەشریفی فەرمو بۆ ئەوێ. لە وەقتی گەڕانەوەی‌دا تەشریفی بردە خەستەخانەی مەلەكی و لەوێ دەرحەق بە ئەهالی عاطیفەی ئەبەویەی ئیظهار فەرمو بە مژدەی بینایەكی تازە كە صاڵح بێ بۆ خەستەخانەیەكی عەصری.

بۆ ئێوارێ ذاتی جەلالەتی لە ماڵی موتەصەڕریف لەگەڵ ضوباطو مۆظەفینی بەریتانیا و نائیبی قۆنسوڵی ئیمپراتۆریەتی ئێرانی تەناولی طەعامی عیشای فەرمو.

قەرار وابو ڕۆژی دوەم ١٩٣١/٦/١١ كە حەضرەتی جەلالەتی سەرای حكومەتی بە قدومی موبارەكی موشەڕەف بكا. موافیقی ئەم قەرارە سەعات لە هەشت و نیوی قەبلەل ظوهر بۆ ڕەسمی سەلام سریەیەك لە جەیشی عیراقی و طاقمی مۆسیقا لەبەردەمی سەرا صەفبەستەی ئیحتیرام بون. ذاتی حەضرەتی تاجداری بە حیشمەت تەشریفیان برد بۆ سەرا. جەلالەتی لەسەرای مەكثی فەرمو هەتا سەعات دەو نیوی قەبلەل ظوهر لە ظەرفی ئەم مودەیەدا ڕوئەسای عەشائیرو دەوائیرو ڕیجالی دین و ئەشراف و توجارو جەماعەتی مولحەقات بە شەرەفی زیارەتی پادشاهی نائیل بون. وەقتێك كە ذاتی جەلالەتی سەرای بەجێ هێشت ئارەزوی دیدەنی مەداریسی كوڕان و كچانی كردو لەوێ ئیضهاری لوطف و شەفەقەتی دەرحەق بە ئەبنای وەطەن فەرمو. لە مەدرەسەی متەوەسیطە طەلەبەیەك قەصیدەیەكی خۆشئامەدی خوێندەوەو هەروەها لە مەدرەسەی ئولاو ثانی كچاندا. لە پاشا زیارەتی بینای مەكتەبی زانستی و تەشمیلی لوطفی عالی فەرموو صەد ڕوپیەی تەبەڕوع كرد بۆ تەعلیمی نەخوێندەوارەكان.

ئینجا جەلالەتی گەڕایەوە بۆ ماڵی موتەصەڕریفی لیواو طەعامی قاوەڵتی فەرمو لەسەر سفرەكەی جەماعەتێ لە وجوهی بەلدەو ڕوئەسای عەشائیر مەوجود بو. وە بەلەدیە ئیقامەی حەفلەیەكی چایی كرد لە باغچەكەی‌دا. لە عەینی ڕۆژدا بە

موناسەبەتی تەشریفی جەلالەتیەوە بۆ لیوای سلێمانی کە وجوهو ئەشراف و قەومو وفودو مولحەقات دەعوەتی ئەم حەفلەیە کرا. سەعات پێنج کەششافەی مەداریس، مۆسیقاو جەیش حاضر بون و، لە حینی تەقەرروبی مەوکیبی مەلەکی مۆزیقەی سەلامی مەلەکی لێداو کەششافە تەرەنومی نەشائیدی خۆشئامەدی کردو، جەلالەتی داخلی بینای باغچەکە بو لە بەینی چاپڵەی حاضرونا لە پاش تەقدیمی چای و جگەرە لە طەرەف بەلەدیەوە، سەید عەبدوڵلا ئەفەندی خەطیب خوطبەیەکی دوعای خوێندەوە بە ئیسمی عولەمای کیرامو سادات و مەشایەخی عیظام. لە عەقەبی ڕەئیسی بەلەدیە خوطبەیەکی خۆشئامەدی خوێندەوە بە ناوی ئەهالی بەلدە خصوصەن و ئەهالی لیوا عومومەن. لەدوای ئەو مدیری متەوەسیطە هەستاو ئیلقای خیطابێکی بە وەکالەتی هەیئەتی تەعلیمیەی لیواوە و، لە پاش ئەو قوسطەنطین ئەفەندی عەلەکە خوطبەیەکی بەناوی جەماعەتی مەسیحیەوە خوێندەوەو لە دوای ئەو موعەللیم ڕەحمیم ئەفەندی هەستا و ئیلقای خوطبەیەکی کرد بە وەکالەتی میللەتی موسەویەوە. لەم وەقتەدا صاحێبی جەلالەت مەلیکی موعەظەم هەڵساو حاضرون ئیجلالەن وە ئیحتیرامەن هەمو هەڵسان و مقابەلەیان کرد بە چەپڵەیەکی بە شیدەت و ئیلقای خوطبەیەکی ئیرتیجالی فەرمو کە مدیری تەحریراتی لیوا تەرجومەی کرد بە کوردی. حاضرون چەند دەفعە چەپڵەیان لێدا.

وە لە پاش ئەوە کە جەلالەتی خوطبەکەی تەواو کرد دوبارە هەستاو. بەدەستی موبارەکی خۆی نیشانی ڕافیدەینی لە سەر سنگی موتەصەڕیفی لیوا سەعادەتی ئەحمەد تۆفیق بەگ تەعلیق کردو فەرمو: لەبەر تەقدیری خەدەماتی مەتەصەڕیفی سابیقەو لاحیقە ئەوا من ئیعطای پێ ئەکەم نیشانی ڕافیدەین لە دەرەجەی ڕابیع نەوعی مەدەنی. حاضرون چەپڵەیان لێ دا. موتەصەڕیف لە پاش وەرگرتن و ماچکردنی نیشانەکە چەند کەلیمەیەکی ئیرتیجالیەی خوێندەوە. (ئەوەی کە قیامی پێ کردەوە لە خدەماتی ئەدای واجیباتی بوە موقابیل بە صاحێبی تاج و میللەت و لەمەودوا سەعی و جەهد ئەکا بۆ خذمەتی عەرشی عیراق بەهەمو حوبو ئیخلاص و بۆ خذمەتی برایانی لە سێبەری تەختی جەلالەتی مەلیکی موعەظەمدا) حاضرون قسەکەیان بە چەپڵەڕێزان موقابەلە کردو، لە پاشا جەلالەتی تەرکی باغچەکەی کردو سەعات شەش و نیو جەلالەتی بە ئۆتۆمۆبیل تەشریفی برد بۆ سەرچنارو لە ڕەفاقەتیا موتەصەڕیفی لیواو موفەتیشی ئیداری مەوجود بون و لەپاش گەڕانی ئەطرافی دارستانی سەرچنار گەرایەوە بۆ سلێمانی و طەعامی عیشای تەناول فەرمو..وە لە خذمەتیا بەعضێ لە زوعەمای خاریج و وجوهی بەلدە مەوجود بون.

ڕۆژی سێهەم ١٩٣١/٦/١٢ مەوکیبی عالی مەلەکی لە سەعات پێنجی قەبلەل ظوهر دا حەرەکەتی کرد بۆ هەڵەبجە بە ڕەفاقەتی موتەصەڕیفی لیواو موفەتیشی ئیداریو ئامیری مەنطیقەی شەرقیە. وەقتی وڕۆلی جەلالەتی مەلیك بە خورماڵ جەمعیەتێکی غەفیر ئیستقبالیان کرد لە ڕوئەسای عەشایەرو ئەو مەحاڵە. وە لە خورماڵەوە حەرەکەتیان کرد بۆ هەڵەبجە، بەلەدیەی هەڵەبجە طاقێکی ظەفەری ئیقامە کرد بو لە مەدخەلی شاراو نەصبی خیامی کرد بو بۆ موستەقبیلینو جمهورێکی عەظیم لەوێ مەوجود بون لە ئیستیقبالی جەلالەتیاو، لە پێشیانەوە بەگلەری جافو ڕوئەسای عەشیرەتی هەورامانو نەوڕۆڵیو شێخانی طەریقەتی نەقشبەندیە ئیستیقبالیان کرد بە حەماسەتێکی شەدیدەو موبالەغەیەکی زائیدەوەو، لەپاش موصافەحەی جەلالەتی لە گەڵ موستقبیلین حەرەکەتیان فەرمو بۆ ماڵی قائیمقام لە گەڵ ڕوئەسای عەشائیرو وجوهی بەلدەو لەدوای ئیستراحەتێکی کەم جەلالەتی تەفەقودی مەدرەسەی ئیبتیدائیەی فەرموو لەوێ طەلەبەکان صەفبەستە... کەشافەو تەحییەتی جەلالەتیان کرد. جەلالی حامید بەگ...طەلەبە بە هاتە پێشەوە کە عومری هەشت ساڵ بو..شیعریەی شیرینی خوێندەوەو، لەدوای ئەو... خوطبەیەکی خۆشئامەدی لەطیفی کرد... لە خوطبەکاندا جەلالەتی مەلیك بینای مەکتەبەکەی تەرك کردو عەودەتی فەرموەوە بۆ سلێمانی لە سەعات شەشی بەعدەل ظوهر لە عەینی ڕۆژدا تەناولی طەعامی عیشای لە ماڵی موتەصەڕیفدا کردو لەسەر سفرەکەی جەماعەتی ئەشرافو وجوه هەمو مەوجود بون.

ڕۆژی چوارەم ١٩٣١/٦/١٣ بەلەدیە ئیستحضاری خەیمەو کورسی زۆری کرد لە ساحەی موخەصەصە بۆ ویداعی جەلالەتیو لە پاش طلوعی شەمس موەدیعینو حەرەس شەرەفو کەششافەی مەداریس ئەخذی مەواقیعیان کرد. سەعات لە حەوتی قەبلەل ظوهر مەوکیبی مەلەکی واصیل بو بەو مەکانە، مۆزیقە سەلامی مەلەکی لێداو جەلالەتی دابەزیو یەك یەك موصافەحەی لەگەڵا کردنو لە دواییدا سواری سەیارەی مەلەکیە بوو، لە پاشیەوە حاشیەی کەریمەو بۆ تەشیعی جەلالەتی تا حدودی لیوا موتەصەڕیفو موفەتیشی ئیداریو ئامیری مەنطیقەی شەرقیە لەگەڵ ئۆتۆمۆبیلەکان وجوهو ئەعیان ڕو بە کەرکوك حەرەکەتیان فەرمو.[١١١]

---

[١١١] ژیان، ژ٢٨٦، ١٨ی حوزەیرانی ١٩٣١

تەشەکوری خەطیبەکان ئەکەم بۆ ئەو حسسییاتە نەبیلانە لە بابەت ئیخلاص و تەعەلوقی میللەتەوە ئیظهارتان کرد.

ئارەزوم ئەکرد بمتوانیایە بە عەیبی زمان جوابیان بدەمەوە فەقەط ئومێدی عەظیمم هەیە لە ئیستیقبال‌دا بەبێ زەحمەت موەفەق ببم بەوە، چونکە ئێستا بێ تەرجومان هەرچیەك بە کوردی وترا تێ ی گەیشتم.

من خۆم حاضر نەکرد بۆ قسەکردن، فەقەط بینا لەسەر ئارەزوی ذەواتی حاضرون کە تەمثیلی طەبەقات و جەماعاتی موختەلیفەی ئەم لیوا مەحبوبە ئەکەن چەند کەلیمەیەك ئەڵێم:

لێتان شاراوە نیە کە دین بۆ خوایەو وەطەن بۆ هەمو لایەکە. لە نەظەری مندا لە بەینی سوککانی مەملەکەتە مەحبوبەکەمدا هیچ فەرق و تەمییزیك نیە. وەطەن بۆ هەمومانە. ئەم شاخانەو ئەم دۆڵە جوانانە ملکی باقی سوککانی لیواکانی تری عیراقن، هەروەکو ئەهلی ئەم لیوایە حەقیان لە هەمو بستێکی لیواکانی تردا. لەمەش زیاتر ئەڵێم، ئەڵێم هەمو دڵۆپێك لە خوێنی سەکەنەی ئەم لیوایە لە خوێنی هەمو عیراقیەکانە. عیراقیەکان لەم وەطەنەدا هەمو بران و هیچ شتێك نیە کە لە خدمەت کردن دوایان بخات.

دێینە سەر مەسئەلەی دین و مەذهەب، ئەمانە عائیدن بە خواو لازمە لە بەینی عەبدو مەعبوددا، لەناو دیواری مزگەوت و کڵێسادا بمێنێتەوە.

هیچ شوبهەی نیە کە هەر یەك لە ئێوە ئەیزانێت کە حکومەتی عیراق قبوڵی تەجزیئەو تەفریق ناکات، وە بە ئیعتیباری عومومی حکومەتی عیراق بۆتە جوزئێکی لایەتەجەزەئی و لەبەر ئەمە مەحاڵە کە سەکەنەی ئەلویەی جنوبیە بتوانن، بێ ئەوەی ئەم لیوایە جوزئێك لە وەطەنەکەیان و بە دەستیانەوە بێت لە ئەمنیەتا بژین و کەذا موستەحیلە بۆ ئەهالی ئەم لیوایە کە یەك ڕۆژ بتوانن، بەهەر شکڵ و وەضعیەتێك بێت، بەجیا لە وەطەنی عیراقی و لە برا عیراقیەکانیان بژین. ئەمە حەقیقەتێکی ئەوەندە ئاشکرایە کە هەمو عیراقیەك ئەیزانێت و ئەقوامی سائیرەش ئیشتیراکیان ئەکات. لەسەر ئەم ئەساسە حکومەتی عیراقیە تەئەسوسی کردوەو لە ئیستیقبالێکی نزیکا لەناو ئومەمی سائیرەدا بە ئیستیقلال و وەحدەتەوە ئەخذی مەوقیع ئەکات.

بە ئیعتیباری فەردو حکومەت لەسەر هەمومان لازمە کە واجیباتی خۆمان بەرامبەر بە وەطەنی موقەدەس ئەدا بکەین، وە لە هەمو ئێشێکدا کە خدمەتی

بەرزکردنەوەی وەطەن‌و تەحەقوق پێ کردنی ئامالی وەطەنیەی تێدا بێت تەشریکی مەساعی بکەین‌و یارمەتی یەکتری بدەین.

لە ڕۆژی تەئسیسەوە، وە ئەمڕۆ، وە ئیلەل ئەبەد پرۆغرامی حکومەتی وەطەنیە ئەمەیە کە لەناو ئەفرادی میللەتدا عەدالەت بڵاو بکاتەوەو تەطمینی ڕەغائیبیان بکات بە خدمەتگوزاری مەنافیعی وەطەن.

لە جوملەی ئەمانە حکومەت قانونێکی دانا کە بە موافیقی ئەو قانونە حورڕیەتی تەعلیم‌و موحاکەمات تەئمین کراوە. کوردێك بە زمانی خۆی فێری خوێندن بێت‌و، کەذا عەرەب‌و تورکیش بە زبانی خۆیان فێری خوێندن ئەبن. وە بۆ ئەوەی تەئمینی عەدالەت بکرێت حوککامی مەحکەمەی ئەلویەی عیراقیە لازمە شارەزای زبانی ئەو کەسانە بن کە محاکەمەیان ئەکەن. عەلاوەتەن حورڕیەت بەخش کراوە کە موکاتەبەی بەینی دەوائیرو ئەشخاص بەو زبانە بێت کە ئەکثەریەتی ئەو لیوایە تەکەللومی پێ ئەکەن. هەروەکو لە ماضی‌دا بوە لەمەودواش عادات، عەنعەنە، ئەدیان‌و مەذاهیب ئیحتیرامی تەواویان ئەگیرێت.

خولاصە حکومەتم عەزمی کردوە لەسەر ئەساسی حورڕیەت، عەدالەت‌و عەطف‌و ئیفای وەجائیبی وەطەنیە بە ئیخلاصەوە تەمشیەتی ئومور بکات‌و، ئەگەر لەمانەدا قصوری کرد من خۆم موراقەبەی ئەکەم.

وەضعیەتی سیاسی مەملەکەتەکەم تەقەڕوڕو تەعیین کردوە مەجالی ئەوە نەماوە کە تەبدیل‌و تەغییر بکرێت.

بینائەن عەلەیهی لازمە لەسەر میللەت کە هەمو معاوەنەتی حکومەت بکەن بۆ ئەدای واجیباتی عومومیەی، وە ئەگەر یەکێك لەم ڕێگایە لابدات شاذێك تەشکیل ئەکات وەکو کوڕەکەی نوح پێغەممەر کە وەختێ باوکی بانگی کرد.

بۆ تەئمینی میللەتەکەم لە بابەت ئەو مەرکەزە سیاسیەی ئەم وڵاتە نائیلی بوە هەرچی لازم بو وتم. ئێستا ئەوەی بۆ ئێوە مابێتەوە ئەوەیە کە جەهدو سەعی تەواو بنوێنن بۆ ژیاندنەوەی ئیقتیصادیات، وەکو تیجارەت‌و زەراعەت، تاکو نەهضەی ئیجتیماعیەی عیراق بکات لەگەڵ ئەو هەنگاوە گەورانەی کە لە سیاسەتدا هاویشتویەتی.[١١٢]

FO371/15318

[١١٢] ژیان، ژ٢٨٧، ٢٥ی حوزەیرانی ١٩٣١

پەلەیە
کۆپی خولاو لە خاوەن شکۆوە - سەرۆک وەزیران - بۆهەر هەمو وەزیرەکان - جگە لە وەزیرانی دەرەوە، بەرگری و بەڕێوەبەرییەتی گشتی A. W. Q. A. F.

## بابەت : سیاسەتی کوردی

١- لیرەدا من لیستێك دەنێرم بە زانیاری ورد لەسەر فەرمانبەرانی وەزارەتەکەت کە کوردی نازانن کە لەلایەن دیوانی شارەکانی ئەربیل، کەرکوك، سلێمانییەوە نێراون. لەگەڵ کۆپییەك لەسەر کۆبونەوەی ڕۆژی (١٩٣١/١٠/٧) کە لە ئۆفیسی وەزارەتی ناوخۆیی ئەنجام دراوە.

٢- تکایە دەتوانی ئاگادارم کەیتەوە کە :

ئەلف : کە ئاخۆ ئەو لیستەیە ڕاستە، گەر هەڵەی تیایە، وا بکە کە لیستەیەکی ڕاستم پێ بگات زۆر بە پەلە.

بێ: چ ڕێ‌و ڕەسمێك دەگرنە بەر بۆ ئەوەی ئەو فەرمانبەرانە بگۆڕن کە کوردی نازانن، چەندە وەختیان دەوێ بۆ فێربونی زمان.

جیم: لە حاڵەتێکدا گەر ئەوە نەکرا بەم زوانە، وا بکەن کە بایی ئەوەندە کوردی فێر بن کە کارەکانی خۆیانی پێ ئەنجام بدەن. دەکرێ واش دەست نیشان بکرێن کە بتوانن لە تاقیکردنەوەدا دەرچن سەبارەت بە فێربونی زمان، گەر سەرنەکەوتن دوای چەند مانگێك لە ناوچە کوردیەکان دوربخرێنەوە. سەرەڕای ئەم ڕاپۆرتە ناوخۆییە، من ڕاپۆرتێکی دیکەم گەرەکە لە کۆتایی دو مانگدا کە چی پێشکەوتنێك بەڕێوە چوە لەو ماوەیەدا بۆمی بەیان بکەن.

٤-لە داهاتودا گەر ناچار بون کە فەرمانبەری وا دابمەزرێنێ لە ناوچە کوردیەکان کە کوردی نازانن، تکایە لەو حاڵەتەدا ڕاپۆرتێکم بۆ بنوسە کە بە وردو درشتی هۆی ئەو جۆرە دامەزراندنەم بۆ بەیان بکەی.

٥-تاقیکردنەوەکانی زمان: من دەخوازم کە جۆرە سیستمێکی تاقیکردنەوە بۆ زمانی کوردی بەڕێوە بچێ بۆ هەمو ئەو فەرمانبەرانەی کە لە خزمەتدان یان لەوانەیە لە داهاتودا لە ناوچە کوردیەکانی سەر بە عیراق خزمەت بکەن، هەروەها بۆ ئەو فەرمانبەرانەی کە ئێستا لەو ناوچانەدا کار دەکەن‌و کوردی نازانن، پێویستە وەختێکی دیاریکراویان بدرێتێ، بڵێ سێ مانگ، (هەرچەندە وەختی پێویست‌و ماقوڵ لە لایەن پسپۆڕانەوە) بڕیاری لەسەر دەدرێ کە تیایدا بایی ئەوەندە کوردی

فێر بن کە بگەنە ئاستێك کاروباری خۆیان بە کارامەیی بەڕێوە ببەن. بۆ نمونە کاتبێك کە لە بەشێکی تەکنیکی دەست بەکارە مەرج نی یە بە قەد کارگێڕێك یان دادوەرێك کوردی بزانێ. ئەو فەرمانبەرانەی کە لەو ناوچانەدا خزمەت دەکەن یان لە دەزگا حکومەتی یەکان کارگێڕن کە تیایدا دوو تا سێ زمان بەکاردێت وەکو عەرەبی و کوردی و تورکی بە پێی دەرکردنی ((یاسای بەکارهێنانی زمان لە ناوخۆدا)) دەبێ بایی ئەوەندە لەم زمانانە بزانن کە بتوانن بەکارامەیی کارەکانی خۆیان ئەنجام بدەن. ئەم خاڵەیان جێی بایەخێکی گرنگە چونکە زانراوە کە نەك فەرمانبەر ببێ ئەو زانینی زمانانە کارامەو لێهاتو نابێ، بەڵکو ڕێی تێ دەچێ کە ببێتە مایەی هەستی ناجۆرو بەریەك کەوتن لە نێوان فەرمانبەران و خەڵکی ئەو ناوچانەی کە ئەوان کاری تێدا دەکەن. لەمەڕ مەسەلەی تاقیکردنەوە لە زمانی کوردی‌دا، وا پێشنیار دەکرێ کە پاداشت و خەڵات لەلایەن حوکمەتەوە بدرێ بەو فەرمانبەرانەی کە سەردەکەون، چونکە ئەوە پتر هانیان دەدا خۆ ماندو بکەن، دەکرێ خەڵاتەکان بەم شێوەیە بڕوا بەڕێوە: (٥٠) ڕوپیە بۆ تاقیکردنەوەی سەرەتایی، هەشتا ڕوپیە بۆ قۆناغێکی بالاترو (١٢٠) ڕوپیە بۆ ئاستێك کە توانا وەرگێڕان لە خودا بەدی دەکەن.

٦- لە میانەی گەڕانەکانمدا بە ناوچە کوردی‌یەکاندا لەم ساڵەدا بۆم دەرکەوت کە مامۆستایانی ژن لە قوتابخانەکاندا زۆر کەمن. هەر بۆیە سەرنجی وەزارەتی پەروەردە بۆ ئەم حەقیقەتە ڕادەکێشم، داواشم ئەوەیە کە هەرچی دەکرێ بیکەن بۆ ئەوەی خانمانی کورد ڕابهێنرێن تا ببن بە مامۆستا.

٧-داوا لە وەزارەتی ناوخۆیی دەکرێ کە هەندێ ڕێنمایی دەربکات بۆ بەڕێوەبەری گشتی پۆلیس کە هەندێ هەنگاو هەڵنێن کە زۆر پێویستە تا بایەخ بەو مەسەلەیە بدا کە هەندێ لە ئەفسەرانی پۆلیس کوردی نازانن و کەچی لە ناوچە کوردنشینەکان دامەزراون.

٨-من سەرنجم بۆ خاڵێکی تر دەچێ لەمەڕ ئەو حەقیقەتەی کە ڕاستە لە بەندی پێنجەمدا هاتوە سەبارەت بە (یاسای زمانە ناوخۆییەکان) کە دەکرێ کوردی و تورکی لە ناوچەکانی کەرکوك و کفری‌دا وەك زمانی ڕەسمی بەکار بێن، بەڵام لە ڕاستی‌دا بە تەنها تورکی بەکار دێ. پەیڕەوکردنی ئەو یاسایە سەبارەت بەم مەسەلەیە دەبێ فەراهەم بکرێ.

{کۆپییەك لەگەڵ ئەو کۆپییەی مەحزەری کۆبونەوەکە بۆ سەرۆکی دیوانی پاشایەتی}

"نهێنی"
ژمارە پۆست (٤٣٩)
N. P. O. 439

شوێنی نیشتەجێ بون
بەغداد – ١٩٢٨/١١/٢٧

## بەڕێزم سەرۆك وەزیران...

ئایا دەکرێ بەڕێزت بە میهرەوە بگەڕێتەوە بۆ نامە باوەڕ پێ کراوەکەم ژمارە: P. O. 426 کە لە بەرواری (١٩٢٨/١١/٢٢)دا دەرچوە لەمەڕ مەسەلەی ئەو پەیمانانەی نێوان حکومەتی بریتانیای مەزن و عێراق سەبارەت بە بەڕێوەبردنی ناوچە کوردییەکان، هەروەها مەسەلەی مانەوەی (عەبدولمەجید بەگ ئال یەعقوبی) لە پۆستی خۆیدا وەك موتەصەڕیفی ئاربیل (هەولێر).

من وابزانم بیرم چوە لەو نامەیەدا کە سەرنجی جەنابتان بۆ ئەو موزەکەرەیە ڕابکێشم لەمەڕ مەسەلەی ئەو بەڵێنانەی کە بریتانیا لەسەر ئاستی جیهانی داوییەتی سەبارەت بە عێراق کە تیایدا کۆپییەك بە شێوەیەکی ڕەسمی گەیشتە دەست نوێنەرە کۆنەکەی تۆ (جەعفەر پاشا ئەلعەسکری) لە کۆبونەوەکەی وەفدەکان کە هاتبون گفتو گۆ لەسەر پەیماننامەی ئەنگلۆ/عیراق بکەن کە لە ئۆفیسی کۆلۆنیال بەسترا لە بەرواری (١٩٢٧/١١/١). لەو موزەکەرەیەدا هاتوە وەك جەنابت دەیبینی کە ڕونکردنەوەیەك لەلایەن حکومەتی بریتانییەوە هاتوە بەو ئاکامەی کە کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتوەکان سەنگێك بۆ ئەو پەیمانەی حکومەتی بەریتانیا دادەنێ بەوەی کە ڕێ و ڕەسمێك بگرنە بەر تا زامنی ئەوە بکەن کوردەکانی عێراق ئیدارەیەکی ناوخۆییان هەبێ کە دیارە ئەنجومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان مەرجی داناوە حوکمی خۆیان بەیان بکەن لەمەڕ مەسەلەی سنوری موسڵ. من دڵنیام کە جەنابت بایەخێکی گەورە بەم مەسەلەیە دەدەی. من لە خزمەتدام

سد. ئێچ. دۆبز
خاوەن شکۆ بەڕێز عەبدولموحسین بەگ ئەلسەعدون.
سەرۆك وەزیران – بەغداد

کاك شێرزاد حەسەن لە ئینگلیزیەوە کردویەتی بە کوردی

# ٥- کورد و کۆمەڵەی گەلان

## ١- ٥ ڕاسپێرییەکانی کۆمەڵەی گەلان دەربارەی کورد

لەڕێککەوتنی نهێنی سایکس-پیکۆدا موسڵ بەر فەرەنساو شام بەر بریتانیا کەوت بو، بەڵام دوای جەنگ لوید جۆرجی سەرۆەزیرانی بریتانیا لە سەودایەکی زیرەکانەدا لە گەڵ کلیمانسۆی سەرۆەزیرانی فەرەنسا، شامی دا بە وانو موسڵی بۆ خۆیان وەرگرت، بە تایبەتی کە هێزی بریتانیا لەو کاتەدا ولایەتی موسڵی لە ژێر دەسدا بو.

هێزەکانی بریتانیا، بە شەڕ موسڵیان نەگرت بو، بەڵکو لە دوای ئیمزاکردنی ڕێککەوتنی ئاگربڕی مۆدروس چوبونە ناویەوە، لەبەرئەوە تورکیا موسڵی بە بەشێك لە سەرزەمینی خۆی دائەنا نەك بە داگیرکراوی جەنگ. تورك داوایان لە بریتانیا ئەکرد موسڵ چۆڵ بکا، بریتانیاش کە مرخی لەنەوتی کەرکوك خۆش کرد بو، بەهانەی دائەتاشی موسڵ لەدەس خۆی دا بمێنێتەوە، ئەم کێشەیە بەگفتوگۆی دوو قۆڵی تورك‌و ئینگلیز چارەسەر نەکراو، لە کۆنفرانسی لۆزانیش‌دا نەیانتوانی بگەنە ڕێککەوتن. کێشەکە بە ڕەزامەندی هەردولایان، بۆ بەلاداخستنی، بەرەو ڕوی کۆمەڵەی گەلان کرایەوە.

کۆمەڵەی گەلان کومیتەیەکی ٣ کەسی پێکهێنا بۆ لێکۆڵینەوەی((کێشەی موسڵ))و وەرگرتنی بیروڕای دانیشتوانی ناوچەکە کە بدرێتەوە بە تورکیا یان بخرێتە سەر عیراق.

کۆمیتەکە هاتە موسڵو سەردانی هەولێرو کەرکوکو سلێمانییان کرد. تاقمێ نوێنەری تورکیان لەگەڵ هات بۆ پڕۆپاگەندە. یەکێ لەوانە ژنبرایەکی شێخ محمود بو. ئەم کۆمیتەیە لەگەڵ زور کەسو تاقم وتوێژیان کرد، لە ئەنجامی ئەم گەشتەدا راپۆرتێکی درێژیان ئامادە کردو، دایان بە کۆمەڵەی گەلان. لە راپۆرتەکەیاندا رایان سپارد بو کە موسڵ بخرێتە سەر عیراق بەو مەرجەی دەوڵەتێکی پێشکەوتو ماوەی ٢٥ ساڵ یارمەتی بداو، ئارەزوەکانی کوردیش لە بەرچاو بگرێ.

ئەم لیژنەیە لە لێکۆڵینەوەکەیدا نوسی بوی:

((لە حاڵەتێك دا ئەگەر چاودێری کۆمەڵەی گەلان تەواو بو، دوای برانەوەی ئەو چوار ساڵەی کە پەیمانی عیراقی بریتانی تێدا بەستراوەو، بەڵێنی بەڕێوبەرایەتی ناوچەیی بە کورد نەدرێ، زۆر خەڵك تورکیان پێ باشتر ئەبێ لە عەرەب.)) ( السید عبدالرزاق الحسنی، العراق فی ظل المعاهدات، ط ٣،لبنان،١٩٥٨.ل١٣٣)

ڕاسپێریەکانی لیژنەی سنور دەربارەی کورد:

((پێویستە ئارەزوەکانی کورد لەبەر چاو بگیرێ دەربارەی دانانی فەرمانبەرانی بە ڕەگەز کورد بۆ بەڕێوەبردنی وڵاتەکەیانو، پێویستی دابەشکردنی عەدالەتو بڵاوکردنەوەی خوێندن لە قوتابخانەکاندا و، کردنی زمانی کوردی بەزمانی ڕەسمیی لە هەمو ئەم وەزیفانەدا.))

بڕگەی ٣ هەمی بڕیاری ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان ئەڵێ:((داوا بکرێ لە حکومەتی بریتانی، وەکو هێزی مانداتۆر، ئەو تەدابیرە ئیدارییانە بخاتە بەردەم ئەنجومەن کە دائەنرێن بۆ دڵنیاکردنی دانیشتوانی کورد لەو شتانەی لە راپۆرتی لیژنەی لێکۆلینەوەدا ناو براون، گەرەنتییەکانی دەربارەی بەڕێوبەرایەتی ناوچەیی، کە لیژنەکە لە ئەنجامگیرییەکانیدا ڕای سپاردون.))(الحسنی:ل١٢٩)

کۆمەڵەی گەلان کێشەکەی بە قازانجی بریتانیاو عیراق بە لادا خست موسڵیدا بەعیراق .تورکیاش ئیتر وازی لەم داوایە هێنا. بەڵام سەودایەکی تری بەدودا هات . بۆ ئەوەی تورکیاو ئێران لە ڕوسیای سۆڤیەتی دور بکەونەوەو، لە ئینگلیز نەوروژێن، ئینگلیز بۆ ڕازی کردنی ئەوان، نەی هێشت کوردی عیراق هیچ جۆرە قەوارەیەکی تایبەتی هەبێ، تەنانەت لەناو چوارچێوەی دەوڵەتی عیراقدا.

## ٥-٢ هیوای کورد بە کومەڵەی گەلان

چالاکەکانی کورد ئومێدێکی زوریان بە ڕاسپێریەکانی کۆمەڵەی گەلانو، بە عەدالەتو دڵسۆزی بۆ گولانی پچوك هەبو. ئەمەیش لەو وتارانەدا دەرئەکەویٚ کە نوسراونو. لەویاداشتانەی داویانەو. لەو گفتوگۆیانەدا کە لەگەڵ وەفدی وەزاری عیراق کردویانە.

عیزەت بەگی عوسمان پاشا ئەڵێ:

(( میللەتی کورد تەنها عیبارەت نیە لە سلێمانی. لە زاخۆوە تا خانەقین هەموداوای ئەم حەقە ئەکاتو هیچ کوردێك کەڕەتێکی تر لە گەڵ عیراقا ناژی. بۆ ئیحقاقی حەقمان موراجەعەت بە حکومەتی مونتەدەبە ئەکەین. ئەگەر ئەویش نەیپرسی، شکایەت ئەبەینە بەر عیصبەتول ئومەم. کورد حکومەتێکی موستەقیللەی ئەویٚ لە ژێر ئینتیدابدا. بەهەمو هێزمانەوە بۆ ئەم غایەیە سەعی ئەکەین، ئەمجارە سیلاحو تفەنگمان قەڵەمو موراجەعاتە))

هەر لەم بوارەدا حەمە ئەورەحمان ئاغا ئەڵێ:

((ئێمە کوردینو، کوردستان عیبارەت نیە هەر لە سلێمانی. لە زاخۆ وە هەتا خانەقین کوردەوارێتیەو، نایانەویٚ لەگەڵ عیراق بژینو، حکومەتێکی موستەقیللەی کوردیمان ئەویٚ لەژێر ئینتیدابدا. ئەگەر ئینگلیزیش نامانداتیٚ موراجەعەت بە عیصبەتول ئومەم ئەکەین)).

بەم دڵنیایی‌و هیوا گەورەیەوە، کە نائومێد بون لە کاربەدەستانی بریتانی، ڕویان کردە کۆمەڵەی گەلانو، چەند مەزبەتەیان بۆ نارد.

### ٥-٢-١ مەزبەتەکانی هەیئەتی وەطەنییە

سەرانی سلێمانی بەناوی خۆیانەوە چەندین مەزبەتەیان داوە بە کۆمەڵی گەلان. مەزبەتەکان لەڕێگای مەندوبی سامی بریتانیەوە لە بغداد ئەنێردرانو، وێنەیان لیٚ ئەدرا بە سەرۆکی وەزیرانی عیراقو، ڕۆژنامەکانی بەغداد.

هەر بە هاندانی هەیئەت دەیان مەزبەتەی تر لە لایەن ژنانی سلێمانی، کەسایەتی ناسراو و، سەرانی ئێلەکانی جاف، هەمەوەند، پشدەر، هورامان... بۆ هەمان مەبەست نێردرا بۆ کۆمەڵەی گەلان.

لە هەمو ئەو مەزبەتانەدا داوای جێبەجیٚ کردنی بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلانیان ئەکرد دەربارەی پێکهێنانی حکومەتێکی سەربەخۆ بۆ کورد لە ژێر ئینتیدابی بریتانی

یان هەر ئەندامێکی تری کۆمەڵەی گەلاندا. هەر لەو ماوەیەدا مەزبەتەیەکیش بە ناوی سەرانی ئێلەکانی بادینانەوە نوسراوە. بەڵام دەسبەجێ ئەوان بە درۆیان خستەوەو، دژی ئەم جوڵانەوەیە هەڵوێستیان گرتو دەربڕی.

یەکێ لە گرنگترینی ئەو مەزبەتانە، یادداشتێکە کە بەناوی هەیئەتی وەطەنییەی کوردستانی جنوبیەوە، بە ئیمزای ئەندامەکانی، لە۳۱ی ئابی ۱۹۳۰دا دراوە بە کۆمەڵەی گەلانو، هەوڵ ئەدەن، بە ئەندامانی کۆمەڵەی بسەلمێنن، کورد هەروەکو ماف دامەزراندنی حکومەتێکی سەربەخۆی هەیە، توانـاو لێوەشـاوەیی ژیـاندنو بەڕێوبردنیشی هەیە.

حکومەتی عیراق ڕوداوەکەی ٦ ئەیلولی کرد بە بەهانەو، هەمو چالاکەکانی هەیئەتیان گرت. هەندێکیان ناردن بۆ زیندانی کەرکوکو هەندێکیان دورخستنەوە. بە گیرانی ئەمان هەیئەت لەچالاکی کەوتو تەواو بو. هەندێکیان بەیەکجاری لەژیانی سیاسی کشانەوە. لە کاتی لێکۆڵینەوەو دادگایی کردندا دەرکەوت کەهۆی سەرەکی گیرانەکەیان ناردنی ئەو مەزبەتانە بوە بۆ کۆمەڵەی گەلان.

## ٥-٢-٢ مەزبەتەکانی شێخ مەحمود

شـێخ مـەحمود کەهاتـەوە مـەیدانی چالاکـەکانی هەیئـەت گـیرا بـونو، ئـەو چالاکییەی ئەوان دەستیان پێکرد بۆ تەواو بوبو. شێخ محمود چەندین نامـەی بـۆ موفەتیشی ئیداری لەسلێمانی، مەندوبی سامی لە بەغداد نوسیو، داوای لێکردن کە کاربەدەستانی عەرەبی داوو دەزگای مەدەنیو سپایی لەزاخۆوە هەتا خانەقین چۆڵ بکەنو، حکومەتێکی کوردی لە ژێر ئینتیدابی بریتـانی یـان هـەر ئـەندامێکی تـری کۆمـەڵی گـەلان دا دابمـەزرێنن، بـەڵام ئـەمان بـەبیانوی ئـەوەی شـێخ مـەحمود ڕێککەوتنەکەی ۱۹۲۷ی شکاندوە، بەهەرەشە لێ کردن وەڵامیان دایەوە.

بە ڕێگای ئەوان بوبێ، یان هەر ڕێگایەکی تر، لە باتی دانیشتوانی کوردستانی جنوبی، لە ڕۆژی ۲۱ی مارتی ۱۹۳۱ دا یادداشتێکی ناردوە بۆ کۆمەڵەی گەلان. لەو یادداشتەدا گازاندە لە حکومەتی عیراق ئەکا لەسەر ئەوەی لە سلێمانی کوشتاری کردوەو، ڕۆشنبیرەکانی گرتوەو، داوا ئەکا حکومەتێکی کوردی سەربەخۆ لە ژێر سایەی ئینتیدابی بریتانی یا هەر ئەندامێکی تری کۆمەڵەی گەلاندا دروست بکرێ.

## ٥-٢-٣ مەزبەتەکانی تۆفیق وەهبی

ئەو کاتەی تۆفیق وەهبی موتەصرِیفی سلێمانی بو، هەیئەت لەپەرِی جموجۆڵو چالاکیدا بو. حکومەتی بەغداد پیێ وابو ئەو چالاکیە بەهاندانی تۆفیق وەهبییە، لەبەر ئەوە کێشایانەوە بەغدادو دەستیان لەکار کێشایەوە.

لەمارتی ١٩٣١ دا کۆمەڵێ لەپیاوە ناسراوەکانی کوردستانی عیراق وەکالەت نامەیەکیان بۆ تۆفیق وەهبی کردۆتەوە دەسەلاتیان داوەتێ بە ناوی ئەوانو، بە نوێنەرایەتی دانیشتوانی کوردستانی جنوبییەوە بۆ جێبەجێ کردنی خواستەکانی گەلی کورد لە گەڵ کۆمەڵەی گەلانو دەزگاکانیو، لەگەڵ وەزارەتی دەرەوەی بریتانیا، یان هەر دەوڵەتو دەزگایەکی پێوەندیدار گفتوگۆ بکات. جەلادەت بەدرخانیش، بەناوی کۆمەڵەی (خۆیبون)ەوە نامەی پشتیوانی بۆ نوسیوە.

تۆفیق وەهبی لە نیسانی ١٩٣١ دا، دوای ئەوەی مەزبەتەکانی ساڵی ١٩٣٠ رەفزکراون، چۆتە بیروتو دەستی کردوە بەکار. لەوکاتەدا هەیئەتی وەطەنییە لە چالاکی کەوت بو. لەو کاتەداهەیئەتی وەطەنییە لە چالاکی کەوت بو، شێخ مەحمودیش لە دوا رۆژانی شۆرِشەکەیدا بوە لەو کاتەدا زنجیرەیەك نامەو یادداشتی، بە نوێنەرایەتی ٨٠٠ هەزار کوردی کوردستانی جنوبی نوسیوە، بۆ:مەندوبی سامی بریتانی لە عیراقو، وەزیری دەوڵەت بۆ کاروباری دەرەوەی بریتانیاو، سکرتێری کۆمەڵی گەلانو، سەرۆکی لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب.

تۆفیق وەهبی لە یادداشتەکانیدا حکومەتی عیراق بە حکومەتی عەرەبیو کوردستانی عیراق بە کوردستانی جنوبی ناو ئەباو، ئەڵێ کابرایەکی ئایریش چەند ئینگلیزە، کوردیش ئەوەندە عەرەب یا عیراقیە.

تۆفیق وەهبی لە یادداشتەکەیدا داوا ئەکا لە ژێر سایەی عەرشی عیراقدا ماڤ (خۆحوکوم کردن) بدرێ بە کوردستان. هەوڵ ئەدا باشیی ئەم کارە بۆ سەر ئاسایشی عیراقو، رۆژهەلاتی ناوەرِاستو، پێوەندی کوردو عەرەبو کلدانیو ئاسوری، بسەلمێنێ.

خواستی ئەم لە گەڵ خواستی هەیئەتی وەطەنییەو شێخ مەحمود جیاواز بوە. ئەوان داوای حکومەتێکی کوردی سەربەخۆیان کردوە لە ژێر ئینتیدابی بریتانیدا، بەلام داوای خۆ حوکوم کردنی کردوە لە ژێر سایەی عەرشی عێراقدا. دیارە ئەوەیش ئەگەرِێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەم شارەزای سیاسەتی ناودەوڵەتان بوە، دڵنیا بوە لەوەی لەبەر خاتری کورد دەوڵەتی عیراق هەڵناوەشێنرێتەوەو کوردستان لە عێراق جیا ناکرێتەوە.شتێکی داوا کردووە بە پیێ بۆچونی خۆی، هەلی جێبەجێ کردنی زۆرتر

بیٚ لەوانەی پێشو. بۆ سەلماندنی خواستەکانی، پشت بە ژمارەو بەڵگەو شایەتو لێکۆلینەوەی زانستیو مەنطیقی ئەبەستیٚ.وەك بەشیٚ لەمەزبەتەکەی دو مەسەلەی گرنگی تری باس کردوە:

یەکەمیان، هەوڵی داوە قسەکانی نوێنەری بریتانیا لە لای لیژنەی هەمیشەیی ئینتیداب، کە بە قازانجی حکومەتی عیراقو بەزەرەی کورد بون، پوچ بکاتەوە.

دوەمیان، پیٚی لە سەر دۆستایەتی کوردو ئاسوری کلدانی داگرتوە و، ناکۆکی ئەم دو گەلەی خستۆتە ئەستۆی حکومەتی عیراق کە هێزی لیوی لیٚ دروست کردونو ئەیان نێریٚ بۆ شەڕی کورد. نوێنەرانی ئاسوری پشتیوانییان لە خواستەکانی تۆفیق وەهبی کردوە.

دوای ئەوەی تۆفیق وەهبی گەڕاوەتەوە بەغداد پیٚ ئەچیٚ، لە سەر ئەم مەزبەتەیە، گیرابیٚ بەلاّم دوای ئەوەی هاوسەرەکەی سکالاّیەکی داوە بە مەندوبی سامی بەر دراوە. تۆفیق وەهبی جارێکی تریش چۆتەوە بەیروت. لەوەلاّمی ئەو توهمەتانەی، لە ڕۆژنامە عەرەبیەکاندا، بە پاڵ جولاّنەوەی کورد دراون، وتارێکی نوسیوە، لەباری سەرنجی کوردەوە داکۆکی لە مافەکانی ئەکا.

## ٥-٣ ڕاپۆرتەکانی هێزی منداتۆر

حکومەتی بریتانی کەهێزی منداتۆر بو لە عیراقدا هەمو ساڵیٚ ڕاپۆرتێکی درێـژی لە سەر جۆری بەڕێوەبردنی عیراقو، پلەی پێشکەوتنو گەشەکردنی بۆ کۆمەڵەی گەلان ئەنوسی. لە هەمو ڕاپۆرتێکی ساڵانەدا بەشێکی بۆ کورد تەرخان ئەکرد. لەم بەشەدا هەمیشە دو شتی ڕون ئەکردەوە:

یەکەمیان، شایەتیەکی ناڕاستی بۆ حکومەتی عیراق ئەدا، کەوا هەمو بەڵێنەکانی خۆی سەبارەت بە ڕاسپێرییەکانی کۆمەڵەی گەلان بەرامبەر بە کورد جێبەجیٚ کردوە. قسەو ڕاگەیاندنەکانی کاربەدەستانی عیراقو ژمارەی فەرمانبەرانی کوردو ناسینی ڕەسمیی زمانی کوردی ئەکرد بە بەڵگە.

دوەمیان، سکالاّو گازندەکانی کوردی بە درۆ ئەخستەوەو، بە تێبینییەکانی کە لە سەر مەزبەتەکانی سەرانی کوردی ئەنوسی، هەمیشە شکاتو داواکانی پوچ ئەکردنەوە.

